بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ناسنامەی کتێب


ناوی پەرتووک: چل پەیام بۆ ئافرەتان

نووسینی: إحسان برهان الدين

نەخشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاكی

نەخشەسازیی بەرگ: محمد سیانی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٤ کۆچی - ٢٠٢٣ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «»ی ساڵی «٢٠٢٣»ی پێ دراوە.

## پەیامی یەکەم: ڕێز لە پێگە و سەنگینی خۆت بگرە

هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت وبەو هەستەوە ڕەفتار بکە، کە تۆ بوونەوەرێکی جیاواز و ڕێز لێگیراویت، گرنگ وپڕ بایەخیت، هەر بۆیە هەموو هەڵسوکەوتێکت لەسەر ئەژمار دەکرێت وکاریگەری وڕەنگدانەوەی لە دەرەوەی خۆتدا هەیە، بەڵگەش لەسەر گرنگیت ئەوەیە تۆ لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانتدا تەنها نوێنەرایەتی خۆت ناکەیت، بەڵکو وابەستەی ڕێکخرواێکی بەرفراونی کە بریتییە لە خێزان بەواتا فراوانەکەی، پێویستە هەمیشە پارێزگاری لەو پێگە جوانەی خۆت بکەیت و ویقار وسەنگینی کەسایەتیت بکەیتە تایبەتمەندی ودروشم ونەخشە ڕێگایەك بۆ ژیانت.

بەسە بۆ گرنگیت، نە چاکە و نە خراپەت ڕەهەندێکی تاکە کەسی نییە و لە ئاستی خۆتدا ڕابوەستێت، واتە ئەگەر چاك بیت وخراپ بیت پرسەکە تەنها پەیوەندی بە خۆتەوە هەبێت، نەخێر، بەڵکو بەچاك بوونی تۆ، خێزان و کۆمەڵگا هەمووی چاك دەبێت و بە خراپ بوونیشت خێزان وکۆمەڵگا هەمووی تێکدەچێت.
بەڵام ئەو پێگە و سەنگینی و گرنگییەت هەمووی بەندە بە دەستگرتن و وابەستەبوونت بە دینەکەتەوە، مەرجەکەی ئەوەیە پێناسەی موسوڵمانیتی بە تەواوی لە خۆتدا جێبەجێ بکەیت: لەسەر عەقیدەیەکی پاك وتەوحیدی تەواو

بیت وسنوورەکانی شەرع بپارێزیت و ئەوەش بزانیت دەربڕینی بەرائەت لە شیرك و موشریکان و حاشا کردن لە لادەران ودیاردەکانی لادان لە ئیسلام لەم سەردەمەدا ئەوەش بەشێکە لە بیروباوەڕو ئیمانەکەت کە بەبێ ئەوە نوقسانە. بەدەر لە جێبەجێکردنی ئەو مەرجانە و هەڵسان بە ئەرکەکانی شەرع لەسەرت، نەك هەر نابیتە خاوەنی ئەو کەسایەتی وپێگە سەنگینەی ئاماژەمان پێکرد، بەڵکو نە دڵ ودەروونت ئاسوودە دەبێت، نە مێشکت لە گومانی خراپ و بۆچوونی ناپەسەند و زیان بەخش سەلامەت دەبێت، دەشبیتە ئامرازێك لە خولگەیەکی دوور لەو پێگەی بۆی دروستکراوی دەخولێیتەوە.

بەربەرەکانی گەورە لەبەردەمتدا دوای ئەوەی بڕیاری دەستگرتن و وابەستەبوون بە ئیسلام دەدەیت ودەتەوێت ڕێگای بەهەشت بگریتە بەر، ئەوەیە، چۆن ببیتە موسوڵمانێکی باش و ڕەزامەندی الله بەدەست بێنیت و لەسەر الصراط المستقیم ڕێبکەیت؟ بە ڕاشکاویش پێت بڵێم گرتنەبەری ئەو ڕێگە زۆریش ئاسان نییە و جۆرێك لە خۆ یەکلاکردنەوەو ئارام گرتن و گوینەدانی دەوێت بە جاهیلییەتی هاوچەرخ کە فشارەکانی لەسەرت گەلێك بەهێزە بە شێوەیەک جگە لە چەکی ئیمان هیچ چەکێکی تر نییە لە ڕوویدا بوەستێتەوە.

جا بۆ ئەوەی ببیتە خاوەنی ئیمانێکی ڕاست و پتەو، تەوحیدێکی پاك وپاراو، عەقیدەیەکی هەڵقوڵاو لە کیتاب و سوننەت، بۆ ئەوەی بزانیت لە کوێوە دەست پێ بکەیت؟ لە کێ دین وەربگریت؟ لە چی و لەکێ وریا بیت و لەچی خۆت

بپارێزیت؟ ئەو بنەماو بنچینە و سەوابیتانە کامانەن کە دەبێت بەدەستیان بخەیت بۆ ئەوەی کەس نەتوانێت لە خشتەت ببات؟ بۆ بەدەستهێنانی وەڵامی ئەو پرسیارانە وگەیشتن بە مەنزڵگای سەلامەتی، پێویستە هەوڵ و کۆششی زۆر بدەیت.

لە چوار چێوەیەکی شەرعی و بەرنامە بۆ داڕێژراودا پێویستت بە مامۆستای شارەزا و دڵسۆزی عەقیدە پاك هەیە، پێویستت بە وزەو توێشووی ڕێگا هەیە کە بریتییە لە وەرگرتنی زانستی شەرعی، لە ڕێگەی خوێندنەوەو بیستن و هەر ڕێگایەکی شەرعی تر ودواجار زانستەکەشت پێویستە ببێتە کردەوە و لە کەسایەتیتدا بەرجەستە بێت وڕەنگ بداتەوە.

لەم زنجیرەیەدا هەوڵ ئەدەم بە خێرایی و بە پوختی ئاماژەت بۆ بابەتە سەرەکی و هێڵە پانەکان بۆ بکەم، بەڵام دواجار قورسایی ئیشەکە کە مەبەستم پێی وردەکاری و بەدواداچوونەکانە لەسەر خۆت دەمێنیت.

﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[١]

---

[١] - الحج:٥٤.

## پەیامی دووەم: بۆ ئامانجی باش ڕێگەی حەرام بەکار مەهێنە!

ئافرەت یەکێکە لە گەورەترین ئامرازەکانی جاهیلییەتی هاوچەرخ کە بەکاری دەهێنێت بۆ تیکدانی کۆمەڵگا و شێواندنی بنچینەکانی ڕەوشت و ئاکارە جوانەکان لە جیهاندا، سیاسەتمەداران و ئەوانەی ئەمڕۆ دەسەڵاتەکانی سەرزەویان بەدەستە، بە پێی بنەماکانی عەولەمە و پاڵپشت بە ڕاگەیاندنێکی زەبەلاح و چەواشەکار لەگەڵیاندا یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر بیانەوێت جیهان بەو شێوەی لێبێت کە مەبەستیانە پێویستە شیرازەی خێزان تێك بچێت وئافرەت لە پۆشاکی شەرم و حەیا دابماڵن وببێتە ئامرازی لە خشتەبردن و کاڵایەکی بازرگانی و بە کورتی، دەیانەوێت ئافرەت  هەمیشە دیار بێت وببیتە ڕیکلامێکی هەرزان بۆ هەموو ئەو ئامانجانەی لە بواری سیاسەت و حوکم و ڕوخانی کۆمەڵگا وبڵاوکردنەوەی فەساد کە جیهانگیری کاری بۆ دەکات.

بەو هۆیەش کە دەسەڵات و ڕاگەیاندنیش هەمووی بەدەستی ئەوانەیە کە ئەمڕۆ لە جیهاندا کار بۆ تێکدانی شیرازەی خێزان دەکەن، بەداخەوە قۆناغی زۆریان لەو بارەوە بڕیوە و ئەو ئاگرەش ئەگەرچی لە زووەوە پریشکەکانی بە کۆمەڵگای کوردی گەیشتووە، بەڵام هەنگاوی داهاتوو ئەوەیە بازدانێکی گەورە لەو بوارەدا درووست بکرێت و بەخێرایی هەنگاو بنرێت بەرەو فەساد و هەڵوەشاندنەوەی

خێزان و گۆڕینی کۆمەڵگا بەو شیوازەی لەگەڵ جاهیلییەتی هاوچەرخ و لەگەڵ پرەنسیپەکانی عەولمەدا یەکدەگرێتەوە .

دوای ئەوەی کە ڕۆژئاوا توانی ئافرەتی بکات بەکاڵا و ڕیکلامێك بۆ پێشکەوتنەکانی لە بواری پیشەسازی و بازرگانی وبەڵکو لە سیاسەتیشدا ، یەکەم وڵات هەنگاوی هاوشت بۆ داماڵینی ئافرەت لە سەرپۆش و باڵاپۆشی وشەرم وحەیا میسر بوو، لە ساڵی ١٩١١ی میلادی حیزبی (بنت النيل) دامەزرا کە داوای نەهێشتنی سەرپۆش و باڵاپۆشی وسنووردارکردنی تەڵاقی دەکرد، لە دوای ئەوەش سعد زغلول کە دروشمی ئازادکردنی ئافرەتی بەرزکردنەوە کە لە ڕاستیدا مەبەستی ئازادکردنی ئافرەت بوو لە سەرپۆش وپۆشاك ووابەستەبوون بە شەرعی ئیسلام، خۆی هەڵسا بە سووتاندنی نیقاب ودواتریش صفية زغلول ی خێزانی کە ئەویش دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بوو لەناو شاری قاهیرەدا خۆی و چەند ئافرەتێکی هاوشێوەی خۆی لەناوەڕاستی مەیدانی تەحریردا هەڵسان بە فڕەدانی سەرپۆشەکانیان و سووتاندنی ، ئێستاش دەسەڵاتی عەلمانی میسر نازناوی دایکی میسرییەکانی بەو ئافرەت بەخشیوە. سەیریش ئەوەیە گێلە موسوڵمانێکی وەکو حافظ إبراهيم ی شاعیری بەناو بانگی میسر ئەو ڕووداوەی (ڕوداوی سووتاندنی سەرپۆشەکان) لە ڕووانگە ئایینییەکەیەوە تەماشا نەکرد بەڵکو وەکو چالاکییەکی نەتەوایەتی سیاسی دژ بەداگیرکەری ئینگلیزی بۆ میسر تەماشای کرد و لە هۆنراوەیەکی بەناوبانگیدا ستاییشان دەکات ودەڵێت:

خَرَجَ الغَواني يَحتَجِبـ ـنَ وَرُحتُ أَرقُبُ جَمعَهُنَّه
فَإِذا بِهِنَّ تَخِذنَ من سودِ الثِياب شِعارَهُنَّه
يَمشينَ في كَنَفِ الوَقا رِ وَقَد أَبَنَّ شُعورَهُنَّه

دوای ئەویش هدى شعراوي یەکەم ئافرەت بوو کە سەرپۆشی لە میسردا فڕێدا و بەسەر ڕووتی دەرکەوت و بوو بە پێشەنگی هەموو کەسێکی سەر ڕووت و جەستەڕووت تا ڕۆژی قیامەت.

بەڵام بۆچی عەلمانیەت و سەرانی عەولەمە لە جیهاندا لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا کار بۆ داماڵینی ئافرەت لە پۆشتەیی دەکەن و بەهەموو توانایەکیان هەوڵی دەرکردن و بەمۆدێل کردن و هەڵگەڕانەوەی ئافرەت لە دین و مەنزومەی خێزان دەدەن؟ سوودی چییە بۆیان ئەگەر ئافرەت ڕووت ببێت لە کۆمەڵگادا شیرازەی خێزان تێکب بچێت؟ بۆ ئەوان کە فیترەتیان شێواوە وجگە لەم دونیا وئەو تەمەنە کورتەیان چاوەڕێی هیچی تر نین ئەوە ئامانجێکی گەلێك گەورەیە، لەبەر زۆر هۆکار وەکو:

- داماڵینی ئافرەت لە پۆشاك و سەرپۆش و هەڵگەڕانەوەی لە دین و شەریعەت، دەستەبەری کۆمەڵگایەکی دوور لە دین دەکات کە ئیسلام هیچ شکۆیەکی تێدا نابێت وتێرکردنی حەزو ئارەزووە ئاژەڵییەکان دەبنە ئامانجی هەرە گەورەی زۆرینە لەو کۆمەڵگایەدا. ئەو ئامانجە هەرگیز لەگەڵ هەبوونی ئافرەتی پۆشتە وسەنگین کە ڕازی نابێت ببێتە ئامرازی فەساد و ڕێز لە حوکم و فەرمانەکانی شەریعەت

بگرێت درووست نابێت، بەڵکو دەبێت پێش هەموو شتێك ئافرەتان بەناوو بەهانەی جۆراوجۆرەوە لە پۆشاکی شەرم و حەیا دابماڵرێن و ببنە ئامرازی تێرکردنی حەزە حەیوانییەکانی ئەو نەوەی کە خۆیان درووستیان کردووە و موژدەی کۆمەڵگایەکی پڕ لەو جۆرە ئافرەتانەیان پێ داوە،

- کە ئافرەت کە سەری ڕووت کرد و جەستەی دەرخست بۆ پیاوان وبوو بە هۆکاری بڵاوبوونەوەی خراپە لە کۆمەڵگادا، بێگومان هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا لە دین و دینداری و پەروەردەی ئیسلامی تەواو دوور دەکەوێتەوە، دەبێت بە ئەندامی دەیان شوێن و ڕێکخراوی دژ بەدین و بەناو مافی ئافرەتانەوە دژایەتی دین و ئاکار دەکات یان ڕاستر پێی دەکرێت.

بەو شێوەیەش فڕەدانی سەرپۆش و دژایەتی حیجاب و باڵاپۆشی بەو ڕەهەندەوە ناوەستێت بەڵکو ڕەهەندی زۆر لەوە دورتر و ترسناکتر وەردەگرێت، چونکە ئافرەت کچە ودایکە و خوشکە و هاوسەرە وکاریگەرییەکانی لەسەر کۆمەڵگا فرەهەندە و بە چاکی و بە خراپی گەلێك زۆر و کاریگەرن.

کە ئەو بوو بە ئافرەتێکی ناپۆشتە و لەگەڵ پیاواندا بەهەمو شێوەیەك بەبێ سنووردانان تێگەڵ بوو، کاتێك چالاکییەکانی لە ژیاندا هیچ دەسەڵاتێکی ئیسلامی بەسەرەوە نامێنیت، بێگومان کەسێکی جاهیل بە ئیسلام دوور لە عیبادەت وکاری چاکەی لێ دەردەچێت، عەرەب واتەنی (وهو المطلوب) !

ئەوانیش هەر زوو دەرکیان بەو ڕاستییە کردووە بۆیە بەردەوام بەو ئاراستە کار دەکەن.

- ئامانجێکی تر لە لەخشتەبردنی ئافرەت و داماڵینی لەشەرم وشکۆ و پۆشاکی ئیسلامی ئەوەیە ببێتە شوێنکەوتووی شەیتان و شەهوەت وئارەزووکانی، بێ گوێدان بە سنوورەکانی شەرع و حەڵاڵ وحەرام هەمیشە بەدوای حەزە نزمەکانی نەفسی خۆیەوە بێت، تاکو دەمرێت نازانێت قورئان چییە و فەرموودە چییە و گرنگی ڕەوشتی جوان لە ژیانی ئافرەتاندا چییە، نازانێت نوێژ چییە و زەکات چییە، مەگەر هەر ناویان ببیسێت، هەر خودی جاهیلییەتی هاوچەرخیش لەڕێگەی پیاوانی خۆیان وزۆر لە مەلای دینفرۆشەوە  کە لە هەموو وڵاتێدا بوونیان هەیە، تێیان دەگەەینن کە ئەویش سەرەرای ئەو دۆخە دوورەی لە ئیسلام و موسوڵمان دەچێتە بەهەشت و دینداری بە نوێژو ڕۆژوو نییە، گرنگ ئەوەیە دڵت پاك بێت و نیەتت باش بیت! دەڵێن خوا خۆی ئەزانێت کێ دەچێتە بەهەشت و کێ دەچیتە دۆزەخ، وەکو ئەوەی الله بەرنامەیەکی ڕوون و تێرو تەسەلی بۆ مرۆڤەکان نەناردبێت ودانەبەزاندبێت ڕێگەی بەهەشت و دۆزەخ تێیدا وەکو سپێدەی بەرەبەیان دیار نەبێت!

- ئامانجێکی تری هەڵگەڕانەوەی ئافرەت لە پۆشتەیی و لە دینی حەق ئەوەیە، ئەو ئافرەتانە بەوەوە ناوەستن، بەڵکو وایان لێ دیت نکۆڵی لەزۆر لە حوکمەکانی ئیسلام دەربارەی ئافرەت دەکەن و نە زەواج و نە حیجاب و نە سنوورەکانی حەڵاڵ وحەرام و نە تەڵاق وهیچ باسیکی تر لە باری کەسیتی بەتایبەتی نابێتە جێگای ڕێزگرتن وحیساب بۆ کردن لەلایان، وای لێ دێت سفوری و تێکەڵبوونی لەگەڵ پیاوان و ئەنجامدانی هەر چالاکییەك با هەرچەند لەگەڵ ئیسلامدا ناکۆك بێت هیچ کێشەو گرفتێکی تێدا نابینێت وزۆر بە ئاسایی دەیبینێت ، بەوەش کاریگەری ڕەوشتی زۆر خراپ لە کۆمەڵگادا درووست دەبێت و ئەوانیش ئەوەیان دەوێت.

- مەبەستێکی تریان ئەوەیە ئافرەت خاڵی بکەن لە بەها جوانەکان، سەنگینی کەسایەتی لێ وەربگرنەوە، بیکەن بە کاڵایەکی جنسی و هۆکارێك بۆ تێرکردنی حەزو ئارەزووەکانی خۆیان، هەموو بایەخێکی ئەو جۆرە کەسانە دەبێت گرنگیدان بە جل وبەرگ و مۆدێل و دراما و سینەما وبەرنامەی هیچ وپوچ وتۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت، هیچ پرس وکێشەیەکی پیرۆزی نابێت لە پێناویدا کار بکات وبۆی بژی، تەنانەت خێزانیش پیرۆزییەکی نامێنیت.

- کاتێك سەرکەوتوو دەبن لە بەلاڕێبردنی ئافرەت و دوورخستنەوەی لە ئیسلام وشەرعە پاکەکەی، ئافرەت هاوڕێی باشی نامێنیت وتەنها لەگەڵ کەسانی هاوشێوەی خۆیدا هەڵسوکەوت دەکات و بەوشێوەش ڕۆژ لەڕۆژ کۆمەڵگا خراپتر دەبێت ولە شەریعەتی ئیسلامەوە دوورتر دەکەوێتەوە.

پرسیارێکی گرنگیش لێرەدا ئەوەیە ئایا ئافرەتانی موسوڵمان لە بەرانبەر هەڵمەت ولێشاوی دوورخستنەوەی ئافرەتان لە ئیسلام و هەوڵەکانیان بۆ هەڵوەشاندنەوەی خێزان چی بکەن باشە؟ ئایا درووستە لە بەرانبە ئەو ئافرەتانەی دژایەتی ئیسلام دەکەن وو سەرپۆش دەسوتێنن و گاڵتە بەباڵا پۆشی دەکەن، ئایا درووستە ئافرەتانی موسوڵمانیش چالاکی دژ بە ئەوان بکەن وئەوانیش بچنە سەر جادەکان و بچنە بەردەم هەندێ لە دام ودەزگاکان وشوێتە گشتییەکان ولە ڕاگەیاندنەکاندا دەربکەون و ناڕەزایی دەربڕن وبەو شێوە بانگەواز وبەرگری لە دینەکەیان بکەن،؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بێگومان نەخێر، ئەوە هەنگاوێکە ئەگەرچی بە مەبەستێکی باشەوە ئەنجام ئەدرێت، بەڵام ئەو ڕێگەی کە بۆی دەگیرێتە بەر ڕێگەیەکی هەڵەیەو ناشەرعییە، لە ئیسلامدا ڕاست ودرووستی ئامانج وشەرعی بوونی مەبەست نابێتە بەهانەی ئەوەی ڕێگای نادرووست وحەرامی بۆ بگیرێتەبەر، دەرچوونی ئافرەت ودەرخستنی ڕوخسار وجوانیەکان و جەستەی بۆ ڕاگەیاندنەکان با پۆشتەش بێت درووست نییە وئەویش جۆریکە لە فیتنە ئەوە

خۆی بۆ خۆی کارێکی ناشەرعییە وبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن لە جیاتی چاکە هەندی کاری خراپ ئەنجام ئەدەن. چونکە ئەوان دواجار ئافرەتن و بەهۆی ئەو بەرگری کردنەیان لە ئیسلام خۆیان بۆ هەموان دەردەخەن وەکو چۆن ئەو ئافرەتانەش بەهۆی دژایەتیکردنەکەیان بۆ ئیسلام خۆیان دەردەخەن ، ئافرەت هەر ئافرەتە و فیتنەو کاریگەرییان هاوشێوەی یەکترە با دینیشیان جیاواز بێت، هەردولایان بە جۆریك لە جۆرەکان بە پۆشتەیی و بەناپۆشتەیی هەر فیتنەیان هەیە.

ئینجا گەلێك سەیر ونامۆیە داوای جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام و ڕاوەستان لەدژی نەیارەکانی لە کەسانێك بکرێت کە خۆیان ئامادە نین شەریعەتی ئیسلام وەکو خۆی جێبەجێ بکەن و هیچ چالاکییەکی دژ بە ئیسلامیش لەلایان شایانی سزادان ومەحکوم کردن نییە.

بۆیە بە کورتی لە ئیسلامدا (الغاية لا تبرر الوسيلة) مەبەست بەهانەی هۆکار نییە! درووست نییە بۆ ئەوەی گوایە بەرگری لە ئیسلام بکرێت کۆمەڵە ئافرەتێکی گەنج خۆیان ڕێك وپێك بکەن ولەبەردەم لە کامێراکاندا دەرکەون سەرەڕای ئەوەی کە ئەسڵی کارەکەیان باشە وغیرەتێکی پێوە دیارە و نیشانەی خەمخۆری ئەوانە بۆ دینەکیان، بەڵام بێ گومان دەرکەوتنیان و بەو شیوە چوونە پیاوان و راوەستانیان لەبەردەم راگەیاندن و کامێراکاندا کارێکی ناشەرعی ونادرووستە و ئەگەر ئەو هەنگاوە سوودی هەبێت دەبێت پیاوان لەبری ئەوان بیکەن،

یان خۆیان لەڕیگەی بەکارهێنانی هۆکاری ترەوە بە بێ دەرکەوتن بۆ ڕاگەیاندنەکان ئەو بەرگرییە لە ئیسلام بکەن.

هەرچەند بە هیچ شێوەیەك ئەو جۆرە چالاکییانە ئەوەی سوود بێت نییەتی مەگەر بۆ ئەوانەی کە دژیان ئەنجام ئەدرێت کە ئەتوانن بیکەن بە ڕیکلام بۆ خۆیان و ئیقامەی وڵاتەکانی ڕۆژئاوای پی وەربگرن.

من پێم وایە ئەو هەنگاوە لە لایەن دەسەڵاتی عەلمانییەوە بە باشی پێشوازی لێ دەکرێت و ڕێزی لێ دەگیرێت، چونکە جۆرێکە لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی مەدەنی ودیموکراسی وڕەنگە نەك هیچ دەرەنجامێکی باشی نەبێت، بەڵکو سوودیشی بۆ ئەو پرۆژەی ئەوان هەبێت بە پەرە پێدانی و گەیاندنی چالاکییەکەی ئەوان بە کەسان و توێژی فراوانتر لە کۆمەڵگادا.

ڕێگای شەرعی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو جۆرە چالاکیانەی دژ بە ئافرەتان و بە ئیسلام و موسوڵمانان دەکرێت بە شێوەیەکی گشتی ئەوە نییە خۆپیشاندان بکرێت و سکاڵا پێشکەش بکرێت، مەحاڵە ئەوە سوودی هەبێت، بەڵکو پێویستە لە بنچینەوە هەوڵی پەروەردەیەکی ئیسلامی بدرێت لەسەر بنەمای تەوحید و عەقیدەو بیروباوەڕێکی پاك و وەکو ئەوەی لە قورئاندا هاتووە، کۆمەڵگا لە جەوهەری ئیسلام دوور کەوتووەتەوە و پێویستە جارێکی تر بگەڕێێتەوە بۆ ئەو ئیسلامەی لە کیتاب و سوننەتدا هاتووە نەك ئەوەی کە دین فرۆشەکان نمایشی

دەکەن و لەبەر دووری لە جەوهەری ئیسلام ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەمووی بەو ئیسلامە ڕازییە وهاوکاری بڵاوبوونەوەی دەکات.

دەرك نەکردن بەو حاڵەی ئوممەتی ئیسلام پێی گەیشتووە و ئەو کارەساتەی بەسەر موسوڵمانداندا لە ڕێگەی عەولەمەوە هاتووە ئەویش بۆ خۆی کارەساتێکی ترە وجۆرێکە لە هەڵە تیگەیشتن و پێشکەش کردنی چارەسەری هەڵە.

لێشاوی جاهیلییەت حاڵەتێکی نێو دەوڵەتی جیهانگیرییە تەنها بە گەڕانەوەی گشتگیر بۆ ئیسلام لەسەر بنەمای عەقیدە وشانازیکردن بە ئیسلامەوە دەگەڕێتەوە نەك بە خۆپیشاندان و چالاکی مەدەنی ناسك، پرۆسەی پەروەردەی ئیسلامی لەسەر بنەمای عەقیدە کە لێرەدا مەبەستمە کاتی زۆری دەوێت و ئیشی زۆری دەوێت، هەروەکو چۆن عەلمانییەت و عەولەمە کە سەرتاسەری جیهانی گرتووەتەوە هەروا بە ئاسان و بە خۆرایی بەرهەم نەهات، بەڵکو خەڵکانێك کە باوەڕی تا سەر ئێسقانیان بە عەلمانیەت و دژایەتی ئیسلام هەبوو کاریان بۆ کرد وقوربانیان بۆدا، بۆیە ئەم واقیعەیان بەرهەم هێنا و لە ڕووی شارستانییەوە بەسەر موسوڵماناندا سەرکەوتن، تاکو موسوڵمانانیش نەگەڕێنەوە سەر دینەکەیان و ساڵانێك خەریکی پەروەردەی ماڵ و مناڵ و دەوروبەری خۆیان نەبن و نەوەیەك پەروەردە نەبێت کە ئیسلامی لە هەموو شتیك خۆشتر بوێت ئیسلام بەو جۆرە چالاکییانە هیچ دەستکەوتێکی نابێت.

## پەیامی سێیەم: ئەم سێ بنەمایە فەرزە لەسەرت بیانزانیت!

لە درێژایی سیانزە ساڵدا لەشاری مەککە، پێغەمبەر ﷺ خەریکی چەسپاندنی بنەماکانی عەقیدە بوو لە دڵ و دەروونی هاوەڵانیدا، (الله تعالى لە هەموویان رازی بێت) بۆ ئەوەی بۆ قۆناغی داهاتوو لە کارکردن بۆ ئیسلام و کۆششکردن لە پێناویدا بە هۆی ئەو عەقیدەوە ئامادەیان بکات و تەوحید بکاتە ئەو زەمینە بەهێزەی کە لەسەری دەوڵەتی ئیسلامیان لە مەدینە درووست کرد، ئەو بنەمایەش تا ڕۆژی قیامەت پێویستە ئوممەتی ئیسلام کاری لەسەر بکەن کەسایەتی موسوڵمانی خۆیان لە ڕۆشنایی عەقیدەدا و لەبەر ڕۆشنایی حوکمەکانیدا درووست بکەن.

ئەگەر موسوڵمان بەگشتی و لێرەشدا کە وتەکانمان ئاراستەی ئافرەتان دەکەین، ئافرەتیش بەتایبەتی عەقیدەیەکی پاك و ڕاست ودرووستی بوو، ئیتر هەرچی کردەوەی هەیە لەدوای ئەوە ڕاست و درووست دەبێت، کاتێك کە مێشك ودڵ و دەروونی لە پیسی هەموو جۆرە شیرکێك پاك دەکاتەوە، ئەوە سەرەتای پێکهێنان و درووست بوونی خێزانێك و دواجار دەستپێکی کۆمەڵگایەکی موسوڵمان و پاك و موەحیدە.

بۆیە بۆ ئەوەی ئافرەتی موسوڵمان ئەگەر بیەوێت وەکو ئەوەی الله تعالی پێی ڕازی دەبێت بژیت و لەسەری بمرێت، پێویستە پێش هەموو شتێك بە بەڵگەی قورئان و سوننەت وەڵامی سێ پرسیار بە وردی و بە شیکراوەیی بزانێت، وەکو زانست پێویستە لێی شارەزا بێت و لە هەموو بوارەکانی ژیانیشدا بیانکات بە کردەوەو بەرجەستەیان بکات، ئەو سێ پرسیارەش بریتین لە سێ بنەمای مەزن لە دینی ئیسلامدا هەرکێ زانستی تەواوی پێیان نەبێت عەقیدەی ڕاست نابێت:

**بنەمای یەکەم:** الله تعالی ئێمەی درووست کردووە و دەمانژێنیت و هەروا لەم ژیانەدا بەجێیان ناهێڵێت چیمان بوێت بە ئارەزووی خۆمان ئەنجامی بدەین، بەڵکو پێغەمبەرێکی بۆمان ناردووە بە دین و پەیامێکی پاك وپاراو و تێروتەسەل بۆ چاککردنی ژیان و بەختەوەری دوارۆژمان، جا هەرکێ گوێڕایەڵی بکات دەچێتە بەهەشت وکێ لێی هەڵگەڕێتەوە دەچێتە دۆزەخ، ئەم بنەمایەش شەرح و ڕوونکردنەوەو وردەکاری زۆری دەوێت وقسەو باس زۆر هەڵدەگرێت، لە کتێبەکانی عەقیدەدا بە وردی شیکراوەتەوە.
بە تایبەتیش لە (الأصول الثلاثة) و شەرحەکانی.

**بنەمای دووەم:** الله عزوجل هەرگیز قبوڵ ناکات و ڕازی نابێت هیچ کەسێك، ئەگەر پێغەمبەر و مەلائیکەتیش بێت، هیچ جۆرە شیرك و هاوەڵێکی بۆ بڕیار بدات، بۆیە موسوڵمان پێش هەموو شتێك دەبێت جۆرکانی شیرك لە (الربوبية) و (الألوهية) و (الأسماء و الصفات)دا شارەزا بێت بەو شێوەی کە لە قورئان و لە سوننەتدا باس کراون بۆ ئەوەی خۆی لێیان لابدات و لە هۆکارەکانی چوونە دۆزەخ خۆی بپارێزێت.

ئەم باسەش شیکردنەوەو لێکدانەوەو ڕوونکرنەوەی زۆری دەوێت، بەهەمان شێوە لە کتێبەکانی عەقیدەدا باس کراون.

ئەوەشت لەبیر نەچێت شیرك تەنها ئەوە نییە کەسێك سەجدە بۆ بتێك ببات، یان کەسێك بە پەروەردگار و ڕازق و خاوەن توانای ژیاندن ومراندن بزانێت، یان هاوار بە قەبرو شەخسێکی مردوو بکات، نەخێر، ئەوانە تەنها شێوە بەناوبانگەکانی شیرکن، شێوازو و جۆری گەلێك زۆرە، بەتایبەتی لەم سەردەمەی خۆماندا شێوازی هاوچەرخی گەلێك زۆربووە، بۆیە ئەرکی هەرە مەزنی موسوڵمان ئەوەیە بەتەواوی لێیان شارەزا بێت بۆ ئەوەی لێیان سەلامەت و دوور بێت.

**بنەمای سێیەم:** هەرکێ گوێڕایەڵی پێغەمبەری کرد ﷺ و دانینا بە تەوحیدی الله تعالي و بە زمان وتی و کردەوەی پێکرد، نابێت خۆشەویستی بۆ هیچ نەیارو دوژمنێکی الله تعالي هەبێت، با ئەو نەیارودوژمنە نزیکترین کەسیشی بێت.

ئەم سێ بنەمایە لە نامیلکەیەکی بچووکی شێخ محمد بن عبدالوهاب دا بەبەڵگەکانی ئایەت و فەرموودەی سەحیحەوە باس کراوە بەناوی (الأصول الثلاثة) کە پێویستە هەمو موسوڵمانێك بەتایبەتی ئافرەتان لە گەڵ یەکێك لەشەرحەکانیدا بیانخوێنێت، پێش ئەوەش هەر لەو نامیلکەیەدا باسی چوار مەسەلەی گرنگی تری کردووە کە پێویستە فێریان ببین ئەوانەش بریتین لە:

١- ناسینی الله وپێغەمبەرەکەی ﷺ و دینی ئیسلام. دەبێت پێناسەی زانستی و بەڵگەداری ئەو سێ بنچینەی ئیسلامە بزانیت.

٢- کردەوە بکەین بەو زانستەمان لەو سێ بوارە مەزنەدا و تەنها قسەیەکی پەتی و بەرجەستە نەکراو نەبێت.

٣- ئینجا تەنها لە ئاستی کردەوە پێکردنیشیدا نەوەستین، بەڵکو بانگەوازی بۆ بکەین و خەڵکی بۆ ئەو زانست و بیروباوەڕ و خێرە بانگهێشت بکەین.

٤- لەسەر هەموو ناخۆشییەکیش کە لەو ڕێگەیەدا تووشمان دەبێت ئارام بگرین.

چونکە هەرکێ دەعوە لەسەر ڕێبازی قورئان و سوننەت بکات، بەڕاست نەك بە

ئیددیعاو سازش وخۆ گونجاندن لە گەڵ جاهیلییەتی هاوچەرخدا ، تووشی ئازار و ناخۆشی و مەینەتی دەبێت.

ئەم چوار مەسەلەش هەمان ئەو مەسەلانەن کە لە سورەتی (العصر)دا هاتووە.

دین و ئیمانت، عەقیدەو بیروباوەڕت، هەرگیز سەلامەت و ڕاست ودرووست نابێت، تاکو لەو سێ بنەما و ئەم چوار مەسەلە بەتەواوی شارەزا نەبیت ودواجاریش پێویستە بیکەیت بە کردەوەو لە کەسایەتیتدا ڕەنگ بداتەوە، هەرکەی وات کرد، تۆ موسوڵمانێکی بەو شێوەی کە داوات لێکراوە و ڕێگای بەهەشتت گرتووەتەبەر و هەرکەی بمریت لەسەر فیترەت و تەوحید دەمریت و بە دڵخۆشی وئاسوودەیی دەچیتەوە لای پەروەردگارت و بەختەوەر دەبیت ان شاءالله.

هەرکێیش ڕێگایەك بە ڕاستگۆیی وبە دڵسۆزی و شارەزایی و ورەی بەرزەوە بگرێتە بەر، بێگومان بە سەلامەتی و بەسەربەرزی دەگاتە جێگای مەبەست.

# پەیامی چوارەم: تەوحید بکە دروشمی ژیانت

تەوحید بکە بەو دروشمەی لە درێژایی ژیانتدا بەرزی بکەیتەوە و لە هەموو قۆناغ وهەنگاوێك لە هەنگاوەکانی تەمەنتدا با لە ناخت و لە پێش چاوت و لە هەموو کردەوەکانتدا ئامادە بێت و رەنگ بداتەوە، هەرچییەکت لە ژیانتدا ئەنجامدا, سەرەتا دڵنیابە لەوەی هیچ تێکگیرانێکی لە گەڵ ئیمان و تەوحیدو عەقیدەی ئیسلامدا نەبێت، ئەگەر هەیبوو دەبێت وەکو ئافرەتێکی موسوڵمان دوورترین کەس بیت لێی.

بەڵام! ئەوە بزانە تاکو تەواو لە تەوحید شارەزا نەبیت و نەبیتە فێرخوازی زانستی شەرعی و لە پێناویدا ماندوو نەبیت، سنوورەکانی نازانیت، تاکو بزانیت بەزاندووتە یان نا، بۆ ئەوەی تەوحید بپارێزیت دەبێت لە تەوحید و بیروباوەڕی ئیسلامی شارەزا بیت، لەم بەشەدا و لە ڕۆشنایی قسەی ئەهلی عیلمدا چەند ئامۆژگارییەکی سەرەتاییت لەو بارەوە ئاراستە دەکەم:

١- لە هەموو عیبادەت و کردەوەیەکی باشتدا بیرت لەلای تەوحید و بیروباوەڕ بێت ونیەتت لە نجامدانیدا تەنها و تەنها بۆ الله پاك بکەرەوە: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ﴾[1].

٢- شوێنکەوتنی سونەت و موتابەعەکردنی پێغەمبەر ﷺ ودوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرە بیدعەیەک لە عیبادەتدا، بەشێکە لە عەقیدەو بیروباوەڕی موسوڵمان ودەبێت ئەوە بەدین و ئیمان بزانیت، شوێنکەوتنی سوننەت بەشێکە لە عەقیدە و دوورکەوتنەوە لە بیدعەش بەهەمان شێوە: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه، فهو ردٌّ)[2]

٣- لە جۆرەکانی شیرکی گەورەو بچووکدا خۆت بپاریزە، پێویستە بە شێوەیەکی زانستیش لەو بوارەدا شارەزا بیت، بەلای کەم کتێبی (التوحيد الذي هو حق الله على العبيد) بە وردی و وردبوونەوە لە واتاو بەڵگەکانی بخوێنیتەوە.

لەم سەردەمەدا جۆرەکانی شیرکی گەورە لە سەردەمانی پێشوو زۆرتر بووە و نەشارەزایی خەڵکیش لە عەقیدەدا بووە بەهاندەری بڵاو بوونەوەی ئەو جۆرە شیرکانە، بۆ نموونە:

---

(١) - البينه: ٥.

(٢) - رواه البخاري ومسلمٌ.

* عیبادەت کردن بۆ غەیری الله تعالی، وەکو هاوار کردن بە ئەوانەی پێیان دەوترێت ئەولیا وپیاو چاکان و سوڕخواردن بە دەوری گۆڕەکانیاندا و باوەڕ بوون بەوەی کە ئەوان دوای مردنیان دەتوانن سوود و زیان بە خەڵکی بگەیەنن، ئەوە شیرکی گەورەیە و موسوڵمان لە ئیسلام دەردەکات.

* سەربڕین بۆ غەیری الله تعالی بۆ هەر مرۆڤێك بێت یان بۆ جنۆکە، دەبێت بە شیرکی گەورە، ﴿قُل إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ. لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمرتُ وَأَنَا أَوَّلُ المُسلِمِينَ﴾[1]

(لعن الله من ذبح لغير الله)

* باوەڕ بوون بە ڕاستێتی یان گونجاوی ئەو یاسایانەی کە پێچەوانەی قورئان و سوننەتن بۆ ژیان، یان باوەڕ بوون بەوەی کەسێك جگە لە الله تعالى مافی ئەوەی هەیە شەریعەت و ڕێبازێك بۆ خەڵکی دابنێت لەسەری ڕێبکەن و ژیانی خۆیانی لەسەر ڕێکبخەن و پێچەوانەی قورئان و سوننەتیش بێت ئەوە شیرکی گەورەیە.

[1] - الأنعام: ١٦٢ /١٦٣.

* ڕۆیشتن بۆ لای ساحیر و جادوباز و فاڵچی بۆ ئەوەی سیحرو فاڵ بۆ ئەو کەسە بکەن وکێشەی بۆ چارەسەر بکەن و خەڵکی لەلا خۆشەویست بکەن یان هەر ئیشێکی بۆ بکەن، ئەوە شیرکی گەورە و موسوڵمان پێی لە ئیسلام دەردەچێت.
﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحرَ﴾[1]
(من أتى كاهنا أو عرافا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد)[2]

* خۆشەویستی ڕادەبەدەر و توانەوە لە خۆشەویستی کەسێکدا، یان لایەن و حیزب و تەوژم و ڕژێم و هەر شتێکدا مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت ببێتە شیرکی گەورە بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەس و لایەن وکەسایەتی و...هتد فەرمانی بە خراپە پێ بکات و ئەویش لەبەر خۆشەویستییەکەی گوێڕایەڵی بێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُم كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبّاً لِلَّه وَلَو يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذ يَرَونَ العَذَابَ أَنَّ القُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعاً وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ العَذَابِ﴾[3]
لەم بارەوە لە یوتیوب کورتە وانەیەکم هەیە بەناونیشانی جۆرەکانی شیرك دەتوانن سوودی لێ ببینن:

---

[1] - البقرة: ١٠٢.
[2] - رواه أحمد صحيح الجامع (٥٩٣٩).
[3] - البقرة: ١٦٥.

٤- شیرکی بچووک بریتییه لەو کارانەی کە شەرع قەدەغەی کردووە چونکە دەبێتە هۆکار ورێگەیەک بۆ شیرکی گەورە، بەڵام ئەنجامدەری لە ئیسلام دەرناچێت، جۆرەکانیشی وەکو ابن القیم فەرموویەتی گەلێک زۆرن، وەکو ڕوپامایی کەم و دەرخستنی هەندێ عیبادەت بۆ ئەوەی خەڵکی بە خاوەنەکەی بزانن وسوێند خواردن بە غەیری الله عزوجل.

٥- لاإله إلاالله بنچینە وجەوهەری عەقیدەی ئیسلامییە، کێشەی موسوڵمانان لەم سەردەمەدا وەکو ڕستەیەکی ئاسایی و چەند وشەیەکی بەرجەستە نەکراو لە واقیعی ژیاندا وەریانگرتوە، بێباوەڕانی قورەیش زۆر چاکتر لە زۆرێك لە موسوڵمانانی ئەم سەردەمە لە واتا و مەرج و ڕەهەندەکانی تێگەیشتبوون، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەدەبوون بیڵێن! کاتێکیش کە دەیانوت ئیتر هەموو ژیانیان گۆڕانکاری گەورەی بەسەردا دەهات ودەبوون بە هەڵگری پەیام ی لاإله إلاالله و دەبوون بە کەسێکی تر و توانای چاکسازی وبەرگریکردنان لە خۆیان و لە موسوڵمانان بەو لاإله الاالله پەیدا دەکرد، ئێستەش لەبەر ئەوەی لاإله الاالله لە واتاو ڕەهەندەکانی خاڵی کراوەتەوە، پێویستە جارێکی تر موسوڵمانان بە گشتی و ئافرەتان بەتایبەتی لە پێناسەی ئەو وشە مەزنە حاڵی ببن و لە حەوت مەرجەکانی

تێبگەن و کاری پێ بکەن: (ما من عبد قال لا إله إلا الله، ثم مات على ذلك، إلا دخل الجنة)[1]. (من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنة).

٦- بەردەوام لە کاروباری ژیانتدا و لە کرداری ڕۆژانەتدا زمانت لەگەڵ وتنی لاإله إلاالله دا ڕابهێنە، چونکە ئەوە ئەگەر لەگەڵ تێڕامان و بیرکردنەوە بێت لە واتاکانی، بۆ چەسپاندنی تەوحید و مافەکانی لاإله إلاالله کاریگەری هەیە، هەر بۆیە لە فەرمودەی سەحیحدا فەرمانمان پێکراوە ڕۆژانە سەد جار بڵێین: (لاإله إلاالله وحده لا شريك له الملك وله الحمد وهو على كل شئ قدير).

٧- بەشێکی تری گەورەی عەقیدەو تەوحید تایبەتە بە ئەوەی زانایان بە (الولاء والبراء) لە کتێبەکانی عەقیدەدا باسیان لێ کردووە، واتە خۆشویستن و ڕقلێبوون لە پێناو الله عزوجل، هەرکێ ئیماندار بێت و لەسەر ڕێبازی لاإله إلاالله وتەوحید بێت واجبە لەسەری موسوڵمانان خۆشیان بوێت، هەرکێ بە پێچەوانەی ئەوە بێت، واتە ڕقی لە ئیسلام وموسوڵمانان بێت خۆشویستنی درووست نییە و لەگەڵ ئیمان و تەوحیددا تێکدەگیرێت ویەکناگرنەوە:

---

[1] - البخاري ومسلم

﴿يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا عدوي وعدوكم أولياء تلقون إليهم بالمودة﴾، ﴿يأيها الذين آمنوا لا تتخذوا اليهود والنصارى أولياء بعضهم أولياء بعض ومن يتولهم منكم فإنه منهم﴾. لەم بارەوە پێویستە پرسەکە لە ڕۆشنایی ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ وەربگیردرێت، بۆ زیاتر شارەزا بوونی ئەم پرسە کتێبی (الولاء والبراء في الاسلام ی محمد القحطاني) بخوێنەوە بە سوودە.

٧- گەلێك گرنگە و کاریگەری گەورەی هەیە لە بڵاوکردنەوەی تەوحید و عەقیدەی ڕاست و درووستی ئیسلامدا، منداڵت هەر لەسەرەتای تەمەنیانەوە لەگەڵ خۆشویستن و گرنگیدان بە عەقیدە بە وشەو نموونەی ئاسان و قسەی خۆش و بەکارهێنانی سۆزی دایکایەتی خۆت ڕایان بهێنیت، کتێبێکم لەو بارەوە هەیە بەناوی فێرکردنی تەوحید بۆ منداڵان دەتوانیت سوودی لێ ببینیت.

# پەیامی پێنج: ئەگەر زانستی شەرعیت نەبێت لافاوی گومڕایی ڕاتدەماڵێت

یەکێك لە گەورەترین ئەو کێشانەی کاریگەری خراپ لەسەر ئافرەتی موسوڵمان درووست دەکات وناهێڵێت وەکو پێویست بە ڕۆڵی خۆی هەڵبسێت، کەمی زانستی شەرعییە، چونکە هەر ئافرەتێك زانستی شەرعی نەبێت، یان سەرەتایەکی کەمی لێ بزانێت ولەو ئاستەدا بوەستیت، لە ژیانیدا تووشی سەدان کێشەی جۆراوجۆر دەبێت کە بۆ دونیا و دواڕۆژی بەزیان بەسەریدا دەشکێتەوە، بۆیە لێرەدا گرنگی ئەو باسەت لە چەند خاڵێکدا بۆ دەخەمەڕوو بەو هیوایەی کە کاریگەرییەکی باشت لەسەر دروست بکات و ببێتە مایەی هەنگاوی کردەیی:

١- وەرنەگرتنی زانستی شەرعی لە فەزڵ و گەورەیی ئەو بوارە مەزنە بێ بەش و مەحرومت دەکات، الله عزوجل فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾[1] پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ)[2].

---

[1] - الزمر:٩.

[2] - البخاري (٧١) ، ومسلم (١٠٣٧).

٢- لە ڕێگەی بەدەست خستنی زانستی شەرعی، ترس و بەمەزن تەماشاکردنت بۆ الله عزوجل زیاد دەکات و زیاتر لە حیکمەتەکانی پەروەردگار لە گەردوندا تێدەگەیت وتێڕامان پەیدا کەیت، چونکە وردبوونەوە لە ئایەتەکانی قورئان و سوننەت، نهێنییەکانت بۆ ئاشکرا دەکات و پەردە لەسەر چاوەکانت لا دەبات بۆ بینینی زۆر حەقیقەت کە جەهل دەبێتە ڕێگر لە بینینی.

﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾[1]

٣- ئەسڵی زانستی شەرعی ئەوەیە کە بە تێگەیشتنی مەنهەج وئایەتەکانی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ وەردەگیرێت. مانگێك لە تەمەن و کاتی خۆت بۆ فێربوونی زانست تەرخان بکە هەر وەکو نموونەو تاقیکردنەوەیەك بۆ گرنگی و کاریگەری زانستی شەرعی لە ژیانتدا وتەماشای شوێنەوارو کاریگەری بکە، لەو ماوەیەدا بە شێوەیەکی زانستی و لەسەرچاوەی متمانە پێکراو، بە وردی واتاو تەفسیری سوڕەتەکانی الفاتحة و أية الكرسي وکۆتاییەکانی سوڕەتی البقرة و آل عمران وهەروەها سورەتی النور الأحزاب و الكافرون و الإخلاص و هەروەها کتێبی الأربعين النووية بە شەرحەوە بخوێنە و دیراسەیان بکە، یان وەکو وانەی دەنگی لە زانایان ببیسە، دڵنیام ئەوە دەرگای زانستی شەرعیت بە فراوانتر بۆ واڵا دەکات وچێژ لە زانست وەردەگریت ودوای ئەوە باقی تەمەنت لە فێربوونیزانست دانابڕێی.

---

[1] - فاطر:٢٨.

٤- ئێمە لە سەردەمی فیتنەی دین و دونیادا دەژین، دینمان لە پێناو دونیاماندا لە مەترسیدایە، خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی وەکو مەست و بێئاگان، بەکۆمەڵ بەرەو مەرگی خۆیان دەڕۆن و لە هیچ پەند وەرناگرن، فیتنە لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێکردووین و مەگەر بە دوو چەك بتوانیت رووبەڕووی ئەو فیتنەیە ببیتەوە:

یەکەم: چەکی ئیمان و دوعا وشانازیکردن بە دینەکەت وبەردەوام بوونی پەیوەندیت بە عیبادەت لە گەڵ الله تعالی .

دووەم: لەگەڵ چەکی زانستی شەرعی کە لە گومڕابوون و لە خشتەچوون و هێزی لافاوی جاهیلییەت دەتپارێزێت. (کتێبی عودة الحجاب)ی محمد اسماعیل المقدم کتێبێکی باشە بخوێنرێت.

٥- ئێستا دژایەتیکردنی دوژمنانی ئیسلام بەراورد لەگەڵ سەردەمانی پێشوودا زۆر جیاوازە، ئێستا بەهێزترین ڕێگا لە گومڕاکردن لەم سەرەدەمەدا ڕاگەیاندنەکانە کە شەوو ڕۆژ سەرقاڵی تێکدانی ڕەوشتی گەنجن لە کوڕان و کچان و خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی ئەوان هەزاران دەزگای تایبەتمەند سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی گومانن لە هەموو بوارەکانی ژیان ودیندا، ئەوەش دەردێك و پەتایەکی کوشندیەیە ڕاستەوخۆ توشی ئەوانە دەبێت کە زانستی شەرعییان نییە، بۆیە کات بە فیڕۆ مەدە و لە تەفسیری سوڕەتی الفاتحة و سێ سوڕەتی کۆتایی قورئانەوە دەست پێ بکە و زۆر لە گەڵیاندا بوەستە، ابن القيم تەنها لە سەر سورەتی الفاتحة سێ بەرگی نووسیوە (مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين).

٦- زانستی شەرعی بۆ ئافرەت وەکو ڕووناکییەکە نەك تەنها لەم زەمەنە تاریك وجەنجاڵەدا بەرچاوو دەوروبەری خۆی پێ ڕوناك دەکاتەوە، بەڵکو ڕۆشنایی دەبەخشێت بە زۆرێك لەوانەی نزیکین وەکو دایك و باوك ومناڵ وهاوڕێ و خزمەکانی، بەڵکو دەتوانێت هۆکارەکانی ئەم سەردەمە بۆ بڵاوکردنەوەی زانست بەشێوەیەکی شەرعی بقۆزێتەوە وخێروزانستەکەی بە خەڵکانێکی زۆر بگەیەنێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾[1] ئەوەش بزانە کارکردن بۆ ئیسلام شەرەفێکی گەورەیە بەبێ زانست پێت ناکرێت، دەرەنجام و بەرو بوومیش تەنها لەلای الله یە و تۆ لەوە بەرپرس نیت.

٧- ئافرەت لە بواری عەقیدەو بیروباوەڕدا ناتوانێت بەو شێوە هەڵسوکەوت بکات کە الله پێی ڕازییە وناشتوانێت لە زۆر سەرپێچی بیروباوەڕ کە ئەمڕۆ باوە و لە واقیعی ژیاندا ئاسایی بووەتەوە خۆی بپارێزێت، بەڵکو زۆر جار کەمیی زانستی شەرعی وای لێ دەکات ببێتە ئامراز ویارمەتیدەر بۆ چەندین کاری پێچەوانە لەگەڵ تەوحید و بنەماکانی بیروباوەڕدا؛

[1] - الزمر:٩.

* کە ئافرەت بە شێوەیەکی زانستی و بەبەڵگەوە هەڵوەشێنەرەوەکانی (لاإله إلاالله) نەزانێت، و ئەویش وەکو زۆربەی مەلاکان و کەسایەتییە ئیسلامییە مۆدێرنەکان وابزانیت (لا إله إلا الله) تەنها ڕستەیەکە و بیڵێیت ئیتر بەهەشتت بۆ خۆت مسۆگەر کردووە!  ئیتر چۆن بتوانێت خۆی لەو هەڵوەشێنەرەوانە بپارێزێت؟

* کە ئافرەت سیفەت و خەسڵەتی فیرقە گومڕاکان نەزانێت، نیشانەی تاقمەکانی خەواریج و ئەشاعیرە و موعتەزیلە و عەقلانی و قورئانی و گومڕا هاوچەرخەکان نەزانێت، کاتێك دەزانێت بێ ئەوەی بەخۆی بزانیت چووەتە نێویانەوە و بووەتە هەڵگری بیروبۆچوونێکی ئەوان یان لەبنەمایەکی عەقیدەدا دژ بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت بووەتەوە و باوەڕیشی وایە لەسەر حەق و ڕێگای ڕاستە!

* کە ئافرەت سنوورەکانی (الولاء والبراء) نەزانێت و لە قورئان و سوننەتەوە دیراسەی نەکردبێت هیچ سەیر نییە بە جۆرەها بیانوو و ناوی جیاوازەوە نەبێتە هاوسۆز وپەیوەندی تۆکمەو کارکردنی نەبێت لەگەڵ نەیارانی دینەکەیدا بە تایبەتی ئەوانەی کە لەدەرگای دۆزەخدا لە بۆسەدان بۆ جاهیلەکان مەسەلەکەی بۆ ئاسان و جوان دەکەنەوە،  نەشارەزایی لە عەقیدە لەم سەردەمەدا ڕێگای سەرلێتێکچوون و ونکردنی هیدایەتە، زۆرینەش قوربانی ئەو کەمتەرخەمییەن.
(الولاء والبراء) القحطاني بە سوودە بخوێنرێتەوە.

* كە ئافرەت ناوو سیفەتەكانی الله نەزانێت، چۆن بە دوورخستنەوەو جێبە جێنەكردنی شەرعەكەی ڕادەچڵەكێت وچجای كار بۆ جیبەجێكردنی بكات. عەرەب دەڵێن: (فاقد الشئ لا یعطیه) كەسێك كە شتێكی نەبێت چۆن بیبەخشێت؟! (تحكیم القوانین) ی محمد بن إبراهیم گرنگە بخوێنرێتەوە. بۆ ناسینی ناو و سیفەتەكانی الله تعالى كتێبی: (النهج الأسمى في شرح أسماء الله الحسنى)ی محمد النجدي وكتێبی (القواعد المثلى) ی ابن عثیمین بخوینەوە بە سوودە.

٨- لە بواری شەریعەت و حەڵاڵ وحەرام و سنوورەكانی ئیسلامدا كە دیاری كردووە بۆ ژیانی تاك و خێزان و كۆمەڵگا، ئەگەر شارەزای فیقهی ئیسلامی نەبێت بەبەڵگەكانییەوە هیچ نەبێت لە بابەتە سەرەكییەكاندا، دیسان دەبێتە كەسێكی بێ دەسەڵات و بێ كەسایەتی زانستی، هەركێ بێت دەتوانێت قەناعەتی بەشتێك پێ بكات، چونكە خۆی هیچ بنچینە و بنەمایەكی تۆكمەی نییە كە بە هۆیەوە فریو نەدرێت و لە خشتە نەبرێت. كتێبی (مختصر الفقه الإسلامي) كتێبێكی پوختە لە عەقیدە و فیقهدا بە سوودە بیخوێنیتەوە.

٩- ئەگەر عیبادەت بە ناشارەزایی وبەبێ هەبوونی زانستی شەرعی ئەنجام بدەیت، بێگومان دەکەویتە داوای ئەوانەی لەناو کورددا بەردەوام بیدعە جوان دەکەنەوە و بەرگری لێ دەکەن و ساڵانیکە بە بەهانەی جۆراوجۆرەوە دینداریيان لە خەڵکی تێکداوە وایان تێگەیاندوون کە بیدعە جۆری هەیە و جۆرە باشەکەی نەك هەر حەرام نییە بەڵکو زۆر پێویستیشە بۆ وەرگیرانی عیبادەت کە ئەوەش بوختانە و بۆ شەریعەتی ئیسلام دەکرێت، ئەگەر زانستی شەرعی و شارەزایی باشت لە سوننەتدا نەبیت تووشی بیدعە و لادان لە سوننەت دەبیت و بیدعەش دەردێکی ترسناك وکوشندەیە تووشی دینداری موسوڵمانی بێ زانست و دەمارگیر دەبیت ودەیشێوینێت، زانستی شەرعی لەو دەردە کوشندەیە ڕزگارت دەکات. زۆربەی موبتەدیعەکان جاهیلن سەرانیشیان خاوەن بەرژەوەندین و جەهلی ئەو داماوانەیان قۆستووەتەوە. کتێبی (الإبداع في مضار الابتداع) ی علی محفوظ کتێبێکی بەسودە لەم بارەوە.

١٠- ئەگەر لەبەر هەر هۆکارێك نەتتوانی ئاستی زانستیت بە پێی پێویست ببیەیتە پێشەوە، یەکەم بی هیوا مەبە و هەر لە هەوڵدا ببە چونکە هەولەکەت بۆ خۆی جۆرێکە لە عیبادەت، دووەمیش دەبێت پرسیار بکەیت، بەڵام لەمەسەلەی پرسیار کردندا دەبێت وریابیت، چونکە ئەگەری زۆر هەیە بە مەبەست و بەبێ مەبەست تووشی بیدعە ولە بیدعە خراپتریش بکرێیت و ڕێگای هەڵەو لە خشتەچوونت بە نرخی ڕێگای ڕاست وهیدایەت پێ بفرۆشنەوە. سایتی (الإسلام سؤال وجواب)ی محمد صالح المنجد سایتێکی باشە بۆ وەرگرتنی وەڵامی زۆر پرسیاری شەرعی.

ئەم سەردەمەی خۆمان بۆ چرکەساتێکیش گومانت نەبێت، کە خراپترین سەردەمەکانی ئیسلامە لە هەموو سەدەکاندا، چونکە زۆرێك لەو ئەو ژمارە زۆرانەی لە سەرزەویدا ئەمڕۆ موسوڵمانن لەسەر بنەمای عیبادەت وڕواڵەت نەك لەسەر بنەمای تەوحید وعەقیدە وناسینی ڕێبازو مەنهەج موسوڵمانن، زۆربەیان کۆڵەکە وپایەکانی ئیمان و ئیسلام بە باشی نازانن، ئەگەر بیشیزانن لەیەکیان ناکەنەوە وتێکەڵیان دەکەن، زۆربەی زۆریان فەرز و سوننەتەکانی نوێژ و دەستنوێژ نازانن، لە هەموو وڵات و شوێن و قوژبنێکی ئەم سەرزەوییەشدا، بەناو ئیسلامەوە کەسانێکی گومڕا و ڕاوەستاو هەن لەبەر دەرگای دۆزەخدا خەڵکی بۆ بانگ دەکەن، کەسان و لایەن و ڕاگەیاندن و ئامرازگەلێکی زۆر بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کراوە و جەهلی موسوڵمانانیش بەدینەکەیان وای کردووە ئەوان ببنە نیچیرێکی زۆر ئاسان بۆ ئەو کەس و لایەنان و دەولەتانە و دەرەنجامیش

کۆمەڵگایەکی زۆر لە جیهانی ئیسلامیدا پەیدا بووە، بەڕواڵەت و بانگەشە کۆمەڵگایەکی موسوڵمانە و کە لێیشی وردەبیتەوە نە عەقیدەی و نە ئائاکاری و نە جێبەجێکردنی بۆ ئیسلام لە موسوڵمان ناچێت، لەو جەنگلستانەدا پاش لوتف و هیدایەت و ڕەحمەتی الله تعالی تەنها زانستی شەرعی فریات دەکەوێت. ئەگینا دەست لەخۆت بشۆ و بڵێ تیاچووم!

١١- لە مەسەلەی زانستی شەرعیدا بەوە فریو مەخۆ کە هەمووی هەر بانگەشەی کیتاب و سوننەت دەکات وخۆی بە ڕاست و غەیری خۆی بە هەڵە دەزانێت! مەسەلەکە بە قسە و بانگەشەکردن نییە، ئەگینا کورد واتەنی کەس بە دۆی خۆی ناڵێت ترشە، لە منی وەرگرە، ئەوانەی لەم ڕۆژگارەدا کە بەڕاستەوە لەسەر مەنهەجی قورئان و سوننەتن وئیسلام وەکو خۆی بێ دەستکاری و بۆ زیاد کردن و لێ کەم کردن باوەڕیان پێیەتی ودەیانەوێت جێبەجێی بکەن، ڕێژەو ژمارەیان گەلێك کەم و دەگمەنن. کە بنەماو بنچینەکانی عەقیدە و شەریعەتت زانی ئەگەر تەنها هێڵە پان و بابەتە سەرەکییەکانیشی بێت، ئەو کات بە جوانی دەتوانیت ڕاستگۆ و ناڕاستگۆ لە یەکتر جیا بکەیتەوە، کەس ناتوانێت خۆڵت بە نرخی زێڕ پی بفرۆشێت و فریوت بدات، ئەگەرنا دەبیتە هاوکار و ئەندام و یارمەتیدەر لەگەڵ ئەوانەدا و خۆیشت بە کەسێك دەزانیت بە باشترین شێوە هیدایەتت وەرگرتووە ولەسەر ڕێگای ڕاستی. بێ زانستی و هەبوونی ئەو ژمارە زۆرە لە گومڕاکەران، جەهلی مورەکەبت لەلا درووست دەکات: واتە نازانیت و ناشزانیت کە نازانیت!

١٢-لە مەسەلەی گرنگی زانستی شەرعیدا ئافرەتانی سەردەمی پێغەمبەرایەتی بکە بە پێشەنگی خۆت و شانازییان پێوە بکە و شوێن پێیان هەڵبگرە، ئەوان هێندە پەرۆش بوون بۆ فێربوونی زانست، داوایان دەکرد پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکی تایبەتیان بۆ دابنێت ئامۆژگارییان بکات و ئەوانیش پرسیاری لی بکەین: (غلبنا عليك الرجال فاجعل لنا يوما من نفسك، فوعدهن يوما لقيهن فيه فوعظهن وأمرهن، فكان فيما قال لهن: مامنكن امرأة تقدم ثلاثة من ولدها إلا كان لها حجابا من النار، فقالت امرأة: واثنين، فقال: واثنين)[1] کتێبی (صور من حياة الصحابيات)ی عبدالرحمن رأفت الباشا بخوێنەوە.

١٣ - بۆ ئەوەی ببیتە خاوەن کەسایەتییەکی موسوڵمان نەك هەر تاکێکی ئاسایی نەرێنی بیت، بۆ ئەوەی خەمی دینەکەت لە دڵتدا هەڵگریت و کاری بۆ بکەیت، بۆ ئەوەی سەرەوری بانگەوازت لەسەر بنەمای کیتاب و سوننەت ودوورکەوتنەوە لە گومڕاکان پی ببڕێت، پێویستت بەزانستە، بۆیە هەمیشە خەریکی قورئان ببە، بەڵام هەرکاتێك خەریکی تەجوید بوویت ئەوە بزانە کە تەوحید لە پێشەوەیە با ئەو بابەتە لە پرسە گەورە ومنەجە مەزنەکەی قورئان دوورت نەخاتەوە، دوای ئەوەش لەوە دڵنیابە وردەکاری بنەماکانی ئایین و حوکمەکانی شەریعەت لەناو کتێبەکانی سوننەت و وتەی پێشینان و ئەوانەی کە بەڕاستەوە شوێنکەوتووی ئەوانن دەست دەکەوێت.

---

(١) - صحيح البخاري: ١٠١.









١٤- ئەم چەند دێڕەی سەرەوە لە لایەن نووسەرەکەی بانگەوازێکی سنووردارە بۆ قەبرو قیامەتی خۆی تکاکارە ببێتە پاداشت بۆی، بەڵگەیەکیشە بەسەر تۆی ئافرەتی بەڕێزەوە کە دەبێت خەمی فێربوونی زانست بە باشترین شێوە بخۆی بۆ ئەوەی سەربەرزی دونیا و بەختەوەری دواڕۆژی پێ بەدەست بهێنیت.



# پەیامی شەشەم: بەشەرم خۆت بڕازێنەوە

شەرم ئەو ئاکارە جوانەیە کە لە هەموو گوفتار وکردارێکی ناشیرین دەتپارێزێت، شەرم بریتییە لە دڵ توندبوونی تۆ لە شتێك نەوەك ببێتە مایەی لۆمە وناشیرین بوونی کەسایەتیت. شەرم خۆی لە خۆیدا ئاکارێکە دەبێتە مایەی دوورکەوتنەوە لە هەموو گوفتار و کردارێکی ناشاییستە وڕێگریشە لە کەمتەرخەمی بەرانبەر هەر کەسێك کە مافێکی لەسەرت هەبێت. بە کورتی وەکو زانایان فەرموویانە شەرم و حەیا ویقار و سەنگینییە بۆ کەسایەتی مرۆڤ تەنها بەو مەرجەی سەر بۆ لاوازی کەسایەتی وبێ دەسەڵاتی وبێ هەڵوێستی نەکێشێت.

شەرم دوو جۆرە، یەکەمیان لە فیترەت و ناخی مرۆڤەکاندا بوونی هەیە، بۆ نموونە شەرم لە دەرکەوتنی عەورەت وئەندامەکانی جەستە، هەرکێ فیترەتی سەلامەت بێت لەو حالەتە شەرم دەکات، هەرکێیش فیترەتی تێك بچێت ئاسایی دەبێت بەلایەوە عەورەت و ئەندامەکانی جەستەی بەدەروە بێت.

وەکو الله تعالى دەربارەی ئادەم وحەوا علیهما السلام فەرمویەتی:

﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾[١]. واتە: كاتێك جەستەیان كەوتەدەر لەشەرمدا بە گەڵای دارودرەختەكان خۆیان دادەپۆشی.

لە فەرموودەشدا كە پێغەمبەر ﷺ بە كەسێكی فەرمووە: تۆ دوو خەسڵەتت تێدایە الله و پێغەمبەرەكەی ﷺ خۆشیان دەوێت: لەسەر خۆیی و شەرم.

جۆری دووەمیش لەشەرم هۆكاری درووستبوونی باوەر و ئیمانە و دەبێتە ڕێگریش لەوەی كەسی ئیماندار تاوان ئەنجام بدات، جا پێغەمبەرمان ﷺ كە مامۆستا و ڕێپیشاندەری ئێمەیە، هەردوو جۆرە شەرمەكەی تێدا بوو، لەشەرمە فیترییەكەدا لە كچێكی ڕەوشت جوان بەشەرمتر بوو، لەو جۆرەكەشدا لە چڵەپۆپەی شەرم كردندا بوو.[٢]

لە ئیسلامدا شەرم بە گشتی و شەرم كردنی ئافرەت بەتایبەتی گەلێك گرنگی پێدراوەو لە قورئان و لە سونەتدا وەسف وسەنای زۆر كراوە، قورئانی پیرۆز لە سوڕەتی (القصص) لە ئایەتەكانی ٢٣-٢٥ دا نموونەی ئەو دوو كچە بە حەیا وبەشەرمەی ئەو پیاو چاكەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە نموونەی پەروەردەی جوان و خێزانی بەخشندە و ئاكار بەرز بوونە ودەبێت هەموو ئافرەتێكی موسوڵمانیش ئەوان بكاتە پێشەنگ و مامۆستای خۆی كە وانەی شەرم و شكۆیان لێ فێر ببێت.

---

[١] - طه ١٢١

[٢] - الباري فتح، ٥٢٢/١٠-٥٢٣.

له نیشانه‌كانی بایه‌خدانی شه‌ریعه‌تی ئیسلامیش به لایه‌نی شه‌رم له كچاندا ئه‌وه‌یه پێغه‌مبه‌ر ﷺ بێ ده‌نگ بوونی كچی له كاتی خوازبێنی كردنیدا به نیشانه‌ی ڕازیبوون داناوه وه‌كو ره‌چاوكردنێك بۆ ئه‌و حاڵه‌تی شه‌رمه‌ی كه له‌وانه‌یه ڕێگر بێت له‌وه‌ی به ڕاشكاوی ڕه‌زامه‌ندی له‌سه‌ر خوازبێنیكار نیشان بدات.

له ڕاستیدا سیفه‌تی شه‌رم بۆ ئافره‌ت سودو چاكه‌ی گه‌لێك زۆرن، هه‌موو كاتیكیش هه‌ر به خێرو شكۆ و سه‌نگینی به‌سه‌ر خاوه‌نه‌كه‌یدا ده‌شكێته‌وه، هه‌ر شه‌رمه ڕێگری لێ ده‌كات له‌وه‌ی جوانییه‌كانی جه‌سته‌ی بۆ پیاوانی نامه‌حره‌م ده‌ربخات وخۆی داپۆشێت، هه‌ر شه‌رمه ده‌بێته ڕێگر له تیكه‌ڵ بوونی له‌گه‌ڵ پیاواندا و كه‌سایه‌تی ئیسلامی و سه‌نگینی خۆی بپارێزیت.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (الحياء لا يأتي إلا بخير)[1] واته: شه‌رم وحه‌یا ته‌نها خێری لی چاوه‌ڕوان ده‌كرێت.

---

[1] - البخاري ومسلم.

ابن قيم الجوزية بە ڕەحمەت بێت فەرموویەتی: خەسڵەتی شەرم کردن لە مەزنترین و بە سوودترین وجوانترین ڕەوشتەکانی مرۆڤە، هەرکێیش لەو سیفەتە بێ بەش بێت هیچ خێرو چاکەیەکی بۆ خۆی نەهێشتووەتەوە، ئەگەر سیفەتی شەرم نەبوایە زۆرێك لە سیفەتە چاکەکانی تر بوونیان نەدەبوو، نە خەڵکیش خۆیان لە ڕەوشتە خراپەکان بە دوور دەگرت ودەپاراست.

بەڵکو شەرم بەشێکە لە ئیمان وەکو لە هەندێك فەرموودەی سەحیحدا هاتووە.

ئەو ئافرەتەی کە ڕوخساری خۆی بە شەرم پاراستووە لە ڕاستیدا وەکو گەوهەرێکە، هیچ کاتێکیش لەشەرم جوانتر و پەسەندتر نییە ئافرەت خۆی پێ بڕازێنێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا كَانَ الفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ ، وَمَا كَانَ الحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ)[1]. واتە: بێ شەرمی لە هەرشتیکدا بێت ناشیرینی دەکات و شەرمیش دەیڕازێنێتەوە.

شەرم کردن ڕەوشت و شەریعەتی هەموو پێغەمبەرانە عليهم السلام، ئەوان یەك لە دوای یەك جەختیان لەسەر گرنگی ئەو خەسڵەتە جوانە کردووەتەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ مِمَّا أدْرَكَ النَّاسُ مِن كَلامِ النُّبُوَّةِ، إذا لَمْ تَسْتَحْيِ فافْعَلْ ما شِئْتَ)[2]

---

[1] - صحيح الجامع: ٥٦٥٥

[2] - البخاري/ ٣٤٨٣.

ئەگەر شەرم سیفەتێکی جوان وباش بێت بۆ پیاوان، ئەوا بۆ ئافرەتان جوانتر و باشترە، چۆنکە شەرم ئافرەت دەڕازێنیتەوەو لەلای دەروبەر سەنگین وخۆشەویستی دەکات، شەرم لە ئافەرتدا نیشانەی خێرە و ڕووداری وبێ شەرمی نیشانەی شەڕ و خراپەیە، شەرم پارێزەرو پاسەوانی ئافرەتە.

سەرپۆش و پۆشتەیی ئافرەت نیشانە و بەڵگەی سەلمێنەری بوونی شەرمە و پارێزەری خەسڵەتە جوانەکانی ئافرەتە، شەرم و پۆشتەیی هاوتا و هاوواتان و لەیەکتر جیا نابنەوە، مەیلی ئافرەت بۆ داپۆشینی خۆی مەیلێکە لە ناخیدا وەکو فیترەت بوونی هەیە.

دایکمان عائیشە الله لێی ڕازی بێت دەفەرموێت جاری وابوو دەچوومە ئەو ژوورەی کە پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکری لێ نێژرابوون و لەوانەیە سەرپۆشم نەکردایە، دەموت ئەو مێردمە و ئەوەش باوکمە، بەڵام کاتێك عومەر الله لێی ڕازی بێت کوژرا و لەگەڵیاندا لەو ژوورەدا نێژرا .

عائیشە دەفەرمووێت: سوێند بە الله دوای ئەوە ئیتر بەتەواوی پۆشتەییەوە سەردانی قەبرەکانیانم دەکرد مەبەستی ئەوەیە عومەر (الله لێی ڕازی بێت) نامەحرەم بووە بۆی.

تەنانەت لە کتێبەکانی ئەدەب و مێژوودا سەبارەت بە گرنگی شەرمی ئافرەت، باسی ئافرەتێك دەکرێت کە سەرپۆشەکەی بەبێ ویستی خۆی لەسەری دەکەویتە خوارەوەو ئەویش بۆ ئەوەی سەرو روخساری بۆ پیاوان دەرنەکەوێت تاکو سەرپۆشەکەی هەڵدەگرێتەوە بە دەستی دەموچاوی خۆی دەشارێتەوە و النابغةی شاعیریش لە دێڕە شیعرێکی بەناوبانگدا وەسفی کردووەو دەڵێت:

سقط النصيف ولم ترد إسقاطه *** فتناولته واتقتنا باليد

کەمی شەرم لە ئافرەتدا ڕێگای بە هیلاك چونێتی و دواجاریش ڕیگەی تاوان و سەرپێچی کردنی حوکمەکانی ئیسلامی بۆ خۆش دەکات و بەلایەوە ئاسایی دەبێتەوە.

الله تعالی پۆشتەیی ئافرەتی لە قورئاندا بە نیشانەی تەقوا داناوەو بەسەرهاتەکەی ئادەم و حەوا (عليهما السلام) کاتێك جەستەیان دەرکەوت هەوڵیاندا بە گەڵای دارەکان خۆیان داپۆشن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەرم سیفەتێکی فیتری چەق بەستووە لە ناخی مرۆڤەکاندا.

کەسە نەفس بەرز و مەزنەکان تەنانەت شەرم لە خۆیشیان دکەن، کاتێك بیانەویت کارێکی خراپ ئەنجام بدەن، خۆیانیان وەکو منداڵێك یان وەکو کەسێکی تر دێتە بەرچاو کە لە کاتی ئەنجامدانی ئەو خراپەدا تەماشایان دەکەن بۆیە شەرم لە خۆیان دەکەن و کارە ناشیرینەکە ئەنجام نادەن. هەروەها کەسانی بەڕێز و ئیماندار

شەرمی الله و مەلائیکەتان و خەڵکی دەیانگرێت و دەبێتە مایەی پاراستنی سەنگینی خۆیان ودوورکەوتنەوەیان لە تاوان و لەوەی الله تعالى پێی ناخۆشەو پێی ڕازی نابێت.

پێوەری چاکێتی حەیا وشەرم ئەوەیە کە دەبێتە مایەی جوانی و پاکی و ڕازاوەیی و سەنگینی بۆ خاوەنەکەی، بەڵام ئەگەر بووە مایەی لاوازی کەسایەتی و شاردنەوەی حەق و ترس، ئەوە شەرمێکی باش نییە، کێشەش لە شەرمەکەدا نییە لەو حاڵەتەدا، بەڵکو لە تێگەیشتنی کەسەکەیە بۆ شەرم. یان شەرمەکەی ببێتە مایەی ئەنجامدانی تاوان، ئەوەش شەرمێکی خراپە، بۆ نموونە پیاوێك بە مەبەستی تەوقە کردن دەست بۆ ئافرەتێك درێژ بکات و ئافرەتەکەش تەوقەی لەگەڵ بکات بڵێت شەرمم کرد لە ڕووم نەهات پەشیمانی بکەمەوە!

جارێکیان پێشەوا أحمد بن حنبل بە پیاوێکی بەتەمەنی سەر سپی وت: بۆچی قژە سپییەکەت خەنە ناکەیت و ڕەنگەکەی ناگۆڕیت؟ ئەویش وتی شەرم دەکەم، پێشەوا ئەحمەد پێی وت: سبحان الله! ئەوە سوننەتە، لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ چۆن شەرم دەکرێت.

زۆر ئافرەت هەیە دەیانەوێت بە دەربڕینی بوێری و ئازایی، یان چالاکی جۆراوجۆر کەسایەتی خۆیان بسەلمێنن، بەڵام مەحاڵە هیچ لەوانە هێندەی شەرم جوان و بەهێزو خۆشەویستیان ناکات.

کەم بوونی شەرم لە ئافرەتانی ئەم ڕۆژگارەدا هۆکاری داڕمانی کۆمەڵگایە، هۆکاری نەمانی شەرمیش تەنها لابردن و دوور خستنەوەی شەریعەتی ئیسلامە لە واقیعی ژیاندا، چی لە ئاستی ئەوانەی کە موسوڵمان نین و عەلمانیەتیان پی باشترە، چی ئەوانەش کە بەناوی ئیسلامی مۆدێرنەوە خویندنەوەی تازەو نامۆ بۆ دەقەکانی ئیسلام دەکەن و پێیان باشە ئافرەت بەدەنگ و ڕەنگ و جوانی خۆیەوە خۆی دەربخات و وەکو پیاو ئەویش بانگەواز بکات و چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکریت و وانە بڵێتەوە تەفسیری خەو بکات و وەکو ئەوەی ئەگەر کارەکە کە ئەنجامی ئەدات باش بیت ببێتە پاساو بۆ دەرکەوتنی لە کەناڵەکان و لە تۆرە کۆمەڵایەتییەکان، بێ ئەوەی بزانێت، کاری شەرعی و چاکە دەبێت ڕێگای شەرعی و بەشەرم و حەیای بۆ هەڵبژێردرێت، ئەوەشی لەسەردەمی پێغەمبەردا حەرام بووە، تاکو ڕۆژی قیامەت هەر حەرام دەبێت.

ئافرەتی موسوڵمان پێویستە خۆی لە هۆکارەکانی بێ شەرمی بەدوور بگرێت بۆ ئەوەی لەو خەسڵەتە ناشیرینە پارێزراو بێت، هۆکارەکان زۆرن لەوانە:
ئەنجامدانی هەمو جۆرە تاوانێك دەبێتە مایەی کەم بوون و نەمانی شەرم.
گوێگرتن لە گۆرانی و هاوشێوە ناشەرعییەکانی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا.

تێکەڵ بوون لەگەڵ پیاوانی نامەحرەمدا ئەگەر بەبەهانەی کاری ئیسلامی و بانگەوازیش بێت. هاوڕێتی کەسانی بێ شەرم و تەماشاکردنی فیلم و دراما وئەو گرتانەی کە نموونەی بێ شەرم یو ڕووداری وپێچەوانەی رەوشتن. زۆری دەرچوونی ئافرەت لە ماڵ بۆ هەموو ئیش و کارێك و مامەڵە کردنی هاوشێوەی پیاوان لەناو کۆمەڵگادا.

بەداخەوە ئافرەتان لەکاتی جەژن و گەشت وبۆنە خۆشەکاندا، وەکو ئەوەی ئەو کاتانە جیاواز بێت و تاوان و سەرپیچی ڕێگە پێراو بێت، دەبینرێت ئافرەتان ڕێژەی شەرمیان کەم دەکات وڕیگە بە خۆیان دەدەن لە شێوازی ڕەفتا و لە مەسەلەی جل و بەرگ و شێوازی قسەکردن وپێکەنیندا جۆرێك لە بێ شەرمییان پێوە دیار بێت. ئافرەتی موسوڵمان لە هەموو حاڵەتێکدا هەر وابەستەیە بە شەرعی رب العالمين و بە هیچ بەهانە و پاساویك ڕێگە بەخۆی نادات کاری ناشەرعی و نەشیاو لەگەڵ ئاکاری ئافرەتی موسوڵماندا ئەنجام بدات.

یەکێکی تریش لەو دیاردە خراپانەی کە زێدەڕەوی زۆری تێدا کراوەو ئافرەتان ڕێگە بەخۆیان دەدەن تێیدا بێ شەرم بن، مەسەلەی سەردانی کردنی پزیشکی پیاوو سۆنار کردنە لەلای پزیشکی پیاو، بەڕاستی ئەوە دیاردەیەکی زۆر خراپە و دەرەنجامی خراپی بۆ دونیا و دواڕۆژی ئافرەت لێ دەکەوێتەوە!

پەیامم بۆ ئەو ئافرەتە بەڕێزانە ئەوەیە مەگەر هیچ ڕێگەیەکیان لەبەردەمدا نەمێنیت و چارەسەی حاڵەتەکەیان تەنها لەلای ئەو پزیشکە پیاوە بێت، ئەگینا بە هیچ شێوەیەك ئەو کارە درووست نییە و بەوەش خۆیان نەخەڵەتێنن کە پزیشکەکە موسوڵمانە و مولتەزیمە بەدینەوە، ئەگەر بیت و حالەتەکە لەو جۆرە نەبێت کە لە ئەوپەری ناچاریدا بیت، ئەگەر ئەو پزیشکە هەموو شەوێکی بەشەونوێژ بەسەر ببات و ڕۆژەکانیشی بەڕۆژوو بێت هەر درووست نییە بتبینێت و پیاوی نامەحرەم دیندار بێت و دیندار نەبێت لە ڕووی حەرامی سەیرکردنی بۆ جەستەت هەر یەك حوکمی هەیە وجیاوازییان نییە! ئەو مەسەلە ڕێگەیەکە بۆ بڵاوبوونەوە بێ شەرمی و سنوور بەزاندنی ئافرەتان و ئەو پزیشکانەش بۆ شەرع، پەیامێکی تریشم بۆ باوك و مێرد و کەس و کاری ئەو ئافرەتانە ئەوەیە هەست بە لێپرساوێتی بکەن و تا پێیان دەکرێت بەدوای پزیشکی ئافرەتدا بگەڕێن ئەگەر لە شارو شوێنی تریش بووە، کەمتەرخەمی لەو بوارەدا شوێنەورای زۆر خراپی هەیە وئێوەش لەسەر ئەو کەمتەرخەمییە تاوانبار دەبن.

پەیامی کۆتاییشم بۆ ئەو پزیشکانەیە کە وابەستەی ئیسلامن و مەبەستیانە الله لە خۆیان رازی بکەن، چارەسەر کردنتان بۆ ئافرەتانی نامەحرەم بەو شێوە بەڕەهایی ڕێگەپێدراو نییە و ئیوە تساهل و شلییەکی بێ پاساوتان لەو بارەوە هەیە، بەدڵنیاییەوە ئەسڵ لەو مەسەلەدا ئەوەیە کە حەرامە و نادرووستە، خۆیشتان لە هەموو کەس باشتر دەزانن کامە حاڵەت ناچارییە و لەو حاڵەتەشدا هەر دەبێت

هەموو ڕێوشوێنێکی شەرعی و دوورکەوتنەوە لە گوناە بگرنە بەر، لە ڕاستیدا زۆرێك لەو پزیشکانەی کە بە موسوڵمان و مولتەزیم ناسراون، بەشێوەیەکی زۆر بێ مەعنا و بێ پاساو بەڕەهایی و بەبێ سنوور هاوشێوەی بینین و چارەسەر کردنیان بۆ پیاوان چارەسەی ژنانیش دەکەن و تەماشای هەموو جەستەی دەکەن و مەسەلەکە هەر زۆر ئاسایی بووەتەوە لە لایان، بۆیە داواتان لێ دەکەم ترسی الله تان هەبێت و ئەگەر حاڵەتێك لە ئەوپەڕی ناچاریدا نەبێت نەخۆشی ئافرەت مەبینن و سنوورەکانی شەرع بپارێزن ومەیبەزێنن.

لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە بوترێت، لەم ڕۆژگارەدا تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بووەنەتە هۆکارێکی کاریگەر بۆ نەهێشتنی شەرم لەلای ئافرەتان، بەداخەوە، بەهەندێ بەهانەی وەکو بانگەواز و وانەی قورئان و تەجوید و کاری ڕێکخراوەیی و حیزبی و هتد ئافرەت بە هەموو شێوەیەك لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا -بەڵکو لە واقیعی ژیانی ڕۆژانەشدا - سنوورەکانی شەرع دەبەزێنێت و وێنە و ڤیدیۆی خۆی پۆست دەکات و جەستەی خۆی بەبەهانەی ئەوەی داپۆشراوە بۆ هەموو خەڵکی نمایش دەکات و لە گەڵ پیاواندا پێکەوە دادەنیشن و گفتوگۆ لەسەر باسە جیاجیاکان دەکەن وەکو ئەوەی کارێکی زۆر شەرعی و درووست تەماشای یەکتر دەکەن و بەتەنیشت یەکەوە دادەنیشن وەکو ئەوەی دوو مەلائیکەت بن پێکەوە نەك دو مرۆڤی لاواز کە تاوان و گوناە لە پێکهاتەو سروشتیاندا بوونی

هەیە و ئامادەیی تاوانیان تێیدا هەیە! ئایەتەکانی قورئان و سوننەت دەیان وسەدان داواکاری و ئاراستەی ڕاشکاوانە و توندی لەو بارەوە تێدایە.

لە ڕاستیدا حەرامە و ڕێگەپێدراو نییە بە هیچ شێوەیەك ئافرەت ڕەسم و ڤیدیۆی خۆی لە ڕاگەیاندن و لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا پۆست بکات ئەوە جگە لە حەرامی سەر لەچەندین ناشەرعی و هەڵەی ترەوە دەردەکات وکورد واتەنی شەیتان نەخەوتووە.

ئەمڕۆ زۆرێك لە کچان وئافرەتە بەناو مولتەزیمەکان لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکرێت و خۆیشیان لە یوتیوب و فەیسبوك و تۆڕەکانی تردا موحازەرە و وانەی خۆیان بە وێنەو بە ڤیدیۆ وەرکەوتنێکی سەرنج ڕاکێشەوە بڵاو دەکەنەوە،

لەوانەش خراپتر ئەو ئافرەتانەن کە بەردەوام خۆیان جوان دەکەنەوە و لە تەلەفزیۆنە بەناو ئیسلامییەکاندا وەکو بێژەر و خوێنەری هەواڵ وپێشکەشکاری بەرنامەی جۆراوجۆر دەردەکەون، ئەوانە جگە لەوەی فیتەرەتیان تێك چووە و بەردەوام لەتاواندان، پێشەنگ و نموونەیەکی زۆر خراپیشن بۆ زۆرێك لەو کچ و ئافرەتانەی کە شوێن پێی ئەوان هەڵدەگرن وبەبەهانەی خزمەت کردن لە ڕاگەیاندنی ئیسلامیدا ناشیرینترین وینە بۆ ئافرەتی موسوڵمان پێشکەش دەکەن،

دڵنیاشیان دەکەمەوە ئەوانەی کە فەتوای ئەو کارەیان بۆیان داوە لە ئەوپەڕی دین لاوازی و سەرپێچی کردنی شەریعەتدان ئەگەر هەرکێ بن و هەر ناوو نازناوێکی زانستیان هەبێت، چونکە مەسەلەکە هەمووی تەنها خەڵك راکێشانە و هەوڵێکە بۆ مسۆگەر کردنی دەنگ بۆ کاتی هەڵبژاردن و زۆرکردنی ئەندام لەسەر حیسابی بەزاندنی سنوورەکانی شەرعی ئیسلام، ئەم قسەش بەداخەوە لەسەر زۆرێك لە وڵاتانی عەرەب و موسوڵمانانداندا جێبەجی دەبێت هەموویشی بە هۆی ئەو موفتییە مۆدێرنانەیە کە بە زاری خۆن دەڵێن ئێمە دەمانەوێت دین ئاسان بکەین و سنوورەکانی حەرام تەسك بکەینەوە و خەڵکی بۆ خۆمان ڕابکێشین. دین بە تێکدان و شێواندنی دین چۆن ئاسان دەبێت!؟

دیاردەیکی تریش کە بەم دواییە سنوورەکانی شەرم و شەرعیشی تێدا بەزێندراوە، بەداخەوە سەنتەرەکانی لەبەر کردنی قورئان و فێربوونی تەجوید وپێشبڕکێی قورئانە، تێکەڵی تێدا درووست دەبێت و هەندێ جار بەتایبەتی لەو سەنتەرانەی کە تێگەیشتنی هاوچەرخانە و مۆدێرنیان بۆ ئیسلام هەیە، مامۆستا ئافرەتەکان لەگەڵ مامۆستا پیاوەکاندا دانیشن و پێکەوە داوەری دەکەن و لەسەر بابەتەکان لەگەڵ پیاوانی نامەحرەمدا

قسەو باس و گفتوگۆ و شەن و کەوی مەسەلەکان دەکەن، هەموو ئەوانە حەرامە ولە قوتابخانەو وسەنتەرەکانی قورئان و زانستە شەرعییەکاندا، درووست نییە بۆ فێربوونی تەجوید و وەرگرتنی وانەی شەرعی تێکەڵی و بەرکەوتن لە نێوان پیاوان و ژناندا هەبێت و مامۆستای پیاو درووست نییە ڕووبەڕوو وانەی شەرعی بە ئافرەتان بڵێتەوە و ئەوەی فەتوای گەورەترین زانایانی سەردەمی لەسەرە.

ئەم سەردەمەی خۆمان بە هەمو واتایەك سەردەمی فیتنەو لە خشتەچوونە و ڕێگاکانی لە خشتەچوونیش لە ڕاگەیاندن وتۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە و وەکو ئاوو هەوا بەردەستە و بەخۆڕاوی دەگەیەنرێتەماڵەکانمان، واجبە لەسەر ئافرەت هەست بەبەرپرسیارێتی بکات و شەرم بکاتە دروشمی ژیان و ڕێگەی بەختەوەری دونیا و دوا ڕۆژی، بە هیچ شیوەیەکیش ئاوڕ لەو بەناو زانا و امامۆستا و بانگخوازانە نەداتەوە کە دەیانەویت دینێکی شل و شێواو بۆ خەڵکی پێشکەش بکەن و ئەوانیش هاوشێوە عەلمانییەکان ئافرەت بکەنە ئامرازیك بۆ بانگ کردنی خەلکی بۆ ئیش و کارەکانیان کە ئەوەندەی بەڕواڵەت و بەدروشم ئیسلامییە بەناوەڕۆك و جەوهەر و ئاکار بەو شێوە نییە!

چارەسەی شەرعیش بۆ ئەو حاڵەتانەی سەرەوە کە باسمان کرد ئەوەیە ژنان و پیاوان چی خویندکار بن، یان خوێێدکار ومامۆستا بن، بەجیا و لە جێگەو کاتی جیاوازدا ئەو زانستانە بخوێنن. لە ڕاستیدا تەشەنەکردنی بێ شەرمی و کرداری حەرام لەناو خەڵکیدا وکۆك بوونیان لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە حەڵاڵ ناکات

و مەعنای ئەوە نییە ئیتر ئەو کارە درووستە، ئەگەر هەزار فەتواشی بۆ درابێت، چونکە هیچ کاتێك موفتی بۆی نییە حەرام حەڵاڵ بکات، ئەگەریش بەهەر بەهانەیەك بتوانیت خۆت بخەڵەتێنیت، ئەوا هەرگیز ئەو کارەت لەگەڵ الله تعالى دا پێ ناکرێت، چونکە حوکمەکانی قورئان و سوننەت ڕوون و ئاشکران سەبارەت بە سنورەکانی پەیوەندی لە نێوان ئافرەتان و پیاوانی نامەحرەمدا. بۆیە تەقوای الله عزوجل ت هەبێت و گوێ لەوانە مەگرە کە فەتوای شکاندنی سنوورەکانی شەرمت بۆ دەدەن وەکو ئەوەی دین وشەریعەت ماڵی باوکیان بێت هەر ڕۆژەی لە بەشێکی دادەبەزن و لە حوکمێکیدا گۆڕانکاری دەکەن و ماوەی جارێك حەرامێك دەکەنە حەڵاڵ ودینیان کردووەتە ئامرازێك بۆ ڕاکێشان و ڕازیکردنی خەڵکی لەسەر حیسابی تورە کردنی پەروەردگاریان.

بەر لەوەی دڵەکانتان بە هۆی بێ شەرمی و تاوانەوە بمرێت، پرسیاری لێ بکەن، دڵ هەندێك جار لە هەموو مامۆستا و زانایەك شارەزاترە وباشتر دەتوانێت پێت بڵێت ئەو کارەت حەرام و ناشیرینە و مەیکە.

بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە حوکمەکانی شەرم لە ڕووی شەرعییەوە بڕوانە:

فقه الحياء/ محمد اسماعيل المقدم.

کە لە بەشێك لە سەرەتاکانی ئەم پۆستەدا سودم لێی بینیوە.

# پەیامی حەوتەم:
# منداڵەکەت لەسەر عەقیدەی پاك پەروەردە بکە

١- دایك ڕۆڵێکی گەورەی لە پەروەردەکردنی منداڵدا هەیە، لەو کاتەی کە سکی ماڵ و مەئوای یەکەمی ئەو کۆرپەلەیە، تاکو لە دایکبوون وقۆناغەکانی شیرپێدان و گەورەبونی، دایك هەمیشە لە بەر ئەوەی سەرچاوەی سۆز و خۆشەویستییە بۆ منداڵەکەی، هاوکات کاریگەری زۆریشی لە پەروەردەکردنیدا هەیە.

٢- لە ڕاستیدا چاکبوونی منداڵ پەیوەستە بە چاکی باوکان و دایکانەوە، بۆیە ئەگەر بیانەویت منداڵەکانیان چاکەکار و ڕەوشت جوان و عەقیدە پاك بن، پێویستە سەرەتا خۆیان بەو شێوە بن بۆ ئەوەی ئەوانیش وا دەربچن، الله عزوجل فەرمویەتی: ﴿وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا﴾[1]. ئەم ئایەتە زۆرێکمان دەیخوێنینەوە، لەوانەیە بیر لەو واتا ترسناك و مەزنەی نەکەینەوە کە وریاییمان پێ دەدا لە هەستکردن بە بەرپرسیارێتی بەرانبەر منداڵەکانمان لە پاش مردنمان و بەجێهێلانی ئەم دونیا. هەندێ لە پیاوچاکانی سەلەف دەیانفەرموو ئێمە نوێژ و عیبادەتەکانمان زیاد دەکەین لە پێناو ئەوەی مناڵەکانمان چاك دەربچن.

---

[1] - النساء:٩.

٣- لە ڕاستیدا بۆ ئەوەی منداڵەکەت لەسەر ڕێبازو عەقیدەیەکی چاك بێت، پێویستە لەکاتی هەڵبژاردنی هاوسەری چاك و پاکەوە کاری بۆ بکرێت، هەر لەو کاتەی کە بەناوهێنانی الله ئەو دوو هاوسەرە بەیەکدەگەن ودوای ئەوە دەپاڕێنەوەو دوعا دەکەن لە الله نەوەی باش و پاکیان پێ ببەخشێت وناخی دلەوە دەڵێن: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾. باوکان و دایکان نابێت هەر خەریکی شێوازە سەردەمیەکانی پەروەردە بن و ئەو ئەو سەرچاوە مەزنە لە دوعا و لە پەروەردەی ئیسلامی فەرامۆش بکەن. دایك لەو کاتەی کە دوو گیانەو قورئان دەخوێنێت کۆرپەڵەکەی لە سکیدا گوێ بۆ ئەو قورئان خوێندنە دەگرێت و کاریگەری لەسەری دەبێت، بەڵکو توێژینەوە لەم بارەوە هەیە شتی زۆر لەوە زیاتریش باس دەکەن.

٤- کە منداڵەکەشت لە دایکبوو پێش هەموو شتێك پەنا بگرە الله لە خراپەی شەیتان بیپارێزیت، پێشەوا بوخاری لە سەحیحەکەیدا ئەم فەرموودە دەگێڕێتەوە: (ما مِن بَنِي آدَمَ مَوْلُودٌ إلَّا يَمَسُّهُ الشَّيْطَانُ حِينَ يُولَدُ، فَيَسْتَهِلُّ صَارِخًا مِن مَسِّ الشَّيْطَانِ، غيرَ مَرْيَمَ وابْنِهَا)[١] هەموو منداڵێك جگە لە مەریەم و عیسای کوری علیهما السلام، کە لەدایك دەبێت شەیتان دەستی پێدەگەیەنیت بۆیە دەست بەگریان دەکات.

[١] - (البخاري: ٣٤٣١)

٥- ئینجا دوای لە دایکبوونی و بە تایبەتی لە دوو سالی یەکەمدا، چونکە لەو قۆناغەدا منداڵ بە وردی چاودێری هەموو جولە و قسە و هەنگاوێکی دایکی دەکات و لە عەقڵ و لەناخیدا کاریگەری بۆ داهاتووی بەجێدەهێڵێت. بۆیە قورئان خوێندن و پابەند بوونت بە زیکرەکانی ئێواران و بەیانیان دڵنیابە سوودێکی زۆری بۆ داهاتووی منداڵەکەت دەبێت، زۆریش گرنگە ناو بەناو نزای چاکەت بۆی لەبیرنەچێت چونکە دوعا چەکی ئیماندارە.

٦- کارێکی بەسوود و مەزنە، هەوڵ بدەیت منداڵەکەت یەکەمین وشەکانی ژیانی کە ئەگەر بەناتەواویش بێت، وشەی لاإله إلاالله، یان الله بێت، پێشینانی چاکی ئەم ئوممەتە پێیان خۆش بوو منداڵەکانیان سەرەتای قسەکردنیان بە لاإله إلاالله بێت.

پێشەوا ابن قیم الجوزیة لە کتێبی (تحفة المودود بأحكام المولود ٢٣١) فەرموویەتی: با سەرەتای قسەکردنیان لاإله إلاالله محمد رسول الله بێت و یەکەمین ئەو وشانەی کە بچێتە گوێیاندا ناسینی الله وتەوحیدەکەی بێت و پێیان بوترێت الله لەسەر عەرشی خۆیتی دەمانبینێت و گوێی لە قسەکانمان هەیە.

٧- له دوای ئەو قۆناغەش هەر دەبێت لەگەڵیدا بیت و پەروەردی ئیمانی بکەیت، دەبێت لەبەردەمیاندا دوعای خێریان بۆ بکەیت، دایك و باوکی باش پێویستە هەمو هەلێك بۆ دوعا کردن بۆ منداڵەکانیان بۆزنەوە: کە شتێکت بەدەستەوە دەدات پێی بڵێیت الله لێت ڕازی بێت. الله بتپارێزیت ئەو دەرگا دابخه. نوێژەکەت لەبیر نەکەیت الله بتکات به خزمەتکاری دینەکەی. دەگێڕنەوە و ئەمە بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەیە، ئافرەتێ: حەوت منداڵی بوو هەموویان قوئانیان لەبەر کرد، لێیان پرسی چۆن توانیت یارمەتیدەریان بیت بۆ ئەو کارە گەورەیە؟ وتی: هەموو جارێك یەکێکیان کارێکی باشی بکردایە بە شێوەیەك دوعام دەکرد کە خۆی ببیبیسێت ودەموت: بارك الله فيك یاڕەبی ببیته حافیزی قورئان، دەموت بەڵکو دوعاکانم لە کاتێکی وەرگیرانی نزاوپارانەوەدا وەربگیرێن والحمد لله وەرگیران.

٨- هەروەها پێویستە باسی گرنگی دوعاکردنیان بۆ بکەیت ولەوە حاڵییان بکەیت کە دوعا لەوانەیە یەکسەر و لەوانەیە لە کاتی گونجاودا وەربگیرێت، فێرییش بکرێن دوعا بۆ باوك ودایکیان بکەن. یەکیکیش لەو کارە گرنگانەی بۆ منداڵەکەتی بکەیت ئەوەیە هەستی چاودێریکردنی الله و باوەر بوون بە قەدەر لە ناخ و دڵیدا بچێنیت بۆ ئەوەی خۆشەویستی پەروەردگاری هەر لەو تەمەنەوە پێش ئەوەی بگاتە شەش ساڵان لەلا درووست بێت. دەتوانیت وەکو هەندی لە شارەزایانی پەروەردە دەڵێن بە هەندی ڕێنمایی و هەنگاوی گونجاو بۆ ئەو تەمەنەی ئەوان ئەو ئامانجە بپێکیت، لەوانە:

- لە الله شەرم بکە و خۆت داپۆشە.

- بە منداڵەکەت بڵێی وەرە با نوێژ بکەین و الله بمانبینێت و بەهەشتی بەرینمان پی ببەخشێت.

- دەتوانیت هەندی ئایەتی وەکو: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بە ئاسانی و بە ڕونی بۆ باس بکەیت.

- هەندی جار پێویستە بە هاندان و ترسان پەروەردەی بکەیت، بۆ نموونە پێی بڵێیت الله ڕاستگۆیی پێ خۆشە و درۆکردنی پێ ناخۆشە.

- ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی الله بکات و قەدەغەکراوەکانی نەبەزێنێت دەچیتە بەهەشت و لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێت.

٩- چاندنی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ لە دڵی منداڵەکەتدا کارێکی گەلێك پڕ بایەخ و کاریگەری لە سەر داهاتوو ودواڕۆژی، بە پێی تەمەنی پێویستە هەڵ بقۆزیتەوە بۆ خۆشەویست کردنی رسول الله لەلای منداڵەکەت، بۆ نموونە لە کاتی نان خواردندا فەرموودەی: (يا غُلَامُ، سَمِّ اللَّهَ، وكُلْ بيَمِينِكَ، وكُلْ ممَّا يَلِيكَ)ی بۆ باس بکەیت.

١٠- دڵنیابە ئەگەر منداڵەکەت لە سەرەتای تەمەنیدا لەسەر تەوحید فێر بکرێت و رابێت لەسەریشی دەمرێت و دونیا و دواڕۆژی پڕ بەرەکەت دەبێت. پێغەمبەران علیهم السلام لە کاتی سەرەمەرگدا وەسیتیان بۆ مناڵەکانیان دەکرد کە لەسەر پەیمانی تەوحید بمێننەوە: ﴿وَوَصَّىٰ بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[1].

﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[2]

١١- بە وردبوونەوەش لە پەروەردەی پێشینانی چاکی ئەم ئومەتە بۆ منداڵەکانیان بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوان گرنگیان بە دامەزراندنی ئیمان زۆر داوە و خستوویانەتە پێش پێ لەبەرکردنی قورئانیش، واتە تەوحیدیان خستووەتە پێش تەجوید، چونکە ئەگەر سەرەتا واتاکانی ئیمان و تەوحیدت لە ناخ و دەروونیدا چاند ئیتر لەبەر کردنی قورئان جێگای خۆی دەگرێت و ڕۆڵی چاوەروان کراوی خۆی لەلای دەبینێت.

---

(١) - البقرة:١٣٢

(٢) - لقمان:١٣.

١٢- لەبەرکردنی قورئانیش لە دوای تەمەنی دوو ساڵییەوە لە سوڕەتێکی کورتی وەکو ﴿قل هوالله حد﴾ و﴿قل أعوذ برب الفلق﴾ و﴿قل أعوذ برب الناس﴾ مەسەلەیەکی گەلێك گرنگە، سەلەفی چاکی ئەم ئومەتە لە تەمەنی منداڵیدا قورئانیان بە منداڵەکانیان لەبەر دەکرد، شافیعی بەڕەحمەت بێت دەڵێت لە حەوت ساڵیدا قورئانم لەبەر کرد و لە دە ساڵیدا موطأی پێشەوا مالکم لەبەر کرد.

١٣- فێرکردنی نوێژیش بۆ منداڵ لە تەمەنێکی کەمدا کاریگەری باشی لەسەر دواڕۆژی هەیە و تاماوە وابەستە نوێژ دەبیت و دڵی پیوە دەبەسترێتەوە، محمد بن سیرین دەڵێت: ئەگەر منداڵ راست و چەپی خۆی لەیەکتر جیاکردەوە ئیتر فێری نوێژ بکرێت باشە. ڕۆژیش بەهەمان شێوە لەو کاتەوە کە دەتوانێت و وردە.

١٤- گەورەترین چاکە لەگەڵ منداڵەکەتدا بیکەیت و لە دواڕۆژیدا ڕەنگ بداتەوە و بۆ دونیا و قیامەتی خۆیشت باش بێت ئەوەیە منداڵەکەت بخەیتە سەر ڕێگای فێربوونی عیلمی شەرعی و بەتایبەتی زانستی عەقیدە هەر لە بابەتە سەرەکی و سەرەتاکانی وەکو توحید الربوبية و توحيد الألوهية و الأسماء والصفات وباوەر بە هەموو پایەکانی تری ئیمان وبنەماکانی تری بیروباوەڕ کە سەلەف باسیان کردووە و خۆ بەدەستدانی تەواو بۆ حوکم و فەرمانەکانی الله تعالى، لە دوای عەقیدەش زانستەکانی فەرموودە و الفقه و التفسير و ئادابەکان و سیرەو زمانی عەرەبی کە ڕۆڵی کلیل دەبینیت بۆ کردنەوەی دەرگای زانستە شەرعییەکان بە شێوەیەکی گشتی.

١٥- لەم سەردەمەی خۆماندا کە سەردەمی عەولەمەو فیتنە ونامۆبوونی ئیسلامە بە هۆی ئەو هەموو دژایەتییە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیەی کە دەکرێت، منداڵ کە گەیشتە تەمەنی چوون بۆ قوتابخانە، نابێت پشتگوی بخرێت و پێویستی بە بەدواداچوون و بایەخ پیدان زیاترە، ئەگینا لەدەستت دەردەچێت، شارەزایان دەڵێن لەو تەمەنانەدا پیویستە باوکان و دایکان کاتی گونجاو هەڵبژێرن بۆ گەیاندنی هەندی سوودی بیروباوەڕ کە دواڕۆژ لە کەسایەتیدا ڕەنگ دەداتەوە، وەکو کاتی گەشت وگوزار و کاتی نەخۆشی کە لەو کاتەدا دەروونی ئامادەترە بۆ وەرگرتنی قسەی باش و هەروەها فێرکردنی منداڵ ڕێگای زۆرە بە پیی حاڵەتەکان جیاوازی هەیە، وەکو فێرکردن لە ڕێگەی گفتوگۆ و چیرۆك و هاندان ویلە بەپلە و بە دووبارە کردنەوەی زانیاری و هەروەها فێرکردن لە ڕێگەی ئەوەی خۆت یان کەسیکی تر بە شێوەیەکی کردەیی ببیتە پێەنگ بۆی و شتی لێ فێر ببێت.

١٦- لەو تەمەنە هەستیارەی مناڵەکەتدا مەهێڵە تێکەڵی مناڵی خراپ و خەڵکی خراپ بکات چونکە ئەوە هەمووی کاریگەری خراپی لەسەر کەسایەتی دەبێت لە دواڕۆژدا، تەنانەت بۆ فێربونی قورئان و وانەی شەرعی مەیخەرە لای کەسێك موبتەدیع بیت و عەقیدەی خراپ بیت، چونکە پیی کاریگەر دەبێت و کە گەورە بوو لەوانەیە کەسیکی وەکو ئەوی لێ دەربچێت. بەڵکو دەبێت هەوڵ بدەیت لەگەڵ کەسانی باش و شوینکەوتووی سوننەت و عەقیدە پاکدا تێکەڵ ببێت بۆ ئەوەی لێیانەوە فێر ببێت و پێیان کاریگەر بێت.

١٧- تصور ناکەیت ئەگەر زیکرێکی وەکو (أعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وعقابه وشر عباده ومن همزات الشياطين وأن يحضرون) یان هەر زیکرێکی تری پی لەبەر بکەیت بۆی هەیە چەند کاریگەری باشی هەبێت لە دواڕۆژیدا، بۆیە هیچ شتێك لەو بارەوە بەکەم مەزانە، بەڵام هەمیشە وردبەرەوە ئەوەی فێری دەکەیت صحیح بێت و بیدعە نەبێت.

١٨- دوای ئەوەی دەچێتە قوتابخانە و ئیتر ئاستی تیگەیشتنی باشتر دەبیت کۆمەڵە کتێبێك هەیە لە بواری عەقیدەدا نووسراوە تایبەت بۆ منداڵان ئەگرە بە منداڵ بوترێت لەلایەن کەسیکی ترەوە وەکو دایك و باوك و مامۆستای تر سوودی زۆر دەبێت، لەوانە ئەو نامیلکەی بەندە نووسیومە بەناونیشانی:
- (فێرکردنی تەوحید بۆ منداڵان) کە زۆرێکیم لە کتێبەکانی ئەهلی عیلم و تایبەتمەند بەو بوارەوە وەرگرتووە لەوانە:
- تعليم الصبيان التوحيد، محمد بن عبدالوهاب.
- التوحيد للناشئة والمبتدئين. د. عبدالعزيز آل عبداللطيف.
- أسئلة وأجوبة للصغار ولا يستغني عنها الكبار، سالم الطويل.

١٩- ئەگەر بتوانیت هەندێ کتێبی بە سوودت لابێت بۆ خۆت بیخوینیتەوە و بۆ ئەوانی باس بکەیت زۆر کارێکی بەرهەمدار و بەسوود دەبێت لەوانە:

- الأصول الثلاثة لە عەقیدەدا بە شیوەیەکی ئاسان بۆ منداڵەکەتی باس بکەیت.

- مەتنێکی کورت وپوخت لە فیقهدا وەکو مەتنی (الأخضري) یان هەر مەتنیکی تری کورت و ڕوون.

- مەتنێکی ئاسان لە سیرەدا وەکو هۆنراوەی الشيخ عبد العزيز اللمطي المغربي، یان کتێبی الرحيق المختوم.

- کتێبی صور من حياة الصحابة، وصور من حياة التابعين ی عبدالرحمن الباشا.

بۆ سوودی زیاتر بروانە: رفقا بعقيدتي يا أمي، کە کتێبێکی باشە و بە شیکراوەیی بۆ ئەم مەبەستە نووسراوەو سوودم لێ وەرگرتووە.

## پەیامی هەشتەم: بیرکردنەوە لە مردن هۆکاری بەختەوەرییە!

بیرکردنەوە لە مردن، فەرمانی پێغەمبەرە ﷺ: (أكثروا ذكر هاذم اللذات يعني الموت)[1] واتە: مردنتان با لەبیر بێت، بۆ ئەوەی توێشووی پێویستی بۆ ئامادە بکەن، چونکە مردن چێژو خۆشییەکانی ئەم دونیا دەبرێت و کۆتایی پێ دەهێنێت.

بەڵام جێگای دڵخۆشییە کە مردن ئەگەرچی خۆشییەکانی ئەم دونیا تێکدەدات و لەناوی دەبات، بەڵام بۆ کەسی ئیماندار لە چێژو لەزەت و خۆشییەکی ترەوە نزیکی دەکاتەوە و لە قەبرەکەیدا حاڵی باش دەبێت و بەهەشتی بەرینیش چاوەڕوانی دەکات.

هۆکار وحیکمەتی ئەو فەرمانەش ئەوەیە، کە بیرت لای مردن بوو، خۆتی بۆ ئامادە دەکەیت و بەخۆتدا دەچیتەوەو نوێژەکانت بە جوانی دەکەیت و بەعیبادەتەکانی تر هەڵدەسیت و دڵت ئاسوودە دەبێت و لە تاوانەکان دوور دەکەویتەوە، کە بیریشت لە مردن بڕی تووشی غەفلەت ئەبیت و ئیتر ڕاستیەکان وەکو خۆی نابینیت.

---

[1] - الترمذي (٢٣٠٧)، والنسائي (١١٨٢٤)، صحيح الترغيب (٣٣٣٣).

دەڵێن ئەگەر مرۆڤ ئیماندار بێت، ئیتر لە گەڵ مردن ئاشتەواوی دەکات و چیتر لێی ناترسێت، بەڵکو لەوانەیە نیشانەی باوەڕی بەهێز بە الله ئەوە بێت کە ئەو کەسە لە مردن نەترسیت، چونکە زیاتر ستەمکار و خراپەکار و خەڵکی لاڕێ دەبێت زیارت لە مردن بترسن.

بیرکردنەوە لە مردن دەتکاتە خاوەن کەسایەتییەکی جێگیر و واقیعی و پێویستت بەوە نابێت خۆت بخەڵەتێنیت و تووشی نەخۆشی دەروونی نابیت. بیرکردنەوە لە مردن وات لێدەکات بەخۆتدا ابچیتەوە و بە گەنجی و بە بارودۆخی باشی خۆت فریو نەخۆیت، چونکە کەسی عاقڵ دەزانێت مردن تیرێکە و لە کەوانەکەی دەرچووە، تەنها ئەوەی ماوە پێمان بگات و مەسەلەکە مەسەلەی کاتە. جا کە تۆ بزانیت فەرمانی مردنت بە یەقین بۆ دەرچووە و تەنها جێبەجێکردنەکەی ماوە و هیچ کەسێکیش لە جێبەجێ کرنی ئەو حوکمە ڕزگاربوونی نییە، ئیتر بۆچی ئەوە نەکەیتە هۆکارێك بۆ بەختەوەری خۆت و هەم بەو قەدەرە ڕازی بیت و هەم بیکەیتە هۆکاری ئامادەسازی بۆ پێویستییەکانی؟
بیرکردنەوە لە مردن هاندەرە بۆ موسوڵمان بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری و تەوبە بکات و فەرمانی الله تعالى جێبەجێ بکات کە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا﴾ (١)

(١) - التحريم:٨.

لەم جیهانە جەنجاڵەی ئەمڕۆی خۆماندا کە تێیکەوتووین، دڵنیابە بیرکردنەوە لە مردن ئەگەر چی بۆ پیاوانیش پێویستە، بەڵام بۆ ئافرەتان زیاتر پێویستە، چونکە هۆکارەکانی فیتنە و لە خشتەچوون بۆ ئافرەت لە هەموو لایەکەوە ئاسان کراوە و ڕاگەیاندنی جیهانیی و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان ڕۆڵی شەیتان دەبینن لە تێکدانی دیدوبۆچوون و ئاکار و شێواندنی فیترەت و دوورخستنەوەی لەو سروشتەی کە الله تعالى ئافرەتانی لەسەری دروست کردووە.

لە ڕاستیدا لە دوای ڕاست و درووستی عەقیدەو هەبوونی تەوحید و ئیمانێکی پتەو بۆ پاراستنی دین و کەسایەتی ئافرەت لەم ڕۆژگارەدا، ئافرەت لە پێناو ئەوەی لێشاوی فیتنە و نەفامیی هاوچەرخ ڕاینەماڵێت پێویستی بەوەیە بەردەوام بیری لای مردن بێت و وەسێتی خۆی نووسیبێت و وەکو ڕێبوارێك لەم دونیایەدا ڕەفتار بکات، چونکە نیشتمانی ڕاستەقینەی ئەوو هەموو مرۆڤەکان، ئەم دونیا فریودەرە نییە، بەلکو الله تعالى ئەوەو هەموو موسوڵمانێکی موەحیدی بۆ بەهەشت درووست کردووە و ئەوە جێگای نیشتەجێ بوون و مەسکەنی ڕاستەقینەیەتی، بۆیە نابێت هیچ بیانوو و هۆکارێك مردنی لەبیر بباتەوە، ڕەحمەتی الله لە ابن قيم الجوزية بێت کە فەرموویەتی:

فَحَيَّ عَلَى جَنَّاتِ عَدْنٍ فَإِنَّها ... مَنازِلنا الأُوْلَى وَ فِيها المُخَيَّمُ
وَ لَكِنَّنا سَبْيُ العَدُوِّ فَهَلْ تَرَى ... نَعُودُ إِلَى أَوْطَانِنَا وَ نَسْلَمُ ؟
فإنْ كُنتَ لا تدري فتلكَ مُصيبةٌ *** وإنْ كُنتَ تَدري فالمصيبةُ أعْظَمُ

بۆیە دڵنیایە، ئەگەر لە زۆربەی وێستگەکانی ژیانتدا، یادی مردن فەرامۆش نەکەیت، ڕێگای ڕاستت لێ ون نابێت و ئەو یادکردنەوە وەکو چرایەك دەبێت بۆت، بەرچاوت ڕوون دەکاتەوە لەوەی بکەویتە نێو هەڵدێری فیتنە جۆراوجۆرەکانی ئەم دونیایە، کە لە وێنەی تەڵەیەکدا دەتگرێت، لەو بەختەوەرییەش کە یادی مردن بۆت دەستەبەر دەکات بێ بەش دەبیت.



## پەیامی نۆ:

## (قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) بکە بە دروشمی ژیانت!

پێوەرێکت پێ دەڵێم ئەگەر بەردەوام کاری پێ بکەیت، هەرگیز تووشی لادان و لە خشتەچوون وگومڕایی نابێت، ئەویش ئەوەیە: بۆ هەموو پرسێك کە لەم دونیایەدا دێتە ڕێت، خۆت ڕابهێنە لەگەڵ ئەوەی بەبێ زانینی بەڵگەی شەرعی ئەنجامی نەدەیت، هیچ هەنگاوێك مەنێ، هیچ گۆڕانکارییەك ئەنجام مەدە، بۆ هیچ مەسەلەیەك بە قسەی هیچ کەسێك مەکە تاکو بەڵگەکەی نەزانیت.

ئەگەر داوای ئەنجامدانی کارێکت لێ کرا، با بەڕواڵەت خێر وباشیش بێت، هەر داوای بەڵگەکەی بکە، ئەگەر توانیت بۆ سەرخورانیش -وەکو هەندێ لەسەلەف فەرموویانە- سەرت مەخورێنە تاکو بەڵگەی ڕاست و درووستی ئەو کارە نەزانیت.

خۆ ئەگەر وەکو گومانیش نەبێت، وەکو دڵنیابوون و زیاد بوونی زانست هەر پێویستە.

مەچۆ ژێر کاریگەری هیچ کەسێکەوە وخۆت بدەیت بە دەستییەوە، مەڵێ ئەو خۆی شارەزایە و بەتەقوایە و بێ بەڵگە ئیش ناکات، ئەوە هەڵەیەکی مەنهەجییە و لەوانەیە باجەکەی بدەیت و قورس لەسەرت بکەوێت.

چونکە ئەو کەسەی تۆ وا تەماشای دەکەیت مرۆڤەو مەلائیکەت نییە و مەرج نییە بەو شیوە بیت کە تۆ گومان دەبەیت! زیندووەکان متمانەیان لەسەر نییە تا لەسەر ڕێای ڕاست و تەوحید و ئیمان دونیا بەجێ نەهێڵن، زیندووەکان هەمیشە ئەگەری تووش بوونیان بە فیتنە و لەخشتەچوون هەیە.

هەرچیت کرد، یان داوات لێ کرا بیکەیت، بە پێوەری تەوحید و عەقیدە بیپێوە و بە تەرازووی کیتاب و سونەت بیکێشە، ئەگەر لێی دەرنەچوو، هەرگیز مەیکە و لێی بەری بە، ئەگەر ئەو کەسەی داوای ئەنجامدانی کردووە لێت، بە ئاسماندا هەڵفڕێت و بەسەر ئاودا بڕوات! پێوەری ڕاست و درووستی هەموو کارێك تێنەگیرانێتی لە گەڵ عەقیدە و بنەماکانی کیتاب و سونەتدا. ئەمە بکە نەخشەڕێگا بۆ خۆت.

**بە کورتی:** پێویستە هەمو موسوڵمانێك ئایەتی: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[1] بە شێوەیەکی کردەیی بکاتە پێشەنگ و دروشم بۆ خۆی، بۆ ئەوەی بۆی ببێتە مەشخەڵی ڕێگا، تاریکییەکانی ئەم ژیانەی بۆ ڕوناك بکاتەوە و بیکاتە قەڵغانێك بۆ خۆی، لە فیتنەی شەهەوات و شوبوهات بیپارێزیت و بۆ ئەوەش کە نەکرێتە ئامرازێك بۆ ئەنجامدانی کاری هەڵە و ناشەرعی و بیدعە و لادان لە ڕێبازی ڕاست و درووستی وەرگیراو لەلای الله عزوجل.

---

(1) - البقرة:١١١.

هەڵەیەکی گەورەیە و کاریگەری خراپی لەسەرت دەبێت، متمانەی ڕەها بە هیچ کەس و کەسایەتی و لایەنێك بکەیت و بەبێ داواکردنی بەڵگەی شەرعی چاوبنوقێنیت و گوێڕایەڵی بکەیت، کە الله تعالی چاوی پێ بەخشیوی وەکو نابینا مامەڵە مەکە، کە توانای تێگەیشتن و گەڕانت بە دوای بەڵگەی کارێکدا هەیە، خۆت مەدە بە دەستی کەسێکی ترەوە لە جیاتی تۆ بیربکاتەوە و حوکم لەسەر ئەو ئەو پرسانە بدات کە تۆ ئەنجامی ئەدەیت. ئەگەر کردت داوای بەڵگەی لێبکە، ئەگەر ئەو کەسە (كائنا من كان) بێت.

بەڵام بۆ ئەوەی بتوانیت لە بەڵگەکان تێبگەیت و شیاویی ئەوەت تێدا بێت بڵێیت (هاتوا برهانكم) کوا بەڵگە! پێویستت بە هەندێ زانستی سەرەتایی هەنوکەیی هەیە، لەوانە:

١- پێویستە سەرەتا لە پەیامی قورئان تێبگەیت و ئەرك و ڕۆڵت لەگەڵ قورئاندا تەنها خویندنەوەی بی تێڕامان نەبێت و لەوەی کە دەیخوێنیت حاڵی بیت و بیری لێ بکەیتەوە، ئەگینا ناتوانێت بەڵگەی حەق و ناحەق لەیەکتر جیا بکەیتەوە.

٢- پێویستە سنوورەکانی عەقیدە لە قورئاندا بزانیت: تەوحیدەکانی (الربوبية و الألوهية و الأسماء و الصفات) بناسیت، لە هەموو جۆرەکانی شیرك و بیدعە بکۆڵیتەوە و بیانناسیت، ئەگینا چۆن خۆتی لێ دەپارێزیت.

٣- هەروەها لەوە تێبگەیت کە شەرعدانان تەنها مافی پەروەردگارە و لەوەش حاڵی ببیت کە تۆ ئازاد نیت کێت خۆشبوێت و ڕقت لە کێ بێت بەپێی ویست و حەزو میزاجی خۆت، چونکە قورئان و سوننەت بە ڕوونی ئەو سنوورانەی دیاری کردووە و جیایانی کردووەتەوە.

٤ - پێویستە  بە ڕوونی و بەپوختی  چەمك و واتای لاإله إلاالله و مەرجەکانی ڕاست و درووستی و شایەتمان و هەڵوەشێنەرەوەکانی بزانیت. ئەگەرنا مەترسی ئەوەت لەسەرە بکەویتە ناو یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکان و بەخۆیشت نەزانیت.

٥- هەندێك زاراوەی تایبەت بە بیروباوەڕ هەیە، زۆر گرنگە پێناسەکانی بزانیت، چونکە لەم ڕۆژگارەی خۆماندا بەڕوونی و بەبەڵگەی زانستییەوە شارەزایان نەبیت، بۆی هەیە سنووریان ببەزێنێت، لەوانە، زاراوەی: النفاق، الضلال، الجاهلية، الفسق، الردة، الشرك، الكفر، الحكم بغير ما أنزل الله، الولاء و البراء،

٦ - پێویستە بە شێوەیەکی زانستی و بەبەڵگەوە لەوە تێبگەیت کە کەس نییە لە غەیب و داهاتوو و چارەنووسی بەندەکان بزانێت جگە لە الله کە خۆی درووستیانی کردووە، بەوەش لە جۆرەکانی لادانی عەقیدی ڕزگارت دەبێت گومانت لەوە نامێنیت باوەر بوون بە بورجەکان و خوێندنەوەی فنجان و ڕۆیشتنە لای فاڵگرەوەو ساحیر و زۆر شتی تر، ئەگەر لە بازنەی ئیسلامیش دەرت نەکات، هیچ نەبێت کردەوەکانت پوچەڵ دەکاتەوە.

٧- پێویستە بزانیت و کاریش بە زانینەکەت بکەیت، کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتنی وشەریعەتی پەروەردگارت و نکۆڵی کردن و ڕەتکردنەوەی هەموو شەرع یاسا و ڕێبازیکی تر، فەرزە لەسەرت و موسوڵمانبوونت وەکو ئەوەی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ داوایان لێ کردووی بەوەوە بەستراوە.

٨ - پێویستە بزانیت خۆشویستنی هاوەڵان و پشتگیریکردنیان بە شێکە لە عەقیدەو بیروباوەڕت و ئەوە بە دین و ئیمانی بزانیت.

٩ - هەروەها پێویستە بزانیت بیدعە لە دین و لە عیبادەتەکاندا کارەساتێکە و شێوێنەر و تێکدەری دینە و دینداری ورگیراو تەنها لەسەر بنەمای قورئان و ڕۆشنایی سونەت دەکرێت و جگە لەوە لادان و گومڕاییە و، بیدعەیەك نییە پێی بوترێت بیدعەی چاك، بەڵکو هەموو بیدعەیەك ئەگەر بەڕواڵەتیش چاك بێت هەر خراپە و گومراییە وەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی.

ئەگەر ئەمانەو چەندین زانست و زانیاری تری پێویستت نەزانی و لێی بێ ئاگابیت، دڵنیابە مەترسی لەخشتەبرانت لە ئارادایە و بە هۆی وەرنەگرتنی زانستی شەرعی پێویست، نەتتوانیوە پارێزگاری پێویست بۆ دینی خۆت دەستەبەر بکەیت.

ئەگەر لەو خاڵانەی سەرەوە کە وەکو نموونە ئاماژەم پێکرد خۆت شارەزا کرد، ئیتر بە ئاسان ناکەویتە هەڵەی عەقیدەو بیرو باوەڕەوە، چونکە زانستی شەرعی بۆت دەبێتە بنەماو بنچینەیەکی تۆکمە لەسەری ڕادەوەستیت و بەرچاوت ڕوون دەبێت.

بەڵام ئەوانەی لەسەر بنەمای متمانەکردنی بێ بەڵگە کار دەکەن و سەرەڕای هەبوونی دوچاو کە الله تعالی پێی بەخشیون هەر دەبێت کەسێك دەستیان بگرێت و ڕێگایان پێ نیشان بدات، ئەوانە پێکهاتەیان بەو شێوەیە و هەر دەبێت پاشکۆبن و دواجاریش (قل هاتوا برهانکم) بۆ ئەوان نییە، چونکە هەر بیریش لەوە ناکەنەوە داوای بەڵگەی شەرعی هیچ قسە و هەڵوێست و هەنگاو و کار و کردەوەیەك بکەن، ، چونکە لەبەر ئەوەی زانستی شەرعییان نییە؛ بەڵگەی کیتاب و سوننەت و بەڵگەی کەس و کەسایەتی و سەرکردەیەك کە لە میزاج و لە گیرفانی خۆیانەوە بەڵگە دەربهێنن، یەکسانە بەلایانەوە.

کچان و خوشکان و دایکانی بەڕێزمان! لەوانە مەبن وپەلە بکەن لە بەدەستهێنانی زانستی شەرعی، هیچ نەبێت بابەتە سەرەکی و هێڵە پانەکانی تەوحید و عەقیدە فێر ببن، بۆ ئەوەی بتوانن ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ بکەن بە دروشمی ژیانتان.

# پەیامی دە: لە واقیعی سەردەم تێبگە و لەخەیاڵدا مەژی!

وێنا کردنی حاڵی ئیسلام و موسوڵمانان لەم سەردەمەدا، بەوەی کە لە بوژانەوە و بەرەو پێشچووندایە، ئەوە زانیارییەکی زۆر ڕاست نییە و هەمان ئەو کەسانەی کە ئەو دۆخەیان درووست کردووە، ئەو پێناسە نا واقیعی دوور لە ڕاستییە بڵاو دەکەن، ڕاستییەکەشی ئەوەیە موسوڵمانان لە درێژایی مێژوویی ئیسلامدا هەرگیز بە دۆخی لەمە خراپتردا تێنەپەڕیون، سوودی زانینی ئەم حەقیقەتە تاڵەش ئەوەیە، خولقێنەرانی ئەم دۆخە خراپە بناسیت، جۆری لادان و لایەنەکانی شێواندنی ئیسلام شارەزا بیت بۆ ئەوەی لێی پارێزراو بیت، هەروەها بۆ ئەوەی کار بکەیت بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بارە ناهەموارە کە زیاتر خۆی لە لاوازی بواری عەقیدەو بیروباوەڕدا دەبینێتەوە و تۆیش پێویستە ببیتە بەشێك لە هەوڵ و هەڵمەتی نەهێشتنی چەواشەکاری و دەرخستنی ڕووی حەق.

لێرەدا بە پێی بەدواداچوونی شارەزایان و هەندێ خوێندنەوەی خۆم، دیارترین بوارەکانی لادان لە عەقیدەی ئیسلامی لەم سەردەمەدا دەخەمە ڕوو، چونکە زۆربەی زۆری ئافرەتانی موسوڵمان و وابەستەبوو بە دینەکەیان، ئەو ڕاستیانە نازانن و وا گومان دەبەن وەزعی ئیسلام و موسوڵمانان لەم سەردەمەدا زۆر باش بێت، بەو شێوەش ئەوانیش بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، دەبنە بەشێك لەو واقیعە تاڵەی ئاماژەم پێکرد.

١- لە زۆرێك لە وڵاتانی جیهاندا و بە كوردستانی خۆیشمانەوە، عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی نامۆ بووە و بە قۆناغێكی غەریبی ناخۆشدا تێدەپەڕێت، نەك هەر ئەوەش، بەڵكو عەقیدەی ڕاست و شوێنكەوتوانی دژایەتی دەكرێن و لەڕێگەی جۆرەها تۆمەتی ناڕاست و ستەم ئامێزەوە، ناشیرین دەكرێن و وەكو بوونەوەرێكی زیانبەخش بە كۆمەڵگا و دواكەوتوو و بێ دەسەڵات لەوەی بتوانن لەگەڵ ڕەڕەوەی پێشكەوتندا ڕێبكەن وێنا دەكرێن، هۆكاری ئەو دیدە ناڕاستەش زۆرن، لە دیارترینیان هەبوونی كۆمەڵێكی زۆر لە بەناو زانای گومڕا و دینفرۆش كە عەقیدەیان هەموو جۆرە گومراییەكانی تاقمە ئیسلامییەكانی تێدایە و سەریان لە موسوڵمانان شێواندووە.

٢- قەتیس كردنی ئایینی ئیسلام لە چەند عیبادەتێكدا، وەكو نوێژ و زەكات و ڕۆژوو، بە جۆرێك كە زۆربەی موسوڵمانان لەم سەردەمەدا وا دەزانن ئیسلام هەر ئەوانەیە وهیچی تر بەوە عیبادەتیان لە عەقیدە جیاكردەوەو دین و دینداریيەكی نامۆ هاتە كایە و ژمارەی موسوڵمانانیش لەسەر بنەمای شێواندنی چەمكەكەی وەكو كەفی سەر دەریا، ڕۆژ لە ڕۆژ لە زیادبووندایە، بێ ئەوەی لە واقیعی ژیاندا، سوودێكی ئەوتۆیان بۆ خۆیان و دینەكەیان هەبێت. ئەمە حاڵی زۆرینەیە نەك هەمووی، چونكە خێرو چاكە لە ئوممەتی ئیسلام بە یەكجاری قەت نابڕێت.

(لا تَزالُ طائِفَةٌ مِن أُمَّتي يُقاتِلُونَ علَى الحَقِّ ظاهِرِينَ إلى يَومِ القِيامَةِ)[١]

---

[١] - مسلم: ١٩٢٣.

٣- لە ناوچوونی قەڵایەکی قایمی بیروباوەڕی موسوڵمانان، کە نەیارانی ئیسلام کۆششی زۆریان بۆ لەناوبردنی کرد، ئەویش بنەمای (الولاء و البراء)بوو، کە بەو هۆیەوە موسوڵمانان لە بنچینە تۆکمەکانی دینەکەیان و لە ئاکارە ئیسلامییە جوانەکانی خۆیان دوورکەوتنەوەو بوونە پاشکۆی ناحەزانی دینەکەیان و کاروباریان کەوتە دەست کەسانێك، بەڕواڵەت موسوڵمان و لەڕاستیدا لە بیرباوەڕو شەریعەتی ئیسلامەوە گەلێك دوورن.

٤- تەشەنە کردنی شێواندنی چەمك و واتاکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەناو کۆمەڵگای موسوڵماناندا، بە شێوەیەك کە ئایەت و فەرموودەکان لەم سەردەمەدا بە دوورترین شێوە لە حەقیقەتی خۆیان ولە جەوهەری پەیامی ئەو دوو سەرچاوەیە تەفسیر دەکرێن، بەداخەوە خەڵکیش بە هۆی ناحاڵی بوون و نەفامییان بە تەوحید و بەزانستە ئیسلامییەکان و هەروەها ئاشنا نەبوونیان بە زمانی عەرەبی ئەو پیلانەیان بەسەردا تێپەڕی و بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن لە حەقیقەتی دینەکەیان دوور کەوتنەوە.

٥- بڵاوبوونەو تەشەنەکردنی فیکری ئیرجائی و زۆربوونی شوێنکەوتوانی تاقمی مورجیئە ئەویش لە ڕێگەی خۆ حەشاردان لەژێر ناوی پیرۆزی ئەهلی سوننە و جەماعەتدا، کە دواجار بوو بە هۆکارێکی گەورە بۆ نامۆبوونی عەقیدەی ئیسلامی لەم سەردەمەدا، چونکە بەپێی عەقیدەی گومڕای مورجیئە، هەر کەسێك شایەتمان بهێنیت و بڵێ (لاإله إلاالله) بەبێ ئەوەی عەمەل و کردەوەشی هەبێت، ئیماندارە و ئیمانەکەی تەواوە، تەشەنە کردنی بیری ئیرجائی خراپترین شوینەرواری لە دوورکەوتنەوەی موسوڵمانان لە ئەسڵی دینەکەیان هەبوو و تاکو ئێستەش بە هۆی پێشوازی کردنی گەرمی هەموو سەرانی عەلمانیەت و سەرۆکی دەولەتە بەناو ئیسلامییەکان، ئەوان لە زۆربووندان و لە تێکدانی چەمکەکانی عەقیدەی ئیسلام بەردەوامییان هەیە و لە هەموو وڵاتێکدا کە بوونیان هەبێت دارودەستەی زاڵمان و نەیاری ئەو موسوڵمانانەن کە حەقیقەتی لادانی ئەوانیان لە مەنهەجی ئیسلام بۆ دەرکەوتووە.

٦- زاڵبوونی فەلسەفە و علم الكلام لەناو وڵاتی موسوڵماناندا کە هەڵقوڵاوی فیکری وەسەنی وبتپەرستی ئوممەتانی پێش ئیسلامە و ڕەنگدانەوەی ئەو دیدو تێڕوانین و هیزرە لەناو کتێب و نووسین و بگرە مەناهیجی دیراسی لە قوتابخانەو زانکۆکان، تەنانەت حاڵ بەوە گەیشت کە خودی عەقیدەی ئیسلامیش لە ڕێگەی علم الكلام وەربگیرێت و جێگە بە عەقیدەی ڕاستی پێشینانی چاکی ئەم ئوممەتە تەنگ بکات.

٧- تەشەنە كردنی دیاردەكانی شیرك و بیدعە لەناو ئوممەتی ئیسلامدا، لەوانە:
- زۆربوونی هەردوو جۆری شیركی گەورەو بچووك لە ڕێگەی زۆربوونی عیبادەتكردنی ئەولیا و گۆڕ و شەخسەكانەوە، بە شێوەیەك كە وڵات نییە جێگەی تایبەت بەو دیاردانەوە تێدا نەبێت. لەم بارەوە كتێبی (الإنحرافات العقدية والعلمية في القرنين الثالث عشر والرابع عشر وآثارها في حياة الأمة) علي بن بخيت الزهراني، بخوێنە بەسوودە.
- زۆربوونی بیدعە لە ناو موسوڵمانان‌دا بە شێوەیەك ئەو بیدعانە سوننەتەكانیان نامۆ كرد و میزاجی ئایینی خەڵكیش بە شێوەیەك تێكچوو، كە چێژ لە هیچ عیبادەتێك نابینن تاكو لەگەڵ بیدعەیەكدا تێكەڵی نەكەن.

٨- زۆربوونی چالاكی بەناو عەقلانی و قورئانی ودژە سوننەتەكان و هەروەها دەركەوتنی هەندێ فیرقی تر وەكو خەورایجەكان و ئەوانەی لەسەر ڕێچكەیان ڕێ دەكەن، كە ئەوەش پێچەوانەی مەنهەجی ئەهلی سوونەت و جەماعەتە و دەرەنجام ئەو جۆرە كردەوانەش بوون بە شێوازیكی تر لەلادان لە ڕێبازی ڕاستی پێشینانی چاكی ئەم ئوممەتە.

٩- بڵاوبوونەوەی هەندێ بیروباوەڕ و عەقیدەی باتڵ و پێچەوانەی بیروباوەڕی پیشینانی چاکی ئەم ئوممەتە و باوەڕ بوون بە دەسەڵاتی ئەولیا و مەشایخ و هاوارکردن بە مردووان و تەشەنە کردنی سیحر و جادوو فاڵ گرتنەوە و باوەربوون بە بورج و خوێندنەوەی بەخت و ناودەست و فنجان و زۆر حاڵەتی نەخوازراوی تر کە هەمووی پێچەوانەی بیروباوەری ئیسلامە، خەڵکی ئەوەندەی تر لە حەقیقەتی دینەکەیان دوورخستەوە.

کارەساتی گەورەش ئەوە بوو، بەرانبەر ئەم هەموو لادان و ئینحیرافاتە، ڕۆڵ وکاریگەری زانایان - جگە لە کەمینەیەك نەبێت - وەکو پێویست نەبوو، کە ئەوان دەبوو هەستیان بەبەرپرسیارێتی گەورە بەرانبەر ئەو دۆخە پڕمەترسییە بکردایە، بەتایبەتی کە الله تعالى دەربارەی ئەوان فەرموویەتی: ﴿وإذ أَخذ الله ميثاق الذين أوتوا الكتاب لتبيّنّه للناس ولا تكتمونه فنبذوه وراء ظهورهم واشتروا به ثمناً قليلا فبئس ما يشترون﴾[1] بەڵام بەداخەوە نەك زۆربەیان بە ئەرکی خۆیان هەلنەسان، بەڵکو بە خۆیشیان بوون بە بەشێك لەو کارەساتەی بەسەر ئوممەتی ئیسلامدا هات و زۆربەیان خۆیان کەڕ و بێ ئاگا کرد لەو واقیعە تالەی تووشی ئوممەت بووە، بەڵکو هەموو هەولێکیان بۆ خۆشی و ڕابواردنی خۆیان قۆستەوەو، نکۆڵییان لەو ئەمانەتە کرد کە الله عزوجل پێیانی سپاردبوو .

---

[1] - آل عمران:١٨٧.

ئەگەرچی ئەم ڕاستی وخەمانەی باسم کرد لەوانەیە زانینیان بۆ پیاوان و بۆ ژنان وەکو یەك پێویست بێت، بەڵام لێرەدا مەبەستم بوو وەکو ئاگادارکردنەوەتان پێتانی ڕابگەیەنم، چونکە ئافرەتان عاتیفە زاڵە بەسەریاندا وخۆش باوەڕن بۆ ئەو قسانەی کە دەوترێت و ڕەنگە توانای تەحقیق کردنیان وەکو پێویست نەبێت، هەروەها بۆ ڕواندنەوەی ئەو وەهمەی کە کە گوایە موسوڵمانان لە وەزعێکی زۆر باش و بەهێزدان و هەموو شتیك لەبارە بۆیان، چونکە بەداخەوە وەکو وتم پێچەاونەی ڕاستییە و ئەگەر باوەڕی پیّ بکەن، چەواشە دەبن و ناتوانن بە ئەرکی پێویستی خۆتان لە بەهیزکردنی عەقیدەی خۆتان و ماڵ ومنداڵتان هەڵبسن، وەکو کەسێك کە بە دەست نەخۆشییەکی کوشندەوە بناڵێنیت، بەڵام پێی بوترێت تەندروستیت زۆر باشە و پێویستت بە وەرگرتنی هیچ چارەسەرێك نییە تاکو دۆخی خراپ دەبیت و هیوای چارەسەری نامێنیت، !

کە تۆ دڵنیابووی حاڵی ئوممەت بەو شێوە گەیشتووەتە ئەو هەڵدێرە، ئەوکات بیر لەوە دەکەیتەوە هیچ نەبێت لە چوار چێوەی ماڵەکەی خۆت و لە بازنە نزیکەکانتاندا جەخت لەسەر ڕاستکردنەوەی ئەو لادان و هەڵانە بکەنەوە و بەر لەوەی بگەڕێنەوە لای پەروەردگارتان بەردێکتان بۆ دینەکەتان خستبێتە سەر بەردێك.

# پەیامی یازدە: ئافرەت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

لە دە بەشی داهاتووی ئەم زنجیرەیەدا کە تایبەتە بە باسی فیقهی و شەرعی بە گشتی، پێم خۆش بوو، یەکەم وێستگەم لەگەڵ کچان و ئافرەتاندا ئەوە بێت پێیان بڵێم: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەکرێت وەکو ڕێگایەکی خێر وچاکە بەکار بهێنن و بیکەن بە ئامرازێك بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار و بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی، بەڵام لەو میانەدا پێویستە تێبینی چەند مەسەلەیەك بکرێت، بۆ ئەوەی لە کاتی ئەنجامدانی خێر و کردەوەی چاکەدا تووشی شەڕ و خراپە نەبن و لە جیاتی پاداشت بە تاوانەوە لێی دەرنەچن، بۆیە بە هەموو ئافرەتێکی بانگخواز و نووسەر لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا دەڵێم:

١- بە هیچ شێوەیەك لە کاتی پۆستکردندا، وێنەو ڤیدیۆی خۆت بڵاو مەکەرەوە، چونکە ئەوە کارێکی حەرامە و جۆرێکە لە هاوکاری کردن لە بڵاوپێکردنی هەڵە و تاوان وکاریگەری خراپی لەسەر بەشێك لە پیاوان دەبێت، ئهاوکات ئەو کارەت هیچ حیکمەتێکی شەرعی تێدا نییە، کە تۆ قسەیەکی خێر دەنووسیت، هیچ بەمەرج نەگیراوە وێنەیەکتی لەگەڵدا بێت بۆ ئەوەی ئامانجی خۆی بپێکێت.

٢- لە هەمان کاتدا کە نابێت وێنەی خۆت پۆست بکەیت، هاوکات درووستیش نییەو حەرامە، بچیت وێنەی کچ و ئافرەتی تر لە جیاتی وێنەی خۆت بڵاو بکەیتەوە، گوایە ئەوەی خۆت حەرامە و وێنەی کچ و ژنی خەڵکی – با ئەوان خۆیشیان بڵاویان کردبێتەوە و لە گوگڵدا بەردەست بێت – دروووستە وکێشەی نییە! وەکو ئەوەیە بە بەرانبەرت بڵێیت: من ئافرەتم و وەکو خاوەنی ئەو وێنە جوانم و ئەوەش لە جیاتی وێنەکەی خۆم داناوە!

٣- هەمیشە سنوورێك بۆ خۆت بەجێ بهێڵە بۆ ئەمان و بە وردی ئیحتیات بۆ زۆر شت بکە و لە ڕەفتار و لە مامەڵەتدا وەکو ئافرەتێکی کەسایەتی سەنگین مامەڵە بکە کە لەناو دارستانێکدا بە نیازی بانگەوازیت و وامەزانە بەرانبەرەکانت هەمووی خەڵکی باش و نیاز پاك و فێرخوازی زانست بن، ئەوانەی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانن بریتین لە نموونەی هەموو چینەکانی کۆمەڵگای کوردی کە لە ڕاستیدا هەموو جۆرێکی لە خۆ گرتووە، لە ئەمسەری باشەوە بۆ ئەوسەری خراپ.

٤- لە کاتی خزمەت کردن وبانگەوازکردن بۆ دینەکەت لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبێت تەنها چاوببڕیتە ڕەزامەندی پەروەردگارت و نیەتت بۆ ئەو پاك بکەیتەوە، ئەگینا بتەوێت رەزامەندی خەڵکی لەگەڵدا بەدەست بهێنیت ئەوە ڕێگایەکی پڕ لە دڕك وداڵە، تا خۆت گوناهبار نەکەیت ئەوان ڕازی نابن، لەوە دڵنیابە و لەکەسێکەوە وەریبگرە ئەزموونی ژیانی هەیە.

٥- ئەسڵ ئەوەیە هەموو قسە کردنێك لە نێوان کچان و کوڕان و ژنان و پیاواندا ئەگەر مەحرەمی یەکتر نەبن، نادرووست و ڕیگە پینەدراوە، بۆیە قسە کردنی لەو جۆرە تەنها بۆ کاری پێویست و زەرورەتە.

٦- تایبەتمەندییەکانی ژیانی خۆت وەکو کچێك یان وەکو ئافرەتێك بڵاو مەکەرەوە، چونکە ئەوە لە زیاتر لە ڕوانگەیەکەوە زیانی هەیە.

٧- لە ئەنجامدانی لایك و نووسینی کۆمێنت و شەیر کردنی پۆستی خەڵکی و زیادکردنی هەندێ ئەژماری تایبەت لەلای خۆت، دەبێت زۆر بە وریاییەوە بێت و هەمووی ئەگەر جێگای تێبینی شەرعی بێت لەسەرت حیسابە! تەنانەت شەیر کردنی ڤیدیۆی کوڕێکی گەنج کە قورئان دەخوینێت، یان سروودێکی ئیسلامی دەڵێت، یان ڤیدیۆیەکی مامۆستاو بانگخوازێکی گەنجی تەمەن منداڵ کە قسەیەکی خێری تێدا دەکات، بۆ تۆی کچ و بۆ تۆی ئافرەت کارێکی جوان نییە و ڕەهەندی پێچەوانەی هەیە.

٨- ئافرەت لە پۆستی تۆرە كۆمەڵایەتییەكاندا بە هیچ شێوەیەك درووست نییە و نەشیاوە بچێتە باسی هەندێ مەسەلەی هەستیارەوە با شەرعیش ڕێگەی دابێت كە جۆرێك لە وروژاندن و نەشیاوی تێدا بێت بۆ ئەوەی ئافرەت بیگێڕێتەوە، چونكە بەرانبەر بە هۆی بەكارهێنانی ئافرەت بۆ ئەو وشەو دەربڕینانەوە گومانی خراپ دەبەن و ڕەنگە وا بزانن مەبەستی تری هەیە لەو قسانە. بە كورتی: دەبێت وشەو دەربڕینی جوان و شەرعی و سەنگین بەكار بهێنێت و (فَلا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ) تەنها تایبەت نییە بە دەنگ و قسەكردنەوە بەڵكو لە نووسینیشدا ئەو مەسەلە ڕەنگدانەوە و كارگەریشی هەیە.

٩- درووست نییە ئافرەت هەندی وێنە بۆ پرۆفایلی خۆی دابنێت كە لەوانەیە لە دڵی هەندێ لە پیاواندا ببێتە مایەی درووست بوونی گومان یان هەڵە تێگەیشتن، یان هەندێ هەستی تایبەت، بۆ نموونە وینەی دڵ و گوڵ و شتی لەو شێوە كە لە ڕووی دەروونی و كۆەڵایەتی تەفسیر و لێكدانەوەی جیاواز هەڵدەگرێت.

١٠- هەروەها پێویستە لە کاتی پۆستکردنی ئایینی و زانستی شەرعیدا، سنووری زانستی خۆت بزانیت، بە بێ ئەوەی قۆناغەکانی زانستت بڕیبێت و لە عەقیدەو فیقهو ئوسوڵ و تەفسیر و سیرە بەلای کەمەوە قۆناغێکی سەرەتاییت بڕیبێت نابێت قسە بۆ خەڵکی بکەیت و فەتوا بدەیت و بەبێ ئەوەی ئەهلییەتت هەبێت خۆت وەکو مامۆستایەکی بەتوانا نیشان بدەیت کە بەباشی لە هەموو لایەنەکانی ئیسلام تێگەیشتوویت، خەڵکی وا حاڵی بکەیت کە تۆ توانای وەڵامدانەوەی پرسیار و ڕوونکردنەوەی حەڵاڵ وحەرام و ڕێنمایی کردنی موسوڵمانانت هەیە، تاکو ئامادەکاری تەواوت تێدا دروست نەبێت و قۆناغەکانی زانست بە ڕێکوپێکی نەبڕیت بۆت نییە بەو ئەرکە هەڵسیت، ئەگەر وا بکەیت کارەکەت زۆر لەوە خراپترە کەسێك پزیشك نەبێت و هەڕەمەکی چارەسەری نەخۆش بکات و دەوادەرمانیان بۆ بنووسێت وخۆی وەکو پزیشك وێنا بکات، چونکە لەو حاڵەتەدا ئەو تەندرووستیان تێك دەدات و تۆ دینیان تێکدەدەیت.

١١- ئەگەر هەر پرسیارێکی شەرعیت هەبوو بۆ ئاسانکردنی کاری بانگەوازت، سەرەتا هەوڵ بدە بەبێ ئەوەی پرسیار لە هیچ مامۆستایەك بکەیت لە هەندێ سایتی متمانە پێکراو وەکو سایتی (الإسلام سؤال وجواب)ی محمد صالح المنجد یان ئەو سایتانەی تایبەتن بە گەروە زانایانەوەو فەتواکان تێیدا پۆلێن کراون و ئاسانکاری کراوە بۆ سوود وەرگرتن لە بەشەکانی، دوای ئەوە ئەگەر دەستت نەکەوت ئینجا بە پلەی دووەم هەوڵ بدە لە مامۆستایەکی عەقیدە پاك وخاوەن زانست پرسیارەکەت بکەیت، لەوەشدا پێم باشە ئەگەر بتوانیت بەناوی خۆتەوە وەکو ئافرەتێك پرسیارەکەت نەکەیت، بەڵکو لە هەژماری کەسێکی ترەوە پیاو بێت پرسیارەکە بکەیت باشترە، وەکو ئەوەی پیاو پرسیار بکات یان پرسیاری ئافرەت بێت و پیاو بیکات، ئەگەر ئەوەش نەکرا باشترە بە شێوەی چاتکردن نەبێت و بە کورتی وەڵامەکەت وەربگریت و تەواو.

١٢ – تاکو پێت دەکرێت بابەتی ئافرەتان بنووسە و گرنگی بە خزمەتی پرسەکانی ئەوان بدە، لەبەر ئەوەی بۆشاییەکی گەورە لە بانگەوازی ئافرەتاندا هەیە و هاوکات هەندێ بانگخوازی پیاو پەیدا بوونە کە بەداخەوە بە نرخی فەرمان بەچاکە فەرمانیان بەخراپە پێ دەکەن و پێویستییەکی هەنووکەیی بە ڕاستکردنەوەی ئەو ئاراستە هەڵەیە هەیە، چاکترین کەسیش پڕی بکاتەوە بانگخوازێکی ئافرەتە کە کیتاب و سوننەت بکاتە دروشم وسەرچاوەی دین و دونیای خۆی.

بە هەموو شێوەیەکیش خۆت لە هەندی لە تۆرە کۆمەڵایەتیە بەدناوەکان بپارێزە کە زیاتر کاری خراپەی تێدا ئەنجام ئەدرێت و ئەوانەی سەردانی ئەکەن بە زۆری بۆ مەبەستی خێروچاکە نییە، وەکو تیکتۆك و سناپ و ئینستاگڕام ، بەڕاستی ئەوانە هەرگیز جێگایەکی شیاو نییە بۆ ئافرەتی موسوڵمان لەوێوە بانگەواز بۆ ئیسلام بکات.

١٣ – وەڵامی نامەو کۆمێنتی پیاوان بە قسەی خۆش و موجامەلە مەدەرەوە، ئەوە هەڵە ونادروستە و بۆی هەیە کاریگەری خراپ و نەخوازراو لەلای بەرانبەر درووست بکا، بێگومان مەبەستم ئەوە نییە بەبێ ڕێزی مامەڵە بکەی یان وەڵامی نەشیاو بدەیتەوە نەخێر، بەڵکو تەنها مەبەستم ئەوەیە بزانی وەڵامی پیاو بۆ پیاو زۆر جیاوازە لە وەڵامی ئافرەت بۆ پیاو و ڕەهەندی جیاوازی خۆی هەیە، دەروونی ئەو خەڵکە جیهانێکی سەیر وئاڵۆزە ئاسان نییە بە شێوەیەکی سادەو ئاسایی بەبی کێشە و کاردانەوەی چاوەڕوان نەکراو ڕەفتاری لەگەڵدا بکەی.

١٣- ئافرەت بە دەقی فەرموودەی صحیح قورسترین تاقیکردنەوە وفیتنەیە بۆ پیاوان، ئەوە فەرموودەی خۆشەویستمانە کە فەرموویەتی: (ما تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ علَى الرِّجالِ مِنَ النِّساءِ.)[1]. بۆیە ئەو ڕاستیەت هەمیشە لە بیر بێت لە تۆرە کۆمەڵایەتییەکاندا کاتیك بەنامە و کۆمینت و تەنانەت لایکیش مامەڵە لەگەڵ پیاواندا دەکەیت، ئەگەر وێنەت دانابێت ئەوە حەرامە و نادرووستە و تاوانباریت، ئەگەریش داتنەنابێت، وریای ئەوە بەرانبەرەکەت لە تۆرە کۆمەڵایەتییەکاندا لای خۆیەوە وێنەیەکت لە خەیاڵی خۆیدا بۆ درووست ئەکات، زۆر جار جیاوازە لە حەقیقەت و ئەوەش هەندی جار سەرەتای کێشەیەکی ناشەرعی نەخوازراوە، بۆیە وریابە و لەوە تێبگە کە پیاوان تووشی فیتنەیەك لە فیتنەی ئافرەتان خراپتر نەبوونە و نابن، تۆیش ئافرەتیت و پێویستە تەقوای الله عزوجل ت هەبێت.

---

(١) - أخرجه البخاري (٥٠٩٦)، ومسلم (٢٧٤٠).

١٤- نابێت هەندێ وشەی شل و دەربڕینی تایبەت وەکو ڕێزو خۆشەویستی ماریفەت بۆ بەرانبەر تەنانەت بۆ ئافرەتانیش لە کۆمێنت و پۆستەکاندا دەرببڕیت، وەکو پێکەنین هههههه و دەربڕینی وەکو گیانەکەم و چاوەکەم و دڵەکەم و دەربڕینی لەو شێوە ئەگەر بۆ ئافرەتانیش بێت، ئەوەش لەبەر هەمان هۆکار کە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد کە ئەوانەی پۆستەکانت ئەبینن جۆرەها خەڵکی جیاواز و خاوەن دەروون و بیرکردنەوەی تایبەتی تێدایە و بۆی هەیە کێشەی وات بۆ درووست بکات لە خەیاڵیشدا بیرت لێ نەکردووەتەوە.

١٥ – پێم باش نییە باسی کێشە و خۆشی و ناخۆشی ژیانی تایبەتی خۆت بۆهیچ کەسێك بکەیت، یان خۆشگوزەرانی و بەختەوەریت لەگەڵ هاوسەرو منداڵ و کەسوکارتدا بۆ خەڵکی دەربخەیت، نە لە پۆست و نە لە کۆمێنت و نە لە نامەی تایبەتدا، چونکە ئەوەش ئەگەرەکانی خراپەی لە چاکەکانی زۆرترە و ئەگەری بەلاریبردنی پرسەکە بوونی هەیە.

١٦ – هیچ کاتێك هانت نادەم هەرچەند خاوەن توانای زانستی و قسە کردن بیت، کە بە بە ڤیدیۆ یان بە دەنگی خۆت وانە و دەرس و خولی گشتیت هەبێت وهەموان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بتوانن تەماشای بکەن وگوێی لێ بگرن، ئەوە کارێکی ناشەرعییە وخراپییەکانی لە چاکەکانی زۆرترە و، باشی ئامانج نابێتە بیانوو بۆ گرتنەبەری ڕێگای حەرام بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئامانجە باشە. وینەو ڤیدیۆی ئافرەت بە بێ هیچ گومانێك حەرامە، بەو وینانەشەوە کە لەگەڵ هاوسەر و دایك و برا وخوشکدا دەیانگریت، هەمووی نادرووست و مایەی فیتنەو تاوانە، هەرکێیش فەتوای دواە غەڵەتی کردووە و زۆر لە حەق و جەوهەری دەستگرتن بە کیتاب و سوننەت دوور کەوتووەتەوە. دەنگی ئافرەتیش بەهەمان شێوە کاتێك لە بازاڕی بێ سەروبەری فەیسبوك و تۆڕەکانی تردا نمایش بکرێت بێگومان حەرامە، بەڵام دەکرێت ئەو وانە و خولانە تایبەت بیت بۆ ئافرەتان و گشتی نەبێت.

١٧- بە ڕەفتاری هەندی ئافرەتی بەڕواڵەت مولتەزیم بە ئیسلام فریو مەخۆن کە لە تۆرە کۆمەڵایەتییەکاندا بەیانی و ئێوارە خەریکی پۆستکردنی وێنەی خۆیانن و دیواری شەرمیان لە دەروونی خۆیاندا ڕوخاندووە و وایان لێهاتووە وەکو پیاو مامەڵە دەکەن، لە کاتێکدا زۆریش گرنگی بە جوانکردنەوەی ڕوخسار و دەرکەوتنی خۆیان ئەدەن، وەکو ئەوەی مەسەلەکە هەر ئەوەیە جەستەی داپۆشراو بێت، ئیتر دەست و دەموچاو لەش ولار بەداپۆشراوی دەرخستنی ئاسایی بێت وشەرعی بێت وگوناه نەبێت بۆ ئەو هەموو خەڵکە نمایش بکرێت، یان قسە کردن و تێکەڵ بوون لەگەڵ پیاواندا بۆ کاری خێرخوازی و ڕێکخراوەیی و حیزبی، جۆرێك بێت لەوەی لە قورئان و فەرموودەدا چاوپۆشی لێ کرابێت وڕێگی پێدرابیت، لەکاتێکدا وا نیە و ئەوە سەر لێ تێکچوون و فیتنەیەکە تووشیان بووە و بەتێپەڕبوونی کات ئەو گوناهە ئاسایی بووەتەوە بەلایانەوە.

بەڵام ئێوە با بەزەییتان بەوانەدا بێتەوە، نەك شوێن پێییان هەڵگرن. ئافرەتی وا هەیە لەوانەی کە بەو شێوە فیترەتی خۆیان تێکداوەو بەبیانووی کاری ئیسلامی و چالاکی حیزبی وبانگەواز خۆیان عەرز ئەکەن، ئەگەر لە هەژمارەکانی فەیسبوکیاندا بگەڕێیت بە سەدان وێنەیانی تێدایە و بۆ هەموان بەردەستەیان کردوە، لە هەموویشیدا ڕوخساریان دەردەکەوێت و لەش و لاریشیان با بەداپۆشراویش بێت دیارە و بەڕوونی دیارە ئامادەباشی خۆیان بۆ وینەگرتنی بەر کامێرا وەرگرتووە ،

ئەوانە پێویستە لە الله بترسن و لەو خۆ نماشکردن و خۆ خەڵەتاندن و شێواندنەی کە سەرقاڵین ڕابوەستن و چیدی نەبنە پێشەنگێکی خراپ بۆ ئافرەتان بە فەتوای مەلاو بانگخوازەکانی ئاخیر زەمان دڵ خۆش نەکەن.

١٨- پەیامێکی ترم بۆ ئەو کچ و ئافرەتە بەڕێزانەیە کە نیقاب و عابایان پۆشیوە و لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بە شێوەیەك لە شێوەکان جێ پەنجەو ئامادەبوونیان هەیە: داواتان لێ دەکەم وەکو چاوەڕوان کراوە لێتان ببنە نموونەی شەرم و سەنگینی ڕاستەقینە و دەستگرتن بە کیتاب و سوننەت و ببنە پێشنگێکی باش بۆ کچان و ئافرەتانی کورد  بە ڕەفتاری جوان و هەڵسوکەوتی هاوسەنگ وانەی کردەیی جوانیان پێشکەش بکەن.

لەراستیدا تۆ کە بووی بە نیقاب، مەعنای ئەوە نییە ئیتر ئاساییە بەو شێوە دەربکەویت و خەڵکی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بەنیقابەوە تەماشات بکەن، بەڵکو بەو شێوە ئەگەر خۆت نمایش بکەیت ڕەنگە لەوانەی کە روخساریان بەدەرەوەیە سەرنج ڕاکێشتر بیت و ئەوەی کە پیشتر دەربارەی ئافرەتانی حیجاب باسم  کرد لەسەر تۆی نیقابپۆش بە هەمان شێوە جێبەجێ دەبێت و حەرامە بە عابا و نیقابەوە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەربکەویت و خۆت نمایش بکەیت، لەوەش زیاتر،پێویستە تێبینی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەیت:

- لە ڕووی فیتنەوە، ئافرەت هەر ئافرەتە، سەرپۆش بەسەر و بێ سەرپۆش و عەبا ونیقاب حیجاب پۆش لەو ڕووەوە هەمووی بە جۆرێك لە جۆرەكان هەر فیتنە و كاریگەرییان هەیە، بەڵام بەڵام هەر ئەوەندەیە شێوازەكانیان جیاوازە، بەڵكو ئافرەت ڕەنگە بە داپۆشراوی زیاتر جێگای گرنگی و بایەخ پێدانی زۆرێك لە پیاوان بێت، زیاتر لەوانەی كە بەشێك لەجەستەیان بەدەرەوەیە، بۆیە لەوە دڵنیابن دەركەوتنتان لە تۆرە كۆمەڵایەتییەكاندا بەهەر بیانوویەك بێت حەرامە و نادرووستە.

- هەڵەی ئێوە گەورەتر و دیارترە و كاریگەری زۆرترە لە هەڵەی ئەوانەی تەنها سەرپۆشیان كردووە و ڕوخسار و دەستیان بەدەرەوەیە، چونكە ئێوە وا خۆتان دەردەخەن كە ئیوەش هاوشێوەی ئەوان حەزتان لە خۆ نمایشكردنە و مەبەستتانە كە پیاوان بەو شێوە بتانبینن.

- هەندێ دەزگای ڕاگەیاندن و خەڵكانێكی جۆراوجۆر پێ دەچێ بیانەوێ وێنەی ئافرەتی نیقاب و عەبا پۆش ناشیرین بكەن و سیناریۆی یارمەتیدەر بۆ ئەو مەبەستە دروست بكەن، بۆیە ئەوە دەبێ هاندەر بێ بۆتان بە هیچ شێوەیەك لە هەژمارەكانی خۆتاندا لەتۆڕە كۆمەڵایەتییەكان بەگشتی دەرنەكەون و نە حیكمەتیكیش هەیە لە دەركەوتنتاندا، ئەوەی بە خێری ئەزانن بینووسن و بڵاوی بكەنەوە، بێ ئەوەی وێنەو ڤیدۆی خۆتان نمایش بكەن، كە ئەو وێنە جارێكی تر ناتوانن بیسڕنەوە بەیەكجاری و لەدەستی خۆتان دەردەچێت.

- نیقاب و عەبا پۆشین -گەرچی لە ڕووی فیقهییەوە قسە هەڵدەگرێت- بێگومان کردنی بۆ ئەم سەردەمەی خۆمان زۆر باشترە و گونجاوترە لەگەڵ ئەو لێشاوی فیتنەی کە دونیای گرتووەتەوە، دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ژوورەکانی سیاسەت لە جیهاندا ڕۆژ لە ڕۆژ ڕێگری بۆ ئەو مەسەلە درووست دەکەن و ڕێنمایی و تەگەرەی بۆ دادەهێنن، بۆیە دەبێت ئێوەش بە ئەوپەڕی بەر پرسیارێتییەوە مامەڵە بکەن و ڕێگە نەدەن هەڵەی خۆدەرخستنتان بقۆزرێتەوەو بوترێت ئەوەیە نیقابەکە!

- بەم دواییانە نەك هەر وێنەی جۆراوجۆری ئافرەتانی نیقاب پۆش، بەڵکو هەندێ گرتەی ڤیدیۆییان بڵاودەبێ کە خۆیان لە ئەژمارەکانی خۆیان لە فەیسبوك بڵاوی دەکەنەوە، زۆر نەشیاوەو مایەی خەم و بێزارییە کە ئەوان بەو ئاستە لە بێ ئاگایی گەیشتون، بۆ نموونە ڕیکلام دەکەن بۆ عەبا و نیقاب، یان باسێکی زانستی یان تایبەت بەبانگەواز خۆیان نمایش دەکەن و هەموو جەستەیان بەو داپۆشراوییەوە دەردەخەن وەکو ئەوەی مەبەستەکە خۆ دەرخستنەکە بێت نەك باسەکە.

پوختەی ئەم باسە ئەوەیە ئافرەتان دەتوانن تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وەکو هەلێك تەماشا بکەن و بۆ خزمەتی دینەکەیان بیقۆزنەوە، بەڵام هاوکات دەبێ ڕەچاوی شەرع بکەن و دەرکەوتنیان بە وێنەو بە ڤیدۆ لەلایەکەوە حەرامە و کاریگەری خراپی هەیە، لەلایەکی تریش هیچ پێویست نییە بۆ خۆ دەرخستنی ئەو ئافرەتەی کە دەیەوێت بانگەواز بۆ ئیسلام بکات، دەتوانێ ئەوەی خێرە بیگەیەنێت و خۆیشی دەرنەکەوێت.

## پەیامی دوازدە: چەند حوکمێکی فیقهی دەربارەی ئافرەتان

١- لە خەسڵەتەکانی فیترەت، ئافرەت داوای لێکراوە هەموو ئەوەی دەبێتە مایەی پاك وخاوێنی ئەنجامی بدات، وەکو: نینۆك گرتن و وڕێ وشوێنە هاوشێوەکانی تر لە خۆپاککردنەوەی جەستە کە تاکو بتوانێت هەفتانە ئەنجامی بدات باشترە.

سەبارەت بە نینۆکی دەستکرد (صناعي) زانایانی ئەم سەردەمە خیلافیان هەیە دەربارەی هەندیکیان بە حەرامیان زانیوە و وتوویانە هەمان حوکمی نینۆکی ڕاستەقینەی هەیە، هەندێکیشیان وتوویانە مەبەست لە نینۆك کردن دەستەبەر کردنی پاك و خاوێنییە بۆ خاوەنەکەی، نینۆکی دەستکردیش ڕێگر نییە لەو پاك و خاوێنییە.

بەڵام ئەوەی لەگەڵ بەڵگە شەرعییەکاندا دیتەوەو واقیعیش هەر ئەوە دەخاوزێت ئەوەیە: حوکمی ئەو جۆرە نینۆکانە لە دوو حاڵەت بەدەر نییە وەکو هەندێك لەزانایان فەرموویانە:

یەکەم: ئەگەر دانانی هۆکارێکی هەبێت وەکو ئەوەی کەسەکە لەبەر هۆکارێك نینۆکی نەمابێت ئەوە درووستە و بەڵگەی لەسەر لە فەرموودەدا، کاتیك پێغەمبەر ﷺ بەو کەسەی کە لووتی لە جەنگێکدا دەپێکرێت فەرمانی پێ دەکات بە ئاڵتوون چاکی بکات و ڕێکی بکاتەوە لەبەر ئەوەی حاڵەتیکی ناچاری بووە.

دووەم: ئەوەیە بەبی هیچ هۆکارێکی ناچاری ئەو کارە بکات و تەنها بە مەبەستی جوانکاری بیت ئەوەیان دروست نییە و فەرموویانە دەچیتە بابی گۆڕینی درووستکراوی الله تعالی و بەر لە عنەتەکە دەکەوێت.

٢- شەرع داوای لە ئافرەت کردووە قژی بهێڵێتەوەو حەرامی کردووە بیتاشێت، مەگەر بۆ حاڵەتێکی پێویست وناچاری نەبێت، وەکو ئەوەی نەتوانێت بایەخی پێویستی بدات و نەتوانێت بەئەرکی خاوێن ڕاگرتنی هەڵبسێت، لەو حاڵەتەدا دەکرێت کورتی بکاتەوە، ئەویش بە مەرجێك مەبەستی تەقلید و خۆچواندن نەبێت بە ئافرەتانی ناموسوڵمان.

هەروەها حەرامە ئافرەت قژی تر بخاتە سەر قژی خۆی، ئەوەی کە پێی دەوترێت (ئێکستێنشن)، چونکە پێغەمبەر ﷺ وەکو لە هەردوو صحیح (لعن الله الواصلة والمستوصلة).

ی بوخاری وموسلیمدا هاتووە، فەرموویەتی: الواصلة: مەبەست لەو ئافرەتەیە قژی ئافرەتی تر دەداتە دەم قژی خۆیەوە کە وەکو قژی خۆی دەربکەوێت.

المستوصلة: ئەو کەسەیە کە ئەو کارەی بۆ دەکرێت. هەندێ لە زانایان باروکەش ئەگەرچی قژێکی دەستکردە بەڵام زۆرێك لە

زانایان بە حەرامیان زانیوە وڕێگەیان نەداوە بەکار بێت، مەگەر بۆ حاڵەتێکی ناچاری وەکو ئەوەی ئافرەتێك قژی وەریبێت یان لەبەر هەر هۆکارێك قژی پێوە نەمابێت ئەوە ڕێگە پێدراوە، هەندیکیش لە زانا گەورەکان بە هەندی مەرجەوە ڕێگەیان بە باروکە داوە و بە مکروە یان زانیوە و خیلافێك لەسەر ئەم مەسەلە هەیە، بەڵام بێگومان نەکردنی بۆ سەلامەتی دین باشترە، جگە لە ناچاری نەبێت، دانانی برۆی دەستکردیش وەکو زۆر لە زانایان فەرمویانە هەمان حوکمی زیادکردنی قژی هەیە بۆ سەر قژی ئافرەت و درووست نییە ئەنجام بدرێت، مەسەلەیەکی تری گرنگیش لەم بارەوە ئەوەیە، سەرتاشینی ئافرەت قەدەغەیە و حەرامە، لە فەرموودەدا هاتووە: (نهى رسول الله ﷺ أن تحلق المرأة شعرها)، زانایان فەرموویانە لە ڕووی هەیبەت و جوانییەوە، قژی درێژ بۆ ئافرەتان، وەکو ڕیشە بۆ پیاوان.

٣- هەروەها حەرامە ئافرەتان برۆیان، یان بەشێك لە برۆیان، بە تاشین بێت یان بەهەر ڕێگەیەکی تر هەڵگرن و لای بدەن، چونکە لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: (لعن ﷺ النامصه و المتنمصة). النامصة: ئەو کەسەیە کە هەلدەسێت بەلابردن یان هەلگرتنی برۆ ، یان بەشێك لەبرۆ بە مەبەستی جوانکاری. المتنمصه: ئەو کەسەیە کە ئەو کارەی بۆ دەکرێت.

چونکە ئەو کارە دەچێتە بابەتی گۆڕینی درووستکراوی الله عزوجل کە فەرموویەتی: ﴿وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ﴾[1]

لەم بارەوە هەندێك لە زانایان فەرموویانە ئەگەر برۆی ئافرەت بە شێوەیەکی نائاسایی درێژ و ناشیرین بوو، دەتوانێت کورت وڕێکی بکاتەوە بۆ ئاستی ئاسایی، بە تاشین بێت یان بە مەقەس، نەك بە هەڵگرتن و هەڵکێشان، چونکە ئەوە (نمص)ە ودرووست نییە.

مەسەلەیەکی تریش هەیە پەیوەندیدار بەم باسەوە، ئەویش تاتۆی برۆیە، کە بە مەوادی کیمیاوی ئەنجام بدرێت، ئەوەشیان زانایان باسیان کردووە و فەرموویانە، هەرچەند ئەو کارە بەدەرزی ئەنجام نادرێت، بەڵام هەمان حوکمی تاتۆی هەیە و حەرامە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لعن الله الواصلة والمستوصلة والواشمة والمستوشمة)[2].

بەڵام ئەگەر بە کل و خەنە، بە شێوەیەکی کاتی دەستکاری بکات و ڕێکی بخات، بێ ئەوەی بۆ پیاوی نامەحرەم نمایشی بکات، ئەوەیان درووستە وحەرام نییە.

---

[1] - النساء:١١٩.

[2] - رواه البخاري ومسلم.

٤- دەستکاری کردنی دانەکان بەوەی کە لە شەرعدا (تفليج)ی پێ دەوترێت حەرامە، درووست نییە بە مەبەستی جوانکاری و بێ ئەوەی دانەکان هیچ عەیبێکیان هەبێت، بۆشاییەك لە نێوان دانەکاندا درووست بکرێت یان دەستکاری لەو شێوە، بەڵام وەکو زانایان فەرموویانە ئەگەر دانەکان لاری و خوارییەکی تێدا بوو، کە ناشیرینی کردبوو، بە شێوەیەکی سەرنج راکێش، یان ئازار و کێشەیەکی تەندروستی بۆ خاوەنەکەی دروستکردبوو، پێویستی بە ڕاستکردنەوە هەبوو، لەو حاڵەتەدا درووستە ئەو ڕاستکردنەوە بکات چونکە ئەوە چارەسەرە و جوانکاری زیادە نییە.

سەبارەت بە سپیکردنەوەی دانەکان، ئەگەر زەرد بووبێت، یان کلس و پیسی گرتبێتی، درووستە و ڕێگرێکی شەرعی نییە لە سپیکردنەوەی، لە هەندێ فەرموودەشدا وەکو: (السواك مطهرة للفم) پێشەوا النووي یەکێك لە هۆکارەکانی بەکارهێنانی سیواکی بەوە داناوە کە ئەگەر دانەکان زەردبێتەوە.

٥- حەرامە ئافرەت خاڵ (تاتۆ) ی لە هەر شوێنێکی جەستەیدا بۆ درووست بکرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی لەو کەسە کردووە ئەو کارە بکات: (لعن الواشمة والمستوشمة)

الواشمة: ئەو کەسەیە کە کوتانەکە دەکات.

المستوشمة: ئەو کەسەیە کە بۆ دەکوترێت.

لەبەر ئەوەش کە نەفرەت لە ئەنجامدەری ئەم کارە کراوە، بۆیە زانایان فەرموویانە تاوانێکە لە تاوانە گەورەو کەبیرەکان.

ئەوانەی پێش ئەوەی بزانن تاتۆ حەرامە، یان زانیویانە و وەکو سەرپێچی ئەنجامیان داوە، وەکو زانایان دەفەرموون دەتوانن تەوبە بکەن و جارێکی تر ئەو کارە ئەنجام نەدەن.

سەبارەت بە تاتۆی کاتی ئەوەی کە بۆ ماوەی شەش مانگ یان ساڵێك دەمێنیتەوە، ئەوەش - وەکو شیخ عبدالله بن جبرین - دەڵێت حەرامە و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ دوو جۆرەکەی تردا نییە کە بەدەرزی، یان بە مەوادی کیمیاوی ئەنجام دەدرێت، چونکە دوای شەش مانگەکە دووبارەی دەکاتەوەو هەمان مەبەست دەپێکێت.

بەڵام هەندی لە زانا هاوچەرخەکان - وەکو محمد صالح المنجد - ئەو جۆرە تانۆیە بە درووتسو ڕیگە پێدراو دەزانن بەڵام بە حەوت مەرج:

یەکەم- تاتۆکە کات بیت و هەمیشەیی نەبێت.

دووەم- ئەو نەخشانەی درووست دەکرێت نەخشی گیاندار نەبێت.

سێیەم- ئەو جوانکارییە پیاوی نامەحرەم نەیبینێت.

چوارەم- ئەو ڕەنگ و بۆیانە زیانی بۆ کەسەکە نەبێت.

پێنجەم- تەقلید و خۆچواندنی بۆ ئافرەتە ڕەوشت خراپ و بێ دینەکان تێدا نەبێت.

شەشەم- نەخشەکان دەربڕین نەبێت لە دروشمگەلێك دین و عەقیدەی نادرووست و گومڕا بەمەزن رابگرێت.

حەوتەم- ئەو کەسەی بۆی درووست دەکات ئافرەت بێت و لە جێگای عەورەتیشدا درووستی نەکات.

٦- درووستە بۆ ئافرەت خەنە بۆ دەست و پێی بەکار بهێنێت و فەرموودەی لەسەر هاتووە، بەڵام ئەگەرچی درووستە و کارێکی شەرعییە ئافرەت خەنە لە دەستی بدات و بۆ جوانکاری خۆی بەکاری بهێنیت، بەڵام حەرامە دەستی بەخەنەوە بۆ پیاوانی نا مەحرەم دەریخات، چونکە ئەوە فەرمانی الله تعالى دەیگرێتەوە کە بەشێکە لەو جوانییەی دەبێت بشاردرێتەوە، الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾[١]

هەروەها دەتوانێت بۆ گۆڕینی قژی سپی خەنە یان مادەی تر بەکاربهێنێت.

دەربارەی ڕەنگ کردنی قژ بە رەنگی رەش، خیلافێکی لە نێوان زانایاندا لەسەرە بۆ پیاوان، بە هۆی لاوازکردنی بەشێك لە فەرموودەناسان بۆ وشەی (وجنبوه السواد) و هەروەها تضعیف کردنی فەرموودەیەکی تر کە نەهی لە ڕەنگ کردنی قژ بە ڕەش دەکات لەلاین فەرموودەناسانەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی جیگیر بووە هەندی لە هاوەڵان قژیان بەرەش ڕەنگ کردووە، بەڵام وەکو مصطفى العدوي دەڵێت ئەو خیلافە بۆ پیاوانە و باشترە بۆ دەرچوون لەو خیلافە بە رەنگی ڕەش قژو ڕیشیان بۆیاغ نەکەن، بەڵام ئەو حوکمە بۆ ئافرەتان نییە و ئەوان دەتوانن ڕەنگی ڕەش و هەر ڕەنگێکی تر بەکار بهێنن و ئەو کارە درووستە بۆیان بە مەرجێك بۆ نمایش کردن نەبێت بۆ پیاوانی نامەحرەم..

---

[١] - النور:٣١.

٧- درووستە بۆ ئافرەتان بە مەبەستی خۆ جوانکردنەوە ئاڵتوون، و زیو بەکار بهێنن، لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە الترمذي دەیگێڕێتەوە: (حرم لباس الحرير والذهب على ذكور أمتي وأحل لإناثهم). واتە: واتە لەبەر کردن و پۆشینی ئاورێشم و زێڕ قەدەغەیە لەسەر پیاوانی ئومەتم و ڕێگەپێدراوە بۆ ئافرەتەکانی. بەڵام درووست نییە ئەو خشڵ و زێڕە نیشانی پیاوانی نامەحرەم بدەن، بەڵکو دەبێت بیشارێتەوە، بە تایبەت ئەو کاتەی لە ماڵ دەردەچێت، چونکە ئەوە جۆرێکە لە فیتنە و ڕاکێشانی سەرنجی پیاوان. الله عزوجل لە قورئان ئەو کارەی قەدەغە کردووە لەسەر ئافرەتان کە بهێڵن دەنگی ئەو خشڵ و زێڕەی بەکاری دەهێنن بگاتە پیاوان و بیبیسن، ﴿وَ لا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ ما يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ﴾[١]

[١]- النور:٣١.

# پەیامی سێزدە: سێ پەیامی گرنگ لە مەسەلەی هاوسەرگیریدا

١- پەیامی یەکەمم بۆ باوکان ودایکان و سەرپەرشتیارانی ئاقرەت و کچەکانە، ڕاستە بۆ مەسەلەی زەواج هەندێ لە زانایان باسی کەفائەت و هاوتابوونی کچ و کوڕیان لە هەندێ ڕوانگەوە کردووە، بەڵام بەدڵنیایی ، کەسی دیندار هاوتای کچەکەتانە ئەگەر هەژاریش بێت، یان خێزان و بنەماڵەکەی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئاستیان لە ئاستی ئێوە کەمتر بێت! بۆچوونی پەسەند ئەوەیە تەنها دین پێوەری کەفائەتە.

ئەگەر کەسێك دیندار و خاوەن ڕەوشتی بەرز و جوان بێتە خوازبێنی کچەکەتان، لەبەر هەژاری ڕەتیمەکەنەوە، لەبەر حەزی پێگەو پلەو پایە و هەندێ ئیعتیباراتی کۆمەڵایەتی دەست بەڕوویەوە مەنێن، دینداری لەم سەردەمەدا گەنجینەیەکی زۆر بەنرخە، ئەگەر کەسی لەو شێوە ڕووی تێکردن سوپاسی الله بکەن و دڵتان پێی خۆش بێت، چونکە کەسی دیندار ئەگەر بەڕاستەوە دیندار بێت، کچەکەتان دەپارێزیت، خۆشی بوێت ڕێیی لێ دەگرێت، تەنانەت ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان حەزیشی لێ نەکات و لەبەر چاوی بکەوێت مەحاڵە زوڵمی لێ بکات، چونکە دینەکەی لە ستەم کردن دەیگێڕێتەوە.

زانایان دەفەرموون سەرپەرشتیارانی کچ و وەلی ئەمرەکانیان، دەبێت لەمەسەلەی بەشوودانی کچەکانیاندا بە ئەمانەت و هەستی بەرپرسیارێتییەوە مامەڵە بکەن، چی بڕیارێك لە بەرژەوەندی دونیا و دواڕۆژی کچەکانیانە ئەو بڕیارە بدەن، بۆیە ڕوویان تێدەکەم و پێیان دەڵێم:

- ئەگەر زانیتان کچەکەتان بەو کەسە ڕازییە و دینەکەی بەلاوە گرنگە و کردوویەتی بە پێوەر بۆ هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی، ئەوە نیشانەی دینداری و ژیری ئەوەو هەڵبژاردنەکەی ڕاست و درووستە، ئێوە مەبنە ڕێگر لە بەردەمیدا، ئەو کچە ئەمانەتێکی گەورەیە لە ئەستۆتاندا ، جوانترین هەڵسان بە جێبەجێکردنی مافی لەسەرتان ئەوەیە هاوکار بن لەوەی لە ژیانێکی پاك وپاراوی دیندارانەدا بگیرسێتەوە، ئەو ئامانجەش نە بەدەوڵەمەندی و نە بە بڕوانامەی بەرز و نە بە پێگەی کۆمەڵایەتی بێ ئەوەی دینیان لەگەڵدا بێت درووست نابێت، بەڵکو تەنها و تەنها بە کەسێکی دیندار و خاوەن ڕەوشتی جوان و پەروەردەیەکی موسوڵمانانە دێتەدی.

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ)[١]. واتە: ئەگەر کەسێك هاتە خوازبێنی کچێك یان ئافرەتێك کە ئێوە سەرپەرشتیاری بن، دین و ڕەوشتی ئەو کەسەتان بەدڵ بوو و کەسێکی بەدین و ئاکار جوان بوو، ئەوا کچەکەتانی پێ بدەن، ئەگەر وا نەکەن و بڵێن نایدەین بە شوو بە کەسێکی پارەدار و خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی نەبێت، ئەوا چاوەڕوانی درووست بوونی فیتنە و خراپەیەکی بەرفراوان بن. لەو فەرمودەشدا دەردەکەوێت هاوتابوون تەنها لە مەسەلەی دیندا حیسابی بۆ دەکرێت نەك لە مەسەلەی تردا.

لە ڕاستیدا ئەم سەردەمەی تێیکەوتووین، سەردەمێکی زۆر خراپە و تاوان و خراپە بە جۆرێك ئاسان کراوە و خراوەتە بەردەستی خەلکی، پێکەوەنانی خێزانێکی موسوڵمان بووە بە کارێکی ئەستەم و ئاواتێکی گران، بۆیە کاتێك کچەکەتان بە کوڕێکی ديندار دەدەن، ئێوە بەو کارەتان دونیاو دواڕۆژی کچەکەتان دەپارێزن و بەشداریش دەبن لە پاداشتی درووست بوونی خێزانێکی وابەستە بە ئیسلامەوە، کە بەهۆی ئەوەی دەست بەدین و ڕەوشتی جوانەوە دەگرن، لەوانەیە ببنە جێگای ڕەزامەندی الله عزوجل لێیان و بۆ خۆیشیان سەرفراز ببن و بۆ ئێوەش ببنە خێرو پاداشتێکی نەبڕاوە، تەنانەت بۆ دوای مردنتءان، بە پێچەوانەشەوە، لەوانەیە دلتان بەکەسێکی پارەدار و خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی خۆش بێت و وا بزانن

[١] - الترمذي (١٠٨٤)، وابن ماجة (١٩٦٧)

ئەو کەسە کچەکەتان بەختەروەر دەکات، بەڵام بەهۆی دووربوونی لە دینی ڕاستەقینە و ڕەوشتی جوان، یان هیچ تەنانەت بەهۆی دین لاوازی و گوینەدانی بە سنوورەکانی شەرع و بە عیبادەتەکانی، ببێتە مایەی بەدبەختی کچەکەتان ودین ودونیاشی لی تیك بدات و خێزانێکی بێ سەروبەر دروست بکەن کە لافاوی جاهیلییەتی ئەم سەردەمە بیانبات و ڕایانماڵێت.

- سەرپەرشتیار ئەگەرچی پێویستە لەسەری پێوەری دین پێش بخات، بەڵام هاوکات پێویستیشە لەسەری بەخۆی بەدواداچوون بۆ ئەو ئەو کەسەی هاتووە بۆ خوازبێنی کچەکەی بە وردی ئەنجام بدات و دڵنیا بێتەوە لەوەی کە کەسێکی دیندارە و پێش هەموو شتیکیش نوێژی ئیستیخارە بکات.

٢- پەیامی دووەم بۆ ئەو کچ و ئافرەتانەیە کە بە نیازی هاوسەرگیرین وچاوەڕوانی کەسی شایستەو گونجاو دەکەن:

- پێویستە بژاردەی دوعا هەمیشە لەبیر نەکەن و بپارێنەوە کە الله تعالى کارتان ئاسان بکات و ئەوەی خێر و چاکەتانی تێدایە بۆتانی ئەنجام بدات.

- ئەگەر کەسێکتان بەدڵ بوو و لە ڕووی خەسڵەت و سیفەتە دینی و ڕەوشتییەکانەوە پێی ڕازی بوون، بە هیچ شێوەیەك ڕێگە بەخۆتان مەدەن بەو بیانووە پەیوەندییان لە دەرەوەی پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵدا ببەستن، یا بە نیەتی هاوسەرگیریش بێت، چونکە ئەوە ڕێگایەکی مەترسیدارە وشەیتان فێڵ و تەڵەکەی بۆ ئەو بابەتە گەلێك زۆرە، بەتایبەتی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و لە

زانكۆكاندا كە سنوورەكانی شەرع و حەڵاڵ و حەرام نەك كاڵ بووەتەوە، بەڵكو بەتەواوی سڕاوەتەوە و خەریكی بوونی نامێنیت، تاكە ڕێگایەك بۆ ئەو مەبەستە شەرعییە، گرتنەبەری ڕێگەی شەرعی خوازبێنییە لە وەلی ئەمر و سەرپەرشتیارانی خوازبێنی كراوەكە.

- بۆ حاڵەتێك كە پێوەرە شەرعییەكان پارێزراو بێت و هیچ فیتنەیەك لە ئارادا نەبێت، ئەگەر بەرژەوەندییەكی دینی ئاشكرا ببینرێت بۆ لەوەی خۆت پێشنیار بكەیتە سەر كەسێكی دیندار و خاوەن ئاكاری جواندا، درووستە ئەو كارە بكەیت، پێشەوا بوخاری لە سەحیحەكەیدا بابێكی داناوە بەناوی: (باب عرض المرأة نفسها على الرجل الصالح) و دوو فەرموودەی لەسەری هێناوەتەوە، الحافظ ابن حجر بە هەمان شێوە لە (فتح الباري) دا وتوویەتی: (وفي الحديثين: جواز عرض المرأة نفسها على الرجل، وتعريفه رغبتها فيه، وأن لا غضاضة عليها في ذلك).

بەڵام هاوكات ئەو كارە پاساو نییە بۆ یەكتر بینین و چاوپێكەوتن و پێكەوە قسەكردن بەو بیانووەوە، چونكە ئەگەرچی ئەو مەسەلە لەبەر ئامانجێكی گەورە و چارەنووسساز لە سنوورێكدا ڕێگە پێدراوە، بەڵام ئەوە پاساو نییە بۆ ئەنجامدانی هیچ كارێكی حەرام وبەزاندنی سنوورەكانی شەرع، وەكو یەكتر بینین و پێكەوە دانیشتن و ئاڵوگۆڕی بیروبۆچوون و ئاخاوتن. بە تایبەتی لە زانكۆ

و شوینه هاوشێوەکاندا، که ئەمڕۆ سنووری دین و ئاکار بەڕوونی دەشکێنرێت، کچ و کوری موسولمان و وابەستە بوو بەشەرعەوە دەبێت خۆیان لەو کەشە نا وابەستە بووە بە ئیسلامەوە جیا بکەنەوە و نموونەیەکی جوان و پاك و پاراو بن بۆ دینداری، نەك ئەوانیش بەناو دینەوە هەروەکو بێ ئاگا و دوور له دینەکان مامەڵە بکەن. بۆیە زانایان جەختیان لەوە کردووەتەوە ئەو جۆرە مەسەلانە نابێت کاتەکەی درێژ بێتەوە و چاوەروانی زۆری تیدا بێ، بەڵکو گەر ئەو کوڕە بەنیازی خوازبێنی بێت، دەبێت هەنگاوی کردەیی بنێت و نەبێتە مایەی چاوەڕوانی زۆر بۆ ئەو کچە که لەوانەیە هەندیك جار بەزیانێکی زۆری تەواو بێ.

- ئەگەر کەسێکی دیندارت بەو شێوە وێنا کرد که ئەتوانن پێکەوە خێزانێکی موسوڵمان پێکەوە پێك بهینن ودواتر لەبەر درووست بوونی هەر بەربەستێك لەلایەن ئەو یان کەس وکاری تۆ درووست بوو، نابێت هەر سوور بیت لەسەری و وا بزانیت بەختەەری تۆ تەنها لەگەڵ ئەو کەسەدایە، بەڵکو دەبێت وازی لێ بهینیت و داوا له الله تعالی بکەیت به کەسێکی باشتر قەرەبووت بکاتەوە والله تعالی خۆی نەبێت کەس نازانێت خێر بەچ شتیك و به چ کەسێکەوەیە.

- وەکو چۆن بە سەرپەرشتیارەکەم وتی پێویستە دین بکاتە پێوەر بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر بۆت، بەهەمان شێوە بە تۆیش دەڵێم: پێویستە بۆ هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانت، دینداری و ڕەوشت بەرزی و بەهێزی کەسایەتی و هەبوونی خەسڵەتی جوان تێدا، بکەیتە پێوەری ڕازیبوون و هەڵبژاردنی هاوسەر و لەسەر ئەو بنەمایە بڕیار بدەیت، ئەگەر وا بکەیت هەرگیز پەشیمان نابیتەوە إن شاء الله.

- ڕازی بوون و نەبوون نیشان مەدە ، پێش ئەوەی دوو ڕکات نوێژی ئیستیخارە نەکەیت بەو شێوەی کە لە شەرعدا هاتووە. چونکە بەو کارەت خۆت ڕادەستی قەدەری پەروەدگارت دەکەیت وداوا دەکەیت کامە باشترە و زیاتر چکی دین و دونیاتی تێدایە، الله عزوجل ئەوەت بۆ بکات.

٣- پەیامی سێیەمم بۆ کەسی خوازبێنیکارە:

* پێویستە یەکەم پێوەر بیخەیەتە بەرچاوی خۆت پێش ئەوەی بچیتە داوای هەرکچێك، فەرموودەی پێغەمبەر بێت ﷺ: (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ : لِمَالِهَا ، وَلِحَسَبِهَا ، وَلِجَمَالِهَا ، وَلِدِينِهَا ، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ )[1] واتە: ئافرەت لەبەر چوار هۆکار خوازبێنی دەکرێت: لەبەر دەوڵەمەندی وخانەوادەی ناودار وجوانی و دینداری، جا تۆ دیندارەکە بەدەست بهێنە با سەرفراز بیت.

[1] - رواه البخاري (٤٨٠٢) ومسلم (١٤٦٦) .

* ئەگەر لەم ڕۆژگارەدا کچێکی پەروەردکراوت لەسەر ئیسلام و ئاکاری جوان دەست بکەوێت، بڵێ لە هەموو ژیانمدا تووشی گەورەترین خێر وخۆشی بوومە، بەڵکو لەبەر ئەوەی چاوەڕوان کراوە ببێتە دایکێکی پاك و باش بۆ منداڵەکانت، کەواتە ئومێد هەیە ئەو هاوسەرگیرییە ببێتە مایەی بەختەوەری دنیا و سەرفرازی دواڕۆژیش بۆ خێزانیك و بنەماڵەیەك لە داهاتوودا.

* هەڵبژاردنی کچی باش و خانەوادەی باش، ڕەهەندی زۆر دوور مەودا و گەورەو گرانی هەیە بۆداهاتووی ژیانت، ئافرەتی باش لە ماڵی باشدا پەروەردە بووە و گرنگە باپیرو خاڵی منداڵت کەسانی یاڵح و چاك بن. ئافرەتی دیندار چاکترین خۆشییەکانی ئەم دونیایەیە، لە پاش تەقوای پەروەردگاریش هیچ نیعمەتووك نییە بگاتە نیعمەتی ئافرەتێکی دینداردا، چونکە جگە لەوەی چاوەڕوانکراوە ژیانت بەختەوەر بکات، یارمەتیدەریشت دەبێت بۆ کارکردن بۆ دواڕۆژ وبەدەستهێنانی بەهەشت و ڕزگار بوون لە دۆزەخ.

* هەڵبژاردنی دیندار مەعنای ئەوە نییە لایەنەکانی تر وەکو جوانی و کەسایەتی و خەسڵەتی جوان و هاوتابوونی بواری تر ئەگەر بکرێت و بگونجێت پشت گوێ بخەیت، بەڵکو تەنها مەبەست ئەوەیە ئەوە بزانیت کە دینداری لە تەراووی ئیسلامدا لە هەموو خەسڵەتێکی تر لە پێشترە وقورسترە وجوانی و دەولەمەندی و بڕوانامەی بەرز و پێگەی کۆمەڵایەتی هەمووی ئەگەر دینداری لەگەڵدا نەبێت لە تەرازووی ئیسلامدا هیچ بایەخێکی نییە و نابێت خوازبینیکار و خوازبێنیکراو و وەلی ئەمرەکانیش حیسابی بۆ بکەن بێ ئەوەی دینی لەگەڵدا بێت، خۆ ئەگەر ئەو کچە یان ئەو کورە دیندار بێت و لەگەڵ ئەوەشدا سیفەتەکانی تریشی تێدا بێت ئەوە وەکو عەرەب دەڵێن: نور علی نور، ئەگەرنا پێوەری دین بەتەنها خۆی لە سەرووی هەموو پێوەرەکانی ترەوەیە..

* لە فەرموودەی سەحیحدا دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ هانی جابیری کوڕی عبدالله ی داوە کە کچێکی عازەب بهێنێت، بۆیە ئەوە لە پێشە، بەڵام ئەگەر بەرژەوەندییەکی شەرعی لە پێچەوانەی ئەوەدا هەبوو، ئەوا مارەکردنی بێوەژن باشترە، بۆ نموونە نیەتی پاراستن و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی و بەخێوکردنی ئەو بێوژنە، بەتایبەتیش ئەگەر نزیکییەك هەبێت و منداڵی بچووکی هەبێت و بەنیەتی خێرو پەروەردەکردنیان ئەو ئافرەتە مارە بکات، بۆیە هەندێ جار بێوەژنێکی دیندار، دەکرێت لە کچێك بۆ ئەو کەسە باشتر بێت، ئەوە بنەمایەکی کارپێکراوە لە ئیسلامدا.

* تا پێت دەکرێت کەسی زۆر نزیك و خزمی زۆر نزیك مارە مەکە، بەڵام ئەم مەسەلە بەرەهایی نییە و مەرج نییە هەموو جارێك خێرو چاکە لەوەدا بێت کچێکی دوور مارە بکەیت، بەڵام زانایان زۆر جەختیان لەسەر ئەو مەسەلە کردووەتەوەو سەرەڕای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فاتیمەی کچی لە عەلی ئامۆزای مارە کردوە الله لێیان ڕازی بیت، زانایان لەو کارە وا تینەگەیشتوون کە ئەوە سونەت بێت، بەڵکو زۆر جار هەر ئەو بنەمایەیان بڕیار داوە کە لە هاوسەرگیریدا دور بکەویتەوە باشترە، مەسەلەکەش هەندێك شیکردنەوە هەلدەگرێت ئێرە جێگای نییە.

* سەبارەت بەم مەسەلە گرنگە هەنگاوێك مەکە بە دوو، پێش ئەوەی نوێژی ئیستیخارە بکەیت بەو شێوەی کە لە سونەتدا هاتووە. چونکە بەو کارەت خۆت ڕادەستی قەدەری پەورەدگارت دەکەیت وداوا دەکەیت کامە باشترە الله عزوجل ئەوەت بۆ بکات.

# پەیامی چواردە: مافەکانی پیاو لەسەر خێزانی

هاوسەران مافیان بەسەر یەکەوە هەیە و پێویستە پارێزگاری بەجێگەیاندنی ئەو مافانە بکەن، لە ڕاستیدا دەقەکانی قورئان و سوننەتیش بە ڕاشکاوی ئەوەمان پێ دەڵێن کە مافەکانی مێرد بە سەر هاوسەرەکەیدا گەورەترە و زیاتر جەختی لەسەر کراوەتەوە بەراورد بە مافەکانی ئافرەت بەسەر مێردەکەیەوە، ئەوەش ئەگەرچی حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە، بەڵام بەرەهایی نییە و پێوەر و مەرجی خۆی هەیە. ئەمەی خوارەوە مافە سەرەکییەکانی پیاوە لەسەر هاوسەرەکەی بە کورتی، بەڵام وردەکاریەکانی لە کتێبەکانی فیقهدا بەبەڵگەکانییەوە باس کراون:

١- مافی گوێڕایەڵیکردن: پێویستە ئافرەت گوێڕایەڵیی مێردکەی بکات، لە هەموو فەرمان و ئامۆژگاری و داواکارییەکدا کە پێچەوانەی شەرع نەبێت نابێت قسەی بشکێنیت. الله تعالى فەرموویەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾[1] ئەو قەوامییەتەی کە الله تعالى کردوویەتی بە تایبەتمەندی پیاوان، بە بێ گوێڕایەڵی ئافرەتان بۆیان جێبەجێ نابێت. هەر لەو ئایەتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت کە ئافرەتی چاك و ساڵحان ئەو ئافرەتەیە کە گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت وئافرەتی خراپیش ئەوەیە کە لە چاکەدا بە قسەی ناکات،

(١) - النساء: ٣٤.

چونکە الله عزوجل فەرموویەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ﴾[1] بۆیە هەرگیز سیفەتی چاکی و ساڵح بون بە ئافرەتێك ناوترێ گەر گوێڕایەڵی پیاوەکەی نەبێت.

٢- بەڵام ئەو گوێڕایەڵییەی کە مافی پیاوە لە سەر خێزانەکەی پێویستە لە مەعروف و لە بازنەی ڕەزامەندی الله و پێغەمبەرەکەیدا بێت ﷺ نەك پێچەوانەی ئەوەو فەرمان بە خراپە و هەر کارێکی ناشەرعی، ئەگەر فەرمانی بەخراپە و بەوەی کە الله پێی رازی نابێت پێکرد، بۆ نموونە پێی وت نوێژ وڕۆژووی فەرز ئەنجام مەدە، خۆت دامەپۆشە لە نامەحرەم، لەگەڵ فلانە تەوژم و تاقمدا کار بکە کە بەرنامەیان ناکۆکە لەگەڵ عەقیدەی ئیسلامیدا، ببە بێژەر لە کەناڵێکدا، لە فلانە ڕیکخراو کار بکە کە ژنان و پیاوان تیکەڵ دەبن و بەرنامەشیان دوورە لە ەنهەجی ئەهلی سونەت، یان هەر داواکارییەك کە ناشەرعییە و پێچەوانەی کیتاب و سوننەتە، ئەوە ئافرەتە نابێت گوێڕابەڵی بکات و پێویستە بە ڕێزو بە قسەی خۆش قەناعەتی پێبکات کە ئەوکارە درووست نییە بکرێت، ئەگەریش هەر قەناعەتی نەکرد، ئەو هەر دەبیت سوور بێت لەسەر ئەنجام نەدانی، چونکە: (لا طاعة لبشر في معصية الله، إنما الطاعة في المعروف)[2].

---

[1] - النساء:٣٤.

[2] - رواه البخاري ومسلم

٣- واجبه لەسەر ئافرەت گوێڕایەڵی مێردەکەی بکات هەرکات بۆ کارو پێویستی شەرعی خۆی بانگی کرد، ئەگەر گوێڕایەڵی نەکرد، ئەوا تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە، مەگەر پاساوێکی شەرعی هەبێت وەکو نەخۆشی و نەتوانین، چونکە ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾[1].. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فأبت فبات غضبان عليها لعنتها الملائكة حتى تصبح)[2] . واتە: ئەگەر پیاوێك هاوسەرەکەی بۆ سەر جێگەکەی بانگ بکات و ئەو ڕازی نەبێت و بەهۆیەوە مێردەکەی زویر بکات، مەلائیکەتەکان تاکو بەیانی نەفرەتی لێ دەکەن.

٤- واجبه لەسەر ئافرەت گوێڕایەڵی پیاوەکەی بێت لەوەی کە ڕێگە بە هیچ کەسێك نەدات بێتە ماڵەکەی ئەگەر ئەو پێی خۆش نەبێت، هەروەها ڕۆژووی نافیلە واتە جگە لە ڕەمەزان نابێت بگرێت بە ئیزن و ڕێگە پێدانی ئەو نەبێت، رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (لا يحل للمرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا بإذنه ، ولا تأذن في بيته إلا بإذنه)[3].

(١) - البقرة: ٢٨٦

(٢) - رواه البخاري ( ٣٠٦٥ ) ومسلم(١٤٣٦ )

(٣) - رواه البخاري ( ٤٨٩٩ ) ومسلم ( ١٠٢٦ ) .

٥- پاراستنی نهێنی لە نێوان تەواوی موسوڵمانان‌دا واجبە و ئایەت و فەرموودەکان لە سەری کۆکن و زۆرن، جا پاراستنی نهێنی لە نێوان هاوسەراندا ئەوە مەسەلەیەکی گرنگترە و زیاتر جەختی لەسەر کراوەتەوە، چونکە ژیانی هاوسەرگیری بە زۆر بەرزایی و نزمایی و دۆڵ و نشێودا تێدەپەڕێت، واجبە لەسەر ئافرەت - وەکو واجبیشە لەسەر پیاوان - نهێنی ناوماڵەکانیان بپارێزن، بەتایبەتیش ئەم داواکارییە ڕوو دەکاتە ئافرەت، چونکە ئەوان بەوە ناسراون لەگەڵ هاوڕێ و کەس و کاردا باسی زۆر پرسی درووست و هەندێ جار نادروست و گوناهیش دەکەن، بۆیە دەبێت ئافرەت لەوە تێبگات دەرکردنی نهێنییەکانی ناو ماڵی خۆی و باس کردنی مێردەکەی بەوەی کە پێی ناخۆشە لە دەرەوەی مالەکەی خۆی، ئەوە کارێکی حەرام و قەدەغەیە وجۆرێکە لە خیانەت لە و ناپاکی بەرانبەر ئەو هاوسەرە: الله تعالی ڕقی لەوانەیە کە خیانەت دەکەن و نهێنی ماڵەکانیان ناپارێزن. ﴿إِن اللهَ لا يُحِب الْخَائِنِينَ﴾[1]. لە فەرموودەدا هاتووە ئەگەر کەسێك قسەیەك لەلای کەسێکی تر بکات و سەیری ئەملاو ئەو لای خۆی بکاتە بەوە واجب دەبێت ئەو قسە بپارێزرێت و وەکو نهێنی تەماشا بکرێت، بەڵام ئەو قسە و کرداردارانەی پیاو لەناو ماڵی خۆیدا ئەنجامیان دەدا دەبێت هاوسەرەکەی هەموی بپارێزیت و نەچێت لەماڵی باوك وبرا و هاوڕێ و دراوسێ باسیان بکات، چونکە ئەوە خیانەتە.

---

[1] - الأنفال: ٥٨

یەکێکیش لە خراپترین شێوازەکانی دەرکردنی نهێنی ئەوەیە باسی سەرجێیی و کاری تایبەتی خۆیان بۆ کەسانی تر باس بکەن: (إن من أشر الناس عند الله منزلة يوم القيامة الرجل يفضي إلى امرأته وتفضي إليه ثم ينشر سرها)[١]. هەروەها هەموو قسە و باس و کێشە ورِوداو وبەسەرهاتێك كە لە ژیانی رِۆژانەدا روودەدات و دەرکردنی زیانی هەبێت، یان یەکێك لە هاوسەران پێیان ناخۆش بێت، هەموو ئەوە حەرامە و دەبێتە جۆرێك لە خیانەت کردن بەرانبەر بە هاوسەرەکەی.

٦- واجبە لەسەر ئافرەت لە ماڵی خۆی دەرنەچێت بەبێ ئەوەی داوای ئیزنی دەرچوون و مۆڵەت لە مێردەکەی نەکات، تەنانەت ئەگەر باوکیشی نەخۆش بێت نابێت بەبێ داوای مۆڵەتی هاوسەرەکەی سەردانی باوکی بکات، چونکە وەکو زانایان فەرموویانە تاعەت و گوێڕایەڵی میرد لەسەر ئافرەت واجبە و ئەو سەردانە سوننەتە.

(١) - رواه مسلم

٧- مافی پیاوه بەسەر خێزانەکەی کە خزمەتی بکات، وەکو چۆن واجبی پیاویشه هەڵسێت بەدابین کردنی پێویستییە سەرەکییەکانی ژیانی هاوسەرەکەی، شیخ الإسلام ابن تیمیة فەرموویەتی: (وتجب خدمة زوجها بالمعروف من مثلها لمثله ويتنوع ذلك بتنوع الأحوال فخدمة البدوية ليست كخدمة القروية وخدمة القوية ليست كخدمة الضعيفة)[١] واته: ئافرەت واجبە لەسەری خزمەتی مێردەکەی بکات بە چاکە و بە پێی پێویست، بەڵام ئەو خزمەتە بەپێی حاڵەتەکان دەگۆڕێت، لە ئافرەتێکی نیشتەجێ لە گوند بۆ ئافرەتێکی نیشتەجی لە شار بە هۆی جیاوازی ئیش و کارەکانەوە، هەروەها خزمەتی ئافرەتێکی تەندروست باش و بەهێز بۆ مێردەکەی جیاوازە لە خزمەتی ئافرەتێکی لاواز یان نا تەندروست.

٨- پیاو لە کاتی پێویستدا وەکو ناشز بوونی هاوسەرەکەی، مافی تەمبێ کردنی خێزانەکەی هەیە، ئەویش ئەگەر ئەو ئافرەتە لە بەجێگەیاندنی مافی الله کەمتەرخەم بووبێت، یان لە یەکێك لە مافەکانی مێردەکەی کەمتەرخەم بووبێت کە دەبێت بۆی جێبەجێ بکات، بەڵگەی ئەو مافەش فەرموودەی الله یە لە قورئاندا: ﴿وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾[٢].

---

[١] - الفتاوى الكبرى ( ٤ / ٥٦١ ) .
[٢] - النساء: ٣٤

بەڵام زانایان حەوت مەرجیان داناوە بۆ مەسەلەی بەکارهێنانی لێدان ئەگەر هۆکارێکی شەرعیش هەبێت:

یەکەم: لێدان مافی مێردێکە کە هەڵسابێت بە پێدانی مافەکانی هاوسەرەکەی لە ڕووی شەرعییەوە، نەك خۆی کەمتەرخەم بێت و زیانی بە هاوسەرەکەی گەیاندبێت و لەو لاشەوە لێی بدات.

دووەم: پیاو بۆی نییە لێدان بەکار بهێنێت تاکو ڕێگاکانی تر تەواو دەکات و بۆی دەردەکەوێت کە سوودیان نییە، کە بریتین لە ئامۆژگاری کردنی ئەو ئافرەتە بە قسەی خۆش، ئەگەر بێ سوود بوو ئینجا بڕواتە سەر هەنگاوی دووەم کە بریتیە لە پشت تێکردن و هەجر کردنی لە جێگای خەوتندا، کە ئەوەش هەندیك ئەحکامی خۆی هەیە ئەگەر ئەویش سوودی نەبوو، ئینجا پەنا بۆ لێدان دەبرێت ئەگەر گومان ببرێت ڕێگەچارەیەکی باشە و دەرەنجامی باشی دەبێت. بەڵام ئەگەر بە بێ ئەو چارەسەرانە یەکسەر بە لێدان دەست پێ بکات ئەوە پێچەوانەی فەرمانی پەروەردگار کردووە لە ئایەتەکەدا.

سێیەم: بیانوویەکی شەرعی هەبێت بۆ لێدان، بۆ نموونە ئەو ئافرەتە نشوز و لاساری هەبێت وهرچی هەوڵی لەگەڵدا بدات نەیەتە سەر ڕێگای ڕاست و لە کاری چاکەو شەرعیدا گوێڕایەڵی مێردەکەی نەکات، ئەگەر نا درووست نییە لێدان بەکار بهێنێت.

چوارەم: دەبێ مەبەست و نیەتی پیاو لە لێداندا ئەوە بێت ئافرەتەکە بگێڕێتەوە سەر جادەی حەق و کرداری پەسەند، نەك مەبەستی ئازاردن و ئیهانە کردن و سووکایەتی پیکردنی بێت، بۆیە بۆ نموونە لێدانەکە نابیت بەبەرچاو خەڵکەوە بێ.
پێنجەم: نابێت لێدانەکە زۆر ئازاربەخش وقایم بێت، یان شوێنەوار بەجێ بهێڵێت، یان شوێنەکەی شین و مۆر بکاتەوە، یان جێگای لێدانەکە خوێنی لێ بێت و شکان و ئەو جۆرە حاڵەتانە دروست بێت، ، هەموو ئەوانە زانایان باسیان کردووە کە قەدەغەیە.
شەشەم: لێدانەکە بە دەست بێت بۆ نموونە یان بە هەر شێکی تر، نابێت لە دە جار ئازار گەیاندن زیاتر بێت.
حەوتەم: دەبێت لە لێداندا نە ڕوخسار و نە سك و نە هیچ شوێنێکی هەستیاری ئافرەت بگرێتەوە.
وەکو دەردەکەوێت ئەو مەرجانەی زانایان دایانناوە زۆر توندەو بۆ چارەسەر کردنی کێشەیە نەك بۆ ئازاردان و سووکایەتی کردن بە کەرامەتی ئافرەتەکە،

هەمویشی بەڵگەی لەسەرە و تەنها ئەوە دەمێنیت ئەو لێدانە بۆ مەبەستێکی چاکسازی بێت بۆ ئافرەتەکەو لە سنوورێکی زۆر تەسك و کەمدا بوونی هەیە.

دوو تێبینیەکی گرنگ:

١- پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا بە دەستی خۆی نە لە هاوسەرێك یان خزمەتکارێکی خۆی نەداوە، وەکو لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە دا

دایکی ئیماندارن عائیشە الله لەخۆی و باوکی ڕازی بێت فەرموویەتی: (ما ضرب رسول الله ﷺ شيئًا قطُّ بيده، ولا امرأةً، ولا خادمًا، إلا أن يجاهد في سبيل الله، وما نيل منه شيء قطُّ فينتقم من صاحبه إلا أن يُنتهك شيء من محارم الله، فينتقم لله تعالى)[١].

٢- سەرەڕای ئەو هەمو مەرجانەی زانایان بۆ مەسەلەی لێدان دایانناوە و بازنەکەیان بەپێی ئایەت و فەرموودەکان و سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ تەسك کردووەتەوە، بەڵام دواجار لێدان شەریعەتێکە و الله تعالى لە قورئاندا جێگیری کردووە، هەرکێ بڵێت لێدان چارەسەرێکی نەشیاوە بۆ ئەم سەردەمە، یان حەلێکی ناشارستانییە، یان لە دڵیی خۆیشییەوە ئەگەر ڕەخنەی لێی هەبێت و بە ڕێگەچارەیەکی دواکەوتووانە و نەگونجاوی بزانێت بۆ ئەم ڕۆژگارە، ئەوە ڕەخنەی لە فەرمانی الله گرتووە و ئایەتی پەروەردگاری ڕەتکردووەتەوە و بێ

---

(١) - رواه مسلم.

حیکمەتی داناوە، بەوەش پەیوەندی بە ئیسلامەوە نامێنیت، چونکە حوکمێکی پەروەردگاری خستووەتە هەڵەوە، لێدان بەشێکە لە شەریعەت، بەڵام کەسەکە بە مەرجەکانی خۆی سەرپشکە بەکاری بهێنیت، یان هەرگیز پەنای بۆ نەبات ئەگەر پێویستیش بکات، لەم مەسەلەدا دەبێت هاوسەران بەتایبەتی ئافرەتان زۆر ئاگادار بن، چونکە الله عزوجل هەرگیز هیچ حوکمێك بەبێ حیکمەت و سوود تەشریع ناکات، ئەگەر سەرزەوی بلێت ئەوە حوکمێکی هەلە موسوڵمان هەر دەبیت بڵێی حوکمیکی ڕاستە پڕ لە حیکمەتە چونکە فەرمان لە قورئاندا هاتووە، بەندەکان لەسەریانە بە هەموو حوکمێکی الله و پێغەمبەرەکە ڕازی بن و لە دڵیشیانەوە نابێت ڕەخنە بگرن:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾[1].

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾.

[1] - الأحزاب: ٣٦

# پەیامی پازدە: مافەکانی ئافرەت بەسەر هاوسەریدا

ئافرەت کۆمەڵێك مافی لەسەر مێردەکەی هەیە کە واجبە لەسەری جێبەجێی بکات، دەکرێت بیانکەین بە دوبەشەوە:

بەشی یەکەم: مافە داراییەکان:

کە ئەوانەش خۆیان لەم مافانەی خوارەوەدا دەبیننەوە:

١- مارەیی: ئەو بڕە پارەیە کە پێویستە پیاو بیدات بە هاوسەرەکەی بە پێی گرێبەستی هاوسەرگیری، یان بە پێی چوونەلای خیزانەکەی کە (دخول)ی پێ دەوترێت. تەنانەت زانایان دەڵێن ئەگەر لە عەقدەکەشدا ناوی نەبرێت، هەر دەبێتە واجب لەسەر پیاوەکە مارەیی هاوشێوە (مهر المثل) لەگەڵ ئافرەتانی تر بۆ خێزانەکەی دابین بکات. ئینجا مارەیی ماقی تەنها ئافرەتەکە خۆیەتی، مەگەر خۆی بەبێ هیچ فشار و ناچار کردنێك بەشێکی بۆ کەسێك بکاتە دیاری، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وآتوا النساء صدقاتهن نحلة﴾[1]. مارەییش وەکو زانایان دەفەرموون، دەکرێت لەسەرەتاوە بێت و دەکرێت دوا بخرێت ودەشکرێت بکرێت بەدوو بەشەوە.

---

[1] - النساء:٤

٢- خەرجی و نەفەقە: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی خەرجی ئافرەت پێویستە لەسەر هاوسەرەکەی بە مەرجێك ئەو ئافرەتە خۆی لە مێردەکەی نەگرێتەوەو قەدەغە نەکات و لاساری و بێگوێی (نشوز) نەکات.

مەبەست لە مافی خەرجی و نەفەقە ئەوەیە خواردن و جل وبەرگی پێویستی بۆ دابین بکات، تەنانەت ئەگەر ئافرەتەکە دەوڵەمەندیش بێت ئەو مافەی هەر هەیە، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وعلى المولود له رزقهن وكسوتهن بالمعروف﴾[1] هەروەها فەرموویەتی: ﴿لينفق ذو سعة من سعته ومن قدر عليه رزقه فلينفق مما آتاه الله﴾[2]

٣- مافی نیشتەجێکردن: واجبە لەسەر پیاو بە گوێرەی توانای خۆی جێگای نیشتەجێ بوون بۆ خێزانەکەی دابین بکات. الله عزوجل فەرموویەتی:

﴿أسكنوهنَّ من حيث سكنتم مِن وُجدكم﴾[3]

---

(١) - البقرة/٢٣٣ ،

(٢) - الطلاق/٧ .

(٣) - الطلاق/٦.

## بەشی دووەم: مافەکانی تر:

١- دادگەری لە نێوان هاوسەراندا ئەگەر پیاوەکە زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێت، مەبەست لە داگەری مانەوەیە لەلایان و دابین کردنی نەفەقە و پۆشاکی پێویستە بۆیان. بەڵام ئەو دادگەرەییە ئەوە ناگریتەوە یەکیکیانی لەوی تر یان لەوانی تر زیاتر خۆش بوێت چونکە ئەوە لە دەرەوەی توانای خۆیەتی، بەمەرجێك کار نەکاتە سەر مافی نەفەقە و مانەوە لەلایان.

٢- پێویستە پیاو مامەڵە و ڕەفتار و ئاکاری جوان بێت لەگەڵ هاوسەریدا، الله فەرموویەتی: ﴿وعاشروهن بالمعروف﴾[١] وقوله: ﴿ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف﴾[٢] هەوەرها رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (استوصوا بالنساء)[٣]. واتە لە نێوان خۆتاندا ڕاسپاردەی چاکەکردن لەگەڵ ئافرەتاندا بۆ یەکتر بکەن.

٣- نابێت پیاو زیان بە هاوسەرەکەی بگەیەنێت، چونکە ئەگەر لە ئیسلامدا زیان گەیاندن بە هەموو کەسێك قەدغەو حەرام بێت، ئەوا لە پێشترە کە پیاو هیچ زیانێك بە هاوسەرەکەی خۆی نەگەیەنێت وچاکەی لەگەڵدا بکات.

---

[١] - النساء/١٩

[٢] - البقرة/٢٢٨.

[٣] - رواه البخاري ( ٣١٥٣ ) ومسلم ( ١٤٦٨ ) .

٤- پێویستە لەسەر پیاو خێزانی فێری دینەکەی بکات، ئەگەر خۆی پێی نەکرا ڕێگەی بدات لە سنووری ڕێگەپیدانی شەرعدا خۆی فێری زانستی شەرعی ببێت بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی و ماڵ و منداڵی بە گوێرەی شەرعی ئیسلام بەڕێوەببات. الله عزوجل فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[١].

٥- هەروەها پێویستە لەسەر پیاو ئارام بگرێت لەسەر هەندێ خووی نەخوازراو کە لەوانەیە لە پێکهاتەو سروشتی ئافرەتەکەدا هەبێت و بەهۆی ئەوە خوو و خەسڵەتە نەخوازراوانەی ڕقی لێ هەڵنەگرێت، هەروەها بەدوای هەڵەکانیدا نەگەڕێت و لەسەری بیانژمێرێت کە لەوانەیە بەمەبەست ئەنجامی نەدابێت و ئاکارێکی جوانە لێبوردنی بەرانبەری هەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يفرَكْ مؤمنٌ مؤمنةً، إن كرِهَ منْها خُلقًا رضِيَ منْها آخرَ أو قال: غيرَهُ)[٢]. واتە: هیچ ئیماندارێك ڕق لە ئیماندارێکی تر هەڵنەگرێت، ئەگەر حەز لە خەسڵەت و خوویەکی نەکات لە خەسڵەت وخوویەکی تری ڕازی دەبێت.

---

[١] - التحريم:٦.

[٢] - رواه سلم.

٦- یەکێکیش لە خەسڵەتە جوانەکان کە ئیسلام پیاوان فێر دەکات ئەویە، بەئەمەك بن بەرانبەر بە خێزانەکانیان و چاکەیان لەبیر نەکەن، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[١] هەورەها لە ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ ئەو ئەمەکە بە ڕوونی دەردەکەوێت، بۆ نموونە ئەمەکی بۆ دایکی ئیماندارن خەدیجە الله لێی ڕازی بێت کە تەنانەت لە دوای مردنیشی هەر ئەوی لەبیر بوو وباسی چاکەکانی دەکرد، جاری وابوو مەڕێکی سەردەبڕی و گۆشتەکەی بەسەر هاوڕێکانی خەدیجەدا دابەش دەکرد وەکو وەفایەك بۆ خەدیجەی خێزانی و دەیفەرموو: (إنَّها كانت، وكانت، وكان لي منها ولد)[٢]. واتە: وەسفی دەکرد و دەیفەرموو خەدیجە ئاوها و ئاوها بوو، منالْم لێی بوو.

٧- واجبە لەسەر پیاو خێزانی بپارێزێت و غیرەتی لەسەری هەبێت، لە هاوڕێ و خەڵك وشوێن و لایەنی خراپ دووری بخاتەوە و هەمیشە وەکو ئەمانەتێك تەماشای بکات کە پێویستە پارێزگاری لێ بکات.

---

[١] - البقرة: ٢٣٧.

[٢] - البخاري: ٣٨١٨

٨- دابین کردنی پێویستییە مادی و مەعنەوییەکانی ئەرکێکی تری پیاوە بەرانبەر خێزانەکەی.

٩- مافی ئافرەتە مێردەکەی خۆی جوان و ڕێکوپێك بکاتەوە وەکو چۆن مافی پیاوە خێزانەکەی ئەو کارە بکات، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[1]. هەروەهامافی ئافرەتە ئەوەی مێردەکەی پێی خۆشە خێزانی بۆی بکات لە ڕووی خۆشی وچێژ بردن، ئەویش بە هەمان شێوە بۆ خێزانەکەی ئەنجامی بدێت بۆ ئەوەی ڕێگای شەیتانی لێ ببرێت و هیچ پێویستییەکی تێرنەکراوی نەمێنیت، وەکو لە فەرموودەدا هاتووە: (وإن لأهلك عليك حقًّا)[2]

١٠- مافی ئافرەتە لەسەر پیاوەکەی دلی خۆش بکات لە سنووری شەرعدا، وەکو دەکرنی بۆ گەشت و گوزار و ئامادەبوون لە هەندی چالاکی و کاری خێردا کە لەگەل شەرعدا ناکۆك نەبێت، وەکو ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەیدا عائیشە الله لێی ڕازی بێت لە دوورەوە تەماشای یاری حەبەشەکان بکات وەکو لە سەحیحی بوخاری وموسلیماد اهاتووە.

---

(١) - البقرة: ٢٢٨

(٢) - البخاري (١٩٧٧)، مسلم (١١٥٩).

١١- تاكو پێی بكرێت پێویستە پیاو گومانی باش بە هاوسەرەكەی ببات و گومانی خراپی پی نەبات، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا﴾[١]

١٢- وەكو چۆن وتمان مافی پیاوە بەسەر ژنەكەی هەموو نهێنییەكی بپارێزیت و لە كاتی تێكچوونی پەیوەندییان بەتایبەتی ڕێگە بەخۆی نەدات نهێنییەكانی دەربكات، بەهەمان شێوە مافی ئافرەتە پیاوەكەی هەموو نهێنییەكی بپارێزیت و دەری نەكات.

---

[١] - الحجرات: ١٢.

# پەیامی شازدە: دەنگی ئافرەت لە ڕوانگەی شەرعەوە

لە ڕووی شەرعییەوە - ئەگەرچی مەسەلەکە خیلافێکی لەسەرە - بەڵام وا دەردەکەوێت دەنگی ئافرەت عەورەت نییە و درووستە بە پێی پێویست لەگەڵ پیاوانی نامەحرەمدا قسە بکەن، بەڵام بە مەرجێك قسەکردنێکی ئاسایی بێت و لە کەش وهوایەکی پاك و پاراو وئاسایی ودوور لە گوماندا بێت و، بە شێوەیەك لە شێوەکانی ئەوەی کە الله وریایی لەسەری داوە و فەرموویەتی: (فَلا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ) نەیگرێتەوە، واتە دەنگەکە ناسك نەبێت و بە شێوەیەك نەبێت غەریزەی پیاوان بجوڵێنیت و بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش سیفەتی مێینەیی ئافرەتی تێدا دەربکەوێت، قسەکەش پێویستە دوورو درێژ و زۆر نەبێت و بە پێی پێویست بێت، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆکاری درووست بوونی فیتنە.

لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا ئافرەتان دەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاریان لێ دەکرد و هەروەها دەچوونە لای هاوەڵان و خەلیفەکان و پرسیاریان لێ دەکردن، هەروەها سەلامیشیان لە پیاوانی نامەحرەم دەکرد و ئەوانیش وەڵامی سەلامەکەیان دەدایەوە. فەرموودەی الله عزوجل لە قورئانی پیرۆزدا: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ﴾[1]. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەنگیان عەوەرت نەبووە.

---

(١) - الأحزاب: ٥٣

زانایان لە ڕۆشنایی بەڵگە شەرعییەکاندا، دەنگی ئافرەتیان بە عەورەت نەزانیوە، بەڵام نەك بە شێوەیەکی ڕەهایی، بەڵکو بەم مەرجانەی خوارەوە:

١- قسە کردنەکە بۆ کارێکی پێویست بێت و ماوەکەی بە پێی پێویستیەکە بێت و لەوە دەرنەچێت بۆ قسەی لاوەکی و دەمەتەقە لە دەرەوەی باسە سەرەکییەکە.

٢- بە هیچ شێوەیەك ناسك کردنەوەی دەنگ و ئەوەی کە الله تعالی فەرموویەتی: ﴿فَلا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ﴾ تێدا نەبێت، چونکە ئەوە بەریدی شەیتانە و سەرەتای درووست بوونی فیتنەیە.

٣- ناوەڕۆکی قسە کردنەکە جێگای گومان نەبێت و نەبێتە مایەی فیتنە و درووست بوونی هەڵەی شەرعی.

بەڵام مەسەلەی ئەوەی کە دەنگی ئافرەت عەورەت نییە مەعنای ئەوە نییە - وەکو لەم سەردەمەدا بە هەڵە وا گومان دەبرێت - ئافرەت بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ پیاوانی نامەحرەمدا قسە بکات و لە هەر کوێ و لەگەڵ هەرکێ بیەوێت قسە بکات بەو بەهانەی کە دەنگی عەورەت نییە! واتە بە شێوەیەکی ئاسایی تەماشای ئەو مەسەلە بکات، وەکو ئەوەی لەگەڵ مەحرەمەکانی خۆیدا قسە بکات وابێت! چونکە لە ڕاستیدا ئەو قسە کردنە بەو شێوەیە دوورە لە شێوازی ڕێگەپێدانی شەریعەت بۆ قسەکردنی ئافرەت لەگەڵ کەسانی نامەحرەمدا و زۆر جار سەر لە هەڵە و سەرپێچی شەرعی دەردەکات.





یان حاڵ بەوە بگا لەبەر ئەوەی دەنگی ئافرەت عەورەت نییە، بە دروست بزانرێت ببێتە بێژەر و لە ڕاگەیاندندا کار بکا، چونکە ئەوە حەرامە ئەگەر تەنها ئایەت و فەرموودەش پێشکەش بکات هەر حەرامە، سروشتی کارەکەی لەو حاڵەتەدا وا دەخوازێت لەم سەردەمەی خۆماندا کە سەردەی فیتنە و لە شەرع دوور کەوتنەوەیە، لەگەڵ پیاوانندا تێکەڵ ببێت و دەنگی خۆی ناسك بکاتەوەو هەمیشە قسەی خۆش و ڕووی گەش بێت و لەگەڵ پیاواندا بەبێ هیچ هەستکردنێك بە شەرم وئیحراجی مامەڵە بکات، بێگومان لێرەدا مەبەستم لە ڕاگەیاندنی عەلمانی نییە، چونکە ئەوان بەم جۆرە باسانە هەر پێکەنینیان دێت، بەڵکو مەبەستم ئەوانەیە کە خۆیان بە موسوڵمانێکی وابەستەبوویش بە ئیسلامەوە دەزانن و ئەو کارانەش لە دەرەوەی ڕەزامەندی و سنووری دینەکەیانەوە ئەنجام دەدەن.

شەریعەتی ئیسلام لە مەسەلەی دەنگی ئافرەتدا بانگ و ئیقامە کردنی لەسەر ئافرەتان لاداوە بۆیان نییە نە بانگ بدەن و نە ئیقامە بکەن، چونکە درووست نییە دەنگیان بەو شێوە بە ئاوازەوە ببیسترێت تەنانەت بەو وشە پیرۆزانەی بانگیش، تەنانەت قورئان خوێندنی ئافرەت بە دەنگی خۆی بۆ ئەگەر پیاوان ببیبسن هەر درووست نییە، هەروەها قەدەغەیە لەسەری پێشنوێژی پیاوان بکات و هەندێ کاروباری موسوڵمانان وەربگرێت، کە هەموو ئەوانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەنگی ئافرەتان تەنها لە سنووری زەرورەت و پێویستیدا درووستە ببیسترێت نەك بەڕەهایی.

ئەزموونی ژیان دەریخستووە کە دەنگی ئافرەتان کاریگەری لەسەر پیاوان هەیە و هەندێ جار هاوشێوەی بینینی شەکڵ و ڕواڵەتی وبگرە زیاتریش دەنگەکەی دەبێتە مایەتی فیتنە و شەیدا بوونی هەندێ لە پیاوان بە دەنگیانەوە و دواجاریش دەبێتە هۆکارێك بۆ درووست بوونی وابەستەبوون.

(بشار بن برد) ی شاعیری نابینا و ناوداری عەرەب دەڵێت:

يا قَومِ أُذني لِبَعضِ الحَيِّ عاشِقَةٌ
وَالأُذنُ تَعشَقُ قَبلَ العَينِ أَحيانا

واتە: هۆ خزمینە گوێم عاشقی هەندێ ئافرەتی گەڕەك بووە، گوێیش جاری وا هەیە لە پێش چاودا عاشق دەبێت! ئەو قسەش وەکو وتم بە ئەزموون دەرکەوتووە حەقیقەتی هەیە وهیچ زیدەڕەوییەکی تێدا نییە. چەندین حاڵەتی واش بووە نەك پیاو بە دەنگی ئافرەت کاریگەر بووە بەڵکو بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە وەکو بەڵگەیەك لەسەر ئەسڵی کاریگەری دەنگ لەبەرانبەر کاریگەری شیوەو ڕەنگدا.

## بۆیە کورتەی ئەم باسە

ئەوەیە دەنگی ئافرەت عەورەت نییە ئەگەر نەبێتە مایەی فیتنە و بە پێی پێویست بێت و قسەی خۆش و گاڵتە و موجامەلەی تێدا نەبێت، تەنانەت لە کاتی تەلبیە کردن لە حەج و عومرەدا درووست نییە بە دەنگی بەرز بڵێت (لبيك اللهم لبيك) بە پێچەوانەی پیاوانەوە کە سوننەت وایە دەنگ بە تەلبیە کردن بەرز بکەنەوە، یان لەو کاتەی لەناو نوێژی جەماعەتدان، ئەگەر پێشنوێژ هەڵەیەك بکات، بۆ پیاوان درووستە بە دەنگ هەڵەکەی بۆ چاك بکەنەوە، بەڵام بۆ ئافرەتان ئەو کارە درووووست نییە، بەڵکو تەنها بۆیان هەیە لە ڕیگەی (تصفیق) واتە دەست لەسەر دەستی خۆیان بدەن و بەو دەنگە ئیماام لە هەڵەکەی ئاگادار بکەنەوە.

سەبارەت بەو خیلافەی کە هەیە لە نێوان زانایاندا ئایا دەنگی ئافرەت عەورەتە یان عەوەرت نییە و ئەو قسەو باسەی لە ڕووی زانستییەوە کە هەڵیدەگرێت، دەتوانیت بۆ کتێبی (صوت المرأة – بحث فقهي) يوسف بن عبد الله الأحمد، بگەڕێیتەوە، مەسەلەکانی لە ڕۆشنایی بەڵگەکاندا شیکردووەتەوە.

# پەیامی حەفدە:

## ئاسانکاری لە مەسەلەی مارەییدا خێرە وسوننەتە

مارەیی مافێکی ڕەواو حەڵاڵی ئافرەتە وەریبگرێت، الله تعاله فەبرموویەت: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً﴾[1] نحلة، واتە: دیاری و بەخششێك کە بەدڵێکی ئاسوودەوە بە ئافرەت بدرێت.

ئیسلام بایەخی بە مەسەلەی زەواج وبەشوودانی کچ داوەو بە ئایەتێك لە ئایەتەکانی الله عزوجل ناوی بردووە کە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[2].

هۆکاری ئەو بایەخ پێدانەش لەوە سەرچاوە دەگرێت کە زەواج بەرژەوەندی گەورەی بۆ ژن و پیاو و کۆمەڵگا بە گشتی تێدایە.

بەڵام کێشەیەکی گەورە دێتە ڕێگەی ئەم سوننەتە گەورەو ئایەتە مەزنەی الله عزوجل، ئەویش ئەوەیە هەندێ لە سەرپەشتیارانی کچان و ئافرەتان، داوای مارەیی زۆر دەکەن بۆ کچەکانیان و بەوەش بەربەرست بۆ گەنجان درووست دەبێت لە بەجێهێنانی ئەو پرۆسە پیرۆزە.

[1] - النساء :٤.
[2] - الروم:٢٤

لە ڕاستیدا ئیسلام هیچ بڕەپارە و زێڕێکی وەکو مارەیی بۆ ئافرەتان دیاری نەکردووە، بەڵام بە شیوەیەکی گشتی هانی کچان و سەرپەرشتیارانی داوە کە بارگرانی بۆ خوازبێنیکار درووست نەکەن و چاکترین مارەیی ئەوەیە کە ئاسان بێت لەسەر ئەکەسەی دیتە پێشەوە بۆ خوازبێنی و بارگرانی بۆ درووست نەکات. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خیر االصداق أيْسَرُه)[1]. واتە: چاکترین مارەیی ئاسانترینیانە. لە سیرە و سوننەتیشدا هەواڵی لەو جۆە زۆرە کە نیشانەی ئەوەیە ئیسلام هانی ئاسانکاری لەو بوارە دەدات. تەنانەت پێغەمبەر ﷺ وەکو لە بوخاری و مسلم دا جێگیر بووە، بە پیاوێکی فەرمووە کە بەنیازی زەواجی بووە: (اتخذ ولو خاتما من حديد). واتە: شتیکی بۆ بکە، ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بووە . جگە لەوەش پێغەمبەر ﷺ خۆی وەکو نموونەیەکی کردەیی ئەو مەسەلەی بەرجەستە کردووە، کاتێك فاتیمەی کچی دەداتە عەلی الله لێیان ڕازی بیت و هیچی نابێت بەمارەیی پێی بدات، دەڵێت قەڵغانێکت هەبوو ئەوەی پێ بدە وەکو مارەیی، کە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مارەیی خۆی لە خۆیدا ئامانج و مەبەست نییە لە ئیسلامدا.

---

[1] - رواه الحاكم والبيهقي

بە کورتی ئایەت و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و قسەی خەلیفە ڕاشیدەکان و زانایانی ئیسلام ئەوەمان پێ دەڵێن کە مارەیی سنوورێکی بۆ دیاری نەکراوە بڵێی لەوە کەمتر نابێت، بۆیە مارەیی لەسەر ئەنگوستیلە و بڕێکی خورما و قەڵغان و فێرکردنی چەند سوڕەتێك لە قورئان لەسەردەمی پێغەمبەرایەتیدا دامەزراوە، هەروەها جۆرێك لە ئیجماع و کۆدەنگی و کۆك بوونی بەڵگەکان لە ئیسلامدا لەسەر ئەوەن کە زۆری و گرانی مارەیی کارێکی باش نییە و بەرەکەتی کارەکە کەم دەکاتەوە.

لەبەر ئەوەی کە ئاماژەی پێکرا، باشترە و خێری زۆرترە و گونجاوترە لەگەڵ سوننەتدا کە ئاسانکاری لە بڕی مارەییدا ڕەچاو بکرێت و بارگرانی نەخرێتە سەر خوازبێنیکەر. چونکە ئەگەر ئاسانکاری لە مەسەلەی مارەییدا بکرێت، زەواج زۆر ئەبێت ولە ئەنجامی ئەو ئاسانکارییە خێر و بێرێکی زۆر لەناو کۆمەڵگادا بڵاو دەبێتەوە.
دەرەنجامی گران کردنی مارەیی - وەکو شێخ محمد صالح المنجد دەڵێت - کاریگەری خراپی زۆر لێ دەکەوێتەوە، لەوانە:

١- ئاسانكاری لە مەسەلەی مارەییدا ڕێبازی پێغەمبەرایەتییەو پێشینان و پاشینانی ئەم ئومەتە لەسەر ئەوە كۆكن كە كارێكی باشە و پێچەوانەكەی كە گرانكردنی مارەییە كارێكی خراپە.

٢- زەواج پرۆسەیەكی گرنگ و پیرۆزە و حوكمی ئەنجامدانی هەندێك جار دەگاتە ئەوەی واجب بێت، جا كە مارەیی زۆر بێت و لەسەرووی توانای پیاوانەوە بێت، ئەوە جۆرێكە لە درووست كردنی بەربەست بۆ ئەو پرۆسەیە.

٣- ڕازی نەبوونی وەلی ئەمری كچ بەوەی كچەكەی بەشوو نەدات بەو مارەییە زۆرە نەبێت، ئەوە كارێكی نادرووستە و جۆرێكە لە زیان گەیاندن بە كچەكەی خۆی و بە ئەسڵی پرۆسەكە بە گشتی و ئەوەش حەرامە.

٤- داواكردنی مارەیی زۆر لەسەرووی توانای خوازبێنیكەرەوە، دەبێتە مایەی كەم بوونەوەی زەواج و ئەوەش لەلای خۆیەوە دەبێتە هۆكارێك بۆ بڵاوبوونەوەی فەساد، یەكێكش لە ئامانجەكانی شەریعەت ئەوەیە بەرژەوەندییەكان جێبەجێ بكات و ڕێگری لە زیان و خراپەكان بكات، كەم كردنەوەی مارەیی و ئاسانكاریش تێیدا مادام دەبێتە یارمەتیدەر بۆ درووست بوونی ئەو دەرەنجامە كەواتە كارێكی باشەو واجبێكی شەرعییە.

٥- ئەزموونە تاڵەکانی ژیان ئەوەمان فێر دەکات، کە زۆر جار ڕێگری کردنی سەرپەرشتیاران لە بەشوودانی کچەکانیان بە هۆی زۆریی مارەیی داواکراو، بووەتە مایەی مانەوەی کچەکانیان و ڕێحۆشکەریش بووە بۆ سەرهەڵدانی هەندێك خراپە لەکۆمەڵگادا لەڕێگەی تێوەگلانی ئەو کچ و کوڕانەی کە گرانی مارەیی ڕێگای زەواجی لێ داخستوون بەهەندێ خراپە و فەسادەوە.

٦- گرانی مارەیی لە دەرەوەی سنوور و توانای ئەوانەی دێن بۆ خوازبێنی دەبێتە هۆکاری بڵاوبوونەوەی نەخۆشی دەروونی و خەمۆکی لەناو کچان و کوڕاندا و لەوەشدا سەرپەرشتیاران ئەو بەرپرسیارێتییە هەڵدەگرن.

٧- زۆری مارەیی ئەگەرچی بەڕواڵەت هەندێك بەرژەوەندی بۆ کچەکە و ماڵەوەیان تێدا وەدی دەکرێت، بەڵام لە ڕاستیدا خراپەکانی چەند بەرانبەر ئەو چاکییەیە و لە شەریعەتیشدا نەهێشتنی فەساد و خراپە لە پێشترە لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندی، (درء المفاسد مقدم على جلب المصالح).





بۆیە با سەرپەرشتیارانی کچان و ئافرەتان ئەو ڕاستیانە لەچاو بگرن و باری ئەوانەی دێنە پێشەوە بۆ خوازبێنی قورس نەکەن، چونکە ئەو کارەیان خۆی لە خۆیدا کارێکی ناشەرعی و خراپە، کاریگەری و دەرەنجامە ناڕاستەوخۆکانیشی ڕەهەندی خراپ و نەرێنی جۆراوجۆریان لێ دەکەوێتەوە، دواجاریش پشکی ئەو باجەکچەکانی خۆیان و کوڕی خەڵکی و کۆمەڵگا بە گشتی هەڵیدەگرن.



# پەیامی هەژدە: وتەیەك دەربارەی فرەژنی

مرۆڤ بە فیترەتی و پێکهاتەی دروست بوونی مەیلی بۆ فرەژنی هەیە، ئیسلامیش لەبەر ئەوەی دینی فیترەت و تێگەیشتنە لە پێویستیەکانی مرۆڤ، دانی بەو حەقیقەتەدا ناوە و فرەژنی وەکو شەریعەتێك لە ڕۆشنایی کۆمەڵە ڕێوشوین و مەرجێکدا جێگیر کردووە، واتە وەکو هەر حوکم و شەریعەتێکی تر لە ئیسلامدا، فرەژنیش حوکمێکی شەرعی کارپێکراوە و مەرج و ڕێوشوێنی خۆی هەیە، وەکو چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ یەك هاوسەریشدا ڕێوشوێن و مەرج و ئەحکامی خۆی هەیە و پیویستە ڕەچاو بکرێت، لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە لێکدانەوەو شیکردنەوەی زۆر هەڵدەگرێت و لە پێناو خستنە ڕووی ئەم پرسە لە ڕوانگەی شەرعەوە، هەوڵ ئەدەم لە چەند خاڵێکدا بابەتەکە بخەمەڕوو:

١- بنچینە وشەرعی بوونی مەسەلەی فرە ژنی لە قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوە دەگرێت و، الله تعالى خۆی ڕەزامەندی لەسەر فرەژنی داوە و فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا﴾[1] حوکمەکانی (تعدد) لە قورئان و لە سونەت و لە کتێبی زانایاندا لە ژێر بابەتەکانی (النكاح)دا بە تێروتەسەل باس کراوە.

---

[1] - النساء:٣.

٢- لەبەر ئەوەی ئارەزووی فرەژنی لە ناخی مرۆڤەکاندا بوونی هەیە وحەزێکی فیترییە، لە ڕاستیدا ئیتر زێدەڕەوی لە داواکردنی هۆکاری پەنابردنی پیاو بۆ زیاتر لە ژنێك لە لایەن هاوسەری یەکەم، یان کۆمەڵگا و دەسەڵات ویاسا، هەمووی جۆرێکە لە زێدەڕەوی بێ پاساو لە لێپرسینەوەدا و هاوکات نکۆڵی کردنە لە مەسەلەیەکی فیتری کە خودی نکۆڵیکەرانیش هەستی پێ دەکەن، بەڵام بە هۆکاری جۆراو جۆر نکۆڵی لێ دەکەن.

٣ - ئیسلام کاتێك (تعدد)ی وەکو شەریعەتێك جێگیر کردووە، لەبەر ئەوەیە کە بەرژەوەندی بەندەکانی بە شێوەیەکی گشتگیر و بە ڕەهایی ڕەچاو کردووە، بۆیە ئەگەرچی هاوسەری یەکەم زۆر جار بە کە مێردەکەی ژنی دووەم دەهێنێت ئازار و ناڕەحەتی بەردەکەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا هۆکاری ئەوەیە ئیسلام بەرژەوەندی دونیا و دینی ئەو پیاوەی پێکەوە ڕەچاو کردووە، ابن القيم بە ڕەحمەت بێت دەفەرموێت: (فإن الشريعةَ مَبْنَاها وأساَسَها على الِحكم ومصالح العباد في المعاش والمعاد)[1] واتە بنچینەی شەریعەت لە سەر حیکمەت و بەرژەوەندی بەندەکان لە دونیا و قیامەتدا دامەزراوە. کەواتە نابێت مەسەلەکە لە بازنەی تەسکی پێناخۆش بوونی هاوسەری یەکەمەوە تەماشا بکرێت.

[1] - إعلام الموقعين(٤١/١).

٤ - لە هیچ ئایەت و فەرموودەیەکدا نەهاتووە، کە پیاو ناچار بێت بۆ ئەوەی بتوانێت هاوسەرگیری دووەم و زیاتر بکات، ئیزنی هاوسەری یەکەم وەربگرێت، لە ڕووی شەرعییەوە وەکو زانایان دەفەرموون هیچ کێشەیەکی نییە، بەڵام بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی تۆکمەکردنی سەقامگیری خێزان و دەستەبەرکردنی ئاسوودەیی، باشترە پیاو تاکو پێی بکرێت، ڕێگە لە درووست بوونی گرفت وئاژاوە بگرێت و هاوسەری یەکەمی ڕازی بکات، بەڵام ئەگەر ئەو ئافرەتە بە غەیری وازهێنانی مێردەکەی لە هاوسەرگیری دووەم ڕازی نەبوو و پیاوەکەش پێویستی بەوە بە هاوسەرگیری دووەم یان زیاتر هەبوو، ئەو کات ئەتوانێت بەبێ ڕەزامەندی وەرگرتنی خێزانی هاوسەرگیری نوێ بکات.

٥ - سەبارەت بەوەی کە باری کەسێتی لە یاسا دەستکردەکان مەرجی ڕەزامەندی هاوسەری یەکەمیان داناوە، ئەوە هیچ پاڵپشتیکی شەرعی ڕاست و درووستی نییە وبیانوویەکە بۆ قەدەغە کردنی ئەو شەریعەتە، یاساکان بە شێوەیەکی گشتی ئەوەندە لە ئیسلام وەردەگرن کە پێیان باش بێت، چونکە شەریعەت لەلایان هێڵێکی سوور نییە تێینەپەڕێنن، بەڵکو وەکو خۆیان دەڵێن ئیسلام سەرچاوەیەکی سەرەکییە لەناو چەندین سەرچاوەی سەرەکی تردا و ئەگەر بتەویت ناکۆکی و سەرپێچییەکانی یاسا وەزعییەکان لەگەڵ ئیسلام دا بژمێریت ناتوانیت بە ئاسانی ئەو کارە ئەنجام بدەیت.

٦- بەڵام ئەگەرچی فرەژنی کە مەبەستمان پێی (تعدد الزوجات) لە ئیسلامدا، شەریعەتێکی ئیلاهی کارپێکراوە، هاوکات بە ڕەهایی و بێ قەید و شەرتیش نییە، بەڵکو شەریعەت ئەو مەسەلەی ڕێکحستووە و پێویستە چەندین مەرج لەو پیاوەدا بوونی هەبێت بۆ ئەوەی مافی هیچ خاوەن مافێك لەو فرەژنیەدا نەفەوتێت، لەوانە:

- ڕاگرتنی دادگەری: الله عزوجل فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً﴾[1] ئەم ئایەتە ئەگەرچی لەسەرەتاوە ڕێگەی بە فرەژنی داواە، بەڵام لەناو هەمان ئایەتدا قەیدی بۆ داناوە وداگەری و عەدالەتی بۆ ئەو کارە کردووە بە مەرج، ئەگەر نەیتوانی دادگەری لە نێوان هاوسەرەکانیدا بەرپا بکات، دەبێت بەیەك هاوسەر ئیکتیفا بکات. بەڵام دادگەری مەبەست لە جێگەی نیشتنەجێبوون و نەفەقە و دابین کردنی پێویستییەکانی ژیانە، نەك دادگەری خۆشەویستی دڵ ئەوەیان بەدەستی خۆی نییە.

- توانای دارایی وخەرجکردن لەسەر هاوسەرەکانی: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾[2]. تا توانای پێویست بۆ بەڕێوەبردنی خێزانەکان نەبێ لە ڕووی نەفەقە و دابینکردنی خواردن و پۆشاك و پێویستی سەرەکی ژیان و جێگای نیشتەجێبوون، دروست نییە پیاو بیکاتە دوو خێزان.

- هەروەها ئەبێت توانای بەدەنی و جەستەیی پێویستیشی بۆ ئەو مەبەستە هەبێت.

---

(١) - النساء/٣.

(٢) - النور/٣٣

٧ - ئایا پیاوی موسوڵمان یەك ژنی هەبێت باشترە یان زیاتر؟ ئەوە پرسیارێكە لە ڕاستیدا وەڵامەكەی لەسەر حاڵ و بارودۆخی پیاوەكە ڕاوەستاوە، ئەگەر پیاو لە ڕووی فەسیولۆجییەوە یەك ژن بەشی نەكات و چاوی و داوێنی نەپارێزیت و توانای هاوسەرگیری دووەمیشی هەبێت، بێگومان ئەوە بەرژەوەندی دین و دونیای لەوەدایە ژنی تر بهێنێت، ئەگەر لەو حاڵەتەدا نەشیهێنێت ئەوە زوڵمی لە خۆی كردووە و لە خۆڕایی لەو شەریعەتەی پەروەردگاری سوودمەند نابێت.

بەڵام ئەگەر لەو جۆرە بێت كە زیاتر لە ژنێكی پێویست نەبێت، بەتایبەتی ئەگەر دۆخی داراییشی باش نەبێت، ئەوە بێگومان یەك هاوسەری بەسە و پێویست بەوە ناكات بیر لە ژنی تر بكاتەوە. لەبەر ئەوەش كە (تعدد) فەرز نییە لەسەر پیاو و موباحە، زۆرێك لە زانایان وەكو شافیعی و زانای تر فەرموویانە ئەگەر پێویستییەك نەبێت بۆ ژنی دووەم ئەوا یەك ژن لە زیاتر باشترە.



٨ - بەڵام لەم ڕۆژگارەدا قەناعەتم وایە هەرکێ توانای دارایی وجەستەیی هەبێت وبتوانیت دادگەری جێبەجێ بکات، کەسایەتییەکی وا بەهێزیشی هەبێت بتوانێت زیاتر لە خێزانیك بەڕێوە ببات، بەرژەوەدی لەوەدایە ژنی دووەم بهێنیت، لەلایەکەوە خۆی لەو دەریای فەسادو بەدڕەوشتی کە تەشەنەی کردووە دەپارێزیت وزیاتر تۆکمە دەکات، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر توانای پەروەردەکردنی منالْی لەسەر بنەماکانی ئیسلام هەبێت دەبێتە هۆکاری زیاد کردنی موسوڵمانی موەحید کە لەم سەردەمەدا کێشەی گەورە لەو بوارەدا هەیە، هەروەها بەشدار دەبێت لە چارەسەرکردنی کێشەی قەیرەیی و هەڵگرتنی پشکی خۆی لە لێپرسراوێتی سەبارەت بە ژمارەیەکی زۆر لە بێوەژنان کە پێویستیان بە کەسێکە دالْدەی مادی ومەعنەوییان بۆ دابین بکات.

٩- ئینجا ئەگەرچی فرەژنی حیکمەتی گەلێك زۆرە و یەکێك لە حیکمەتەکانی کەمکردنەوەی ڕێژە قەیرەیی و بێوەژنانە لەناو ئافرەتاندا، بەڵام هاوکات هەر لە ئاماژەی ئایەتەکەوە ئەوە وەردەگیرێت کە درووستە پیاو بەدوای کچی جوان وعازەب و تەمەن بچووکیشدا بگەڕێت وژنی دووەم وسێیەم مەرج نییە هەر بەتەمەن و بێوەژن بێت، بەڵام ئەگەر کەسێك لەبەر بەرژەوەندییەکی ئیسلامی بەرز بەمەبەست کچێکی قەیرە یان بێوەژنێك مارە بکات، ئەوە کارێکی زۆر باش و ڕەوشت بەرزانەی کردووە و لەگەڵ پێکەوەنانی خێزانەکەی ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەشی دەست کەوتووە..

١٠- بێتاقەت بونی ئافرەت لەوەی ژنی بەسەردا بێت ئەوە خۆی لە خۆیدا هەستیکی ئاساییەوە لەسەری گوناهبار نابێت، هەروەکو چۆن موسولمان بە سروشتی حەزی بەشەڕ و جیهاد کردن و مردن نییە، وەکو الله فەرموویەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[1] بەڵام ئەوە مەسەلەیەکە و ئاساییە و ڕق لێبوونی حوکمەکە و بەهەڵەدانانی یان ڕەخنە لێگرتنی مەسەلەیەکی تری جیاوازە و حوکمێکی خراپیشی لەسەر دین و ئیمانی ڕەخنەگرەکە هەیە.

پێویستە ئافرەتان بە وریاییەوە لەگەڵ ئەو پرسەدا مامەڵە بکەن، پێیان ناخۆش بێت و بەژنی دووەم بێ تاقەت و نیگەران بن ئاساییە، بەڵام بگاتە ئەوەی (تعدد) بە بەهەڵە بزانن و وابزانن تەشریعیکی زیان بەخشە بۆ خێزانەکان ویان ئەسڵی مەسەلەکە ڕەت بکەنەوە، ئەوە هەڵەیەکی کەمەر شکێنە و لە ئیسلام پێی دەردەچن، چونکە کردەوەکەیان بەو شێوازە دەبێتە ڕەتکردنەوە بۆ فەرمانی الله تعالى. پێویستە ئافرەتی ئیماندار بەعەقڵی بیر بکاتەوەو بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ ببێت و شەریعەتی پەروەردگاری ڕەت نەکاتەوە و پارێزگاری لە ئیمانی خۆی

---

[1] - البقرة/٢١٦

بکات لەوە دڵنیا بیت شەریعەتی (تعدد) و فرەژنی الله تعالی داینـاوەو شارەزاترە چی بۆ بەندەکانی باشە و چی باش نییە: ﴿قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ﴾[1]

١٠- ڕێگریکردنی یاسای وەزعی لە مەسەلەی تعدد و درووستکردنی بەربەست و تەگەرە بۆ ئەو حوکمە شەرعییە، کارێکە پێچەوانەی شەریعەتە و جۆریکە لە دژایەتی کردنی و هاندانێکە بۆ بڵاوبوونەوەی فەساد و مانەوەی کچان و بێوەژنان بەبێ هاوسەرگیری، بۆیە وەکو زانایان دەڵێن پیاو لە پاش هەبوونی مەرجەکانی فرەژنی تێیدا دەتوانێت ملکەچی ئەو یاسایانە نەبێت چونکە پێچەوانەی قورئان و سوننەتە و ڕێوشوێنی نافەرمی بۆ بەئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە بگرێتەبەر ئەگەر پێویستی کرد.

١١- مەسەلەیەکی تریش هەیە شایانی ئاماژە بۆ کردنە ئەویش هەڵوێستی هەندێ لەو بەناو ئیسلامییانەیە کە لافاوی جاهلییەتی هاوچەرخ وکاریگەر بوون بە عەلمانیەت ڕایاڵیون و خۆیان کردووە بە پینەچی بۆ ئیسلام وا دەزانن ئەم شەریعەتە پری لە کەلێن و کەموکورتییە و دەبێت ئەوان فریای بکەون و ئەو کە لێنانە پڕ بکەنەوە والعیاذ بالله، زۆرجار لەو بەزیوانە دەبیسین ئینکاری مەسەلەی فرەژنی دەکەن و دەیان شێوازی نازانستی و مل باهەڵدانی دەقەکان و شێواندنی ئاماژەکانیان ئەنجام ئەدەن، تەنها لەسەر ئەوەی عەلمانییەکان لێیان ڕازی بن و

---

[1] - البقرة:١٤٠

بڵین ئەمانە ئیسلامی مۆدیرن و توندرەونین، لە کاتێکدا دەبێت لەوە دڵنیابن تا دێت لەلای ئەوانە بێ حورمەت دەبن، چونکە عەلمانییەکان دڵنیان لەوەی فرەژنی لە ئیسلامدا شەریعەتێکی چەسپاوە و ئەو داکۆکییی کردنەی ئەوان لەسەر پێچەوانەکەی جۆریکە لە نکۆڵی کردن لە سەوابیتی دینەکەیان و شێوازێکە لە موغازەلەی ناڕاستی عەلمانییەکان، سەیریش ئەوەیە جاروبار خودی ئەو بەزیوو ناخ ڕوخاوانە هاوسەرگیری دووەم دەکەن ولەو هەوڵ و کۆششانەیان بۆ دژایەتی فرەژنی خۆیان دەخەنە درۆوە.

١٢- دوا ئامۆژگاریشم بە تایبەتی ئاراستەی کچان و بەتایبەتی ئەوانەی هەندێ تەمەنیان هەیە ئاراستە دەکەم، ئەویش ئەوەیە با بەو پیاوانە ڕازی بن کە هاوسەری یەکەمیان هەیە و ئەوە بەهیچ شێوەیەك زوڵم نییە لە هاوسەری یەکەمی، چونکە ئەگەر بڵێن زوڵمە ئەوە دەبێتە بەهەڵەخستنەوەی حوکمێکی شەریعەت کە الله خۆی دایناوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك درووست نییە بۆ ئەوەی پێی ڕازی بیت مەرج بخەیتە سەر پیاوەکە هاوسەری یەکەمی تەڵاق بدات، چونکە ئەوە تاوانە و پێغەمبەر ﷺ فەرموویەت: (ولا تسأل المرأة طلاق أختها لتكفأ ما في إنائها)[1]. واتە نادرووستە ئافرەتێك داوا لە مێردەکەی بکات هاوسەرەکەی تری تەڵاق بدات بۆ ئەوەی خۆی تەنها بێتەوە بە سوود وەرگرتن لەو پیاوە.

---

[1] - رواه البخاري.

ئەم هەڵوێستەی ئێستا هەندی لە کچان و ئافرەتان هەیە بەرانبەر پیاویك کە ژنی دووەمی هەبێت لە ڕووی شەرعەوە نامۆیە و نە لە سەدە چاکەکان و نە لە سەدان ساڵی دوای ئەوانیش بوونی نەبووە، بەڵکو تەنها ئەو کاتە سەری هەڵدا کە موسوڵمانان کەوتنە ژێر فشاری جاهیلییەتی هاوچەرخ و بوون بە پاشکۆی ڕۆژئاوای حاچ پەرست و فەساد وەکو دەریایەکی لێ هات و لە ناو کۆمەڵگای خۆماندا شەپۆل دەدات و خەڵکانێکی زۆری تێدا لەنێو دەچن ودەخنکێن.

١٣- ئەم باسە تەنها خستنەرووی حوکمی فرەژنییە لە ئیسلامدا، هەرگیز بەمەعنای ئەوە نایەت کە وردبوونەوەو لێکۆڵینەوە لەو کەسەی هاوسەرگیری لەگەڵدا دەکرێت یان یان ژنی پێ دەدرێت لێکۆڵینەوە لە حاڵی نەکرێت، بەڵکو ئە کارە بۆ هەردوو لا زۆر پێویستە، هەروەها باسی ئەو سیفات و ئاکار و خەسڵەتانەش نەکراوە کە پێویستە هاوسەران خۆیانی پێ جوان بکەنەوەو ڕەوشت بەرزی ئیسلامی خۆیانی پێ بسەلمێنن، ئەوە مەسەلەیەکی ترەو پێویستە و بەتایبەتی بۆ ئەو پیاوەی کە هاوسەرگیری دووەم و زیاتر دەکات، ئەگەر هەر کەموکورتییەکی لێ وەدی بکرێت بەرانبەر هاوسەری پێشووی ئەوە ڕەوشتێکی ناشیرین و نامۆ و دوورە لە ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلام، کە بەداخەوە ئەمە لە ناو بڕێك لەوانەی هاوسەرگیری دووەم دەکەن لە کوردستاندا دەبینرێت و ئیسلامیش لەو خەسڵەتە ناشیرین و نزمانە بەرییە، پیاوی موسوڵمان کە هاوسەرگیری دووەم

دەكات، دەبێت ئاكاری بەرز بێت كەسایەتی بەهێز بێت، دادگەر بێت لە نێوان هاوسەرەكانیدا، بەوەفا بێت بەرانبەر هاوسەری یەكەمی، لە پێدانی هیچ مافێكدا هیچ جیاوازی و نادادگەرییەك لە نێوانیاندا نەكات.

پوختەی باسەكە ئەوەیە تەشریع كردنی فرەژنی لە ئیسلامدا، ڕەچاو كردنە بۆ بەرژەوەندی ئافرەت بۆ ئەوەی لە هاوسەرگیری مەحروم نەبێت، هەروەها رەچاوكردنە بۆ بەرژەوەندی پیاو بۆ ئەوەی تووشی تاوان نەبێت و لەبەر ژەوەندییەكانی فرەژنی بێ بەش نەبێت، بەڵكو ڕەچاو كردنە بۆ بەرژەوەندی ئوممەت بۆ ئەوەی ژمارەی موسوڵمانان زۆر بن ونەوەی موسوڵمان زیاد بكات، (تعدد) شەریعەتێكی پەروەردگارە بە حیكمەت وزانستی ڕەهای خۆی دایبەزاندووە، هەركەسێكیش تانە لەو تەشریعە بدات، بەسیرەت و بینایی دڵی كوێر بووە و پاڵنەرەكەشی یان كوفرە وەكو زۆرێك لە بێباوەڕان ئەم سەردەمە ئەنجامی ئەدەن وداخی دلی خۆیان لە ئیسلام لە ڕێگەی دژایەتی فرەژنی دەردەبڕن، واتە نیفاق و دژایەتی ناڕاستەوخۆی شەریعەتی ئیسلامە جا بەو شێوە دەریدەخەن، یان جەهل و توانەوەیە لە واقیعی دوور لە ئیسلامی ئەم سەردەمەدا، كە لە شێوەی گەردەلولێكی جاهیلی وبەرەنگاربوونەوەی شەریعەتدا خۆی دەبینێتەوە و لە ڕۆژئاواو شوێنكەوتوانیانەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵأم لێرە هەندێ ناخ ڕووخاو و بە گومان لە حوكمەكانی ئیسلام بەناو ئیسلامەوە ئەو ئەجیندایە جێبەجێ دەكەن.

# پەیامی نۆزدە: پوختەیەك دەربارەی سوڕی مانگانە

شارەزابوون لە حوکم وحاڵەتەکانی بێ نوێژی، یان سوڕی مانگانە (الحيض)، ئەرکێکی سەرەکی و گرنگە لەسەر ئافرەتانی موسوڵمان دەبێت بیزانن، چونکە زۆر مەسەلەی تر لە شەریعەتدا بەو مەسەلەوە بەستراوە، وەکو نوێژ و ڕۆژوو وسەرجێیی و تەڵاق و چەندین پرسی شەرعی تر.

زانایان بۆ ئاسانکردنی شارەزا بوون لە حوکمەکانی بێ نوێژی، لە چەند خالێکی گرنگدا ئەو باسەیان خستووەتە ڕوو، منیش لێرەدا هەوڵ ئەدەم پوختەیەکی بەسوود لە قسەکانی ئەوان هەڵبژێرم وبیخەمەڕوو:

١. نوێژکرنی فەرز وسونەت حەرامە لەسەر ئەو ئافرەتەی لە سوڕی مانگانەدایە، بەڵام بۆ نموونە ئەگەر کەمێك دوای بانگی مەغریب تووشی بێ نوێژی بێت، ئەوە کاتی پاك بوونەوە گێڕانەوەی نوێژی مەغریبی دەکەوێتە سەر، یان بۆ نموونە کەمێك پێش خۆر هەڵاتن بە ئەندازەی ڕکاتێك نوێژ ئەگەر تووشی بێ نوێژی بێت دوای پاك بوونەوەی پێویستە نوێژی بەیانی بگێڕێتەوە.

بەڵام زیکر و تەسبیحات و خوێندنەوەی فەرمووده و زانستە شەرعییەکان و گوێگرتن لە قورئان و لەسەر بۆچوونی پەسەند خوێندنەوەی قورئانیش هەمووی درووستە وکێشەیەکی شەرعی تێدا نییە، بەڵام بۆ قورئان خوێندن باشترە ڕاستەوخۆ لاپەڕەکانی هەڵنەداوەتەوە، بەڵکو بە شتێکی تر ئەو کارە بکات، لە زنجیرەی وەڵامی پرسیارەکانتاندا، بە شیکراوەیی باسی حوکمی قورئان خوێندنی ئافرەتم کردووە لە کاتی سوڕی مانگانەدا.

٢. ڕۆژووگرتنی فەرز و سوننەت، هەمووی حەرامە لەسەر ئەو ئافرەتەی لە بێ نوێژیدایە، بەڵام لە دوای پاکبوونەوە، ڕۆژووی فەرز دەبێت بگێڕێتەوە، بە پێچەوانەی نوێژ کە نایگێڕێتەوە، دایکی ئیماندارانن عائیشە دەفەرموێ: (كان يصيبنا ذلك ـ تعني الحيض ـ فنؤمر بقضاء الصوم ولا نؤمر بقضاء الصلاة)[١]

ئەگەر ئافرەت بەڕۆژوو بوو پێش مەغریب هەستی بەسەرەتاکانی بێ نوێژی کرد بەڵام تاکو بانگی مەغریب خوێن نەهاتە خوارەوە، ڕۆژووەکەی درووستە و عەیبی نییە، بەڵام ئەگەر بانگی بەیانی بوو ئەو هێشتا لە حەیزدا بوو ناتوانێت ئەو ڕۆژە بگرێت با لەدوای بانگیش بە کاتێکی کەم پاك بێتەوە.

[١] - متفق عليه.

٣. هەموو جۆرە تەوافێك لەسەر ئەو ئافرەتەی لە سوڕی مانگانەدایە قەدەغەیە، بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ كاتێك دایكی ئیماندارن لە كاتی حەجدا تووشی حەیز دەبێت پێی دەفەرموێت: (افعلي ما يفعل الحاج غير ألا تطوفي بالبيت حتى تطهري)[١] واتە هەموو ئەوەی حاجیان دەیكەن تۆیش بیكە، جگە لە تەواف كردنە بەیت نەبێت.

تەوافی حەج و عومرەش هەر لەسەری دەمێنێت تاكو پاك دەبێتەوە ئەو كاتە ئەنجامی دەدات، بە پێچەوانەی تەوافی ماڵ ئاوایی (الوداع) كە لەسەری دەكەوێت و نایگێڕێتەوە.

٤. ئافرەت لە كاتی حەیزدا حەرامە بچێتە ناو مزگەوتەوە، لەبەر ئەو فەرموودەی لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە: (يعتزل الحيض المصلى)[٢]. بەڵام هەندێك لە زانایانیش بە درووستیان زانیوە.

---

[١] - البخاري (٣٠٥)، ومسلم (١٢١١).
[٢] - متفق عليه

٥. حەرامە لەسەر پیاو لەو کاتەی ژنەکەی لە سوڕی مانگانەدایە بچێتە لای بۆ سەرجێی کردن، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذىً فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ﴾[1]. بەڵام جگە لە سەرجێیی نەبێت، هەموو شتێکی تری بۆ حەڵاڵە لەگەڵ خێزانەکەیدا بیکات، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( اصنعوا كل شيء إلا النكاح )[2]

شایانی باسە زانستی پزیشکی لە دوای چواردە سەدە لەوەی قورئانی پیرۆز سەرجێی کردنی پیاوی لەگەڵ ژندا لە کاتی بێ نوێژی حەرام کرد و بە (أذى) ناوی برد، گەیشتە ئەوەی کە ئەو کارە لەو کاتەدا نەگونجاوەو بۆ تەندروستی زیانبەخشە.

٦. حەرامە لەسەر پیاو خێزانی لە کاتی حەیزو بێ نوێژیدا تەڵاق بدات و بەو کارە گوناهبار دەبێت، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[3] جێبەجێ کردنی ئەم ئایەتەش تەنها لە حاڵێکدا دەبێت کە ئافرەتەکە دووگیان بێت یان لە حەیز پاك بووبێتەوە و مێردەکەی نەچووبێتە لای.

---

[1] - البقرة:٢٢٢

[2] - رواه مسلم .

[3] - الطلاق:١.

بەڵام زانایان سێ حاڵەتیان لەم مەسەلەدا جیاکردووەتەوە کە ئافرەتەکە با لە حەیزیشدا بێت تەڵاقی هەر دەکەوێت:
یەکەم: ئەگەر تەڵاقەکە دوای مارەبڕین و پێش ئەوە بێت پیاوەکەی چووبێتە لای (الدخول).
دووەم: ئەگەر حەیزەکە لە حاڵەتی حەمل و دوو گیانی ئافرەتەکەدا بووبێت.
سێیەم: ئەگەر جیابوونەوەکە بە شێوازی خولع بێت و لەبەرانبەر پارەیەکدا بێت ژنەکە بیدات بە پیاوەکەی، لەو حاڵەتەدا درووستە وحەرام نییە.
هەروەها جێگای باس کردنە لێرەدا بوترێت: ئافرەت لە کاتی بێ نوێژیدا درووستە مارە بکرێت ودرووستە پیاوەکەی بچێتە لایشی، بەمەرجێك لەسەرجێی کردن بتوانێت خۆی بەدوور بگرێت تاکو ئافرەتەکە پاك دەبێتەوە .

٧. ئەگەر ئافرەت تەڵاق درا وحەملی نەبوو، عیددەکەی بە سێ جار بێ نوێژی حیساب دەکرێت، کە لەو ماوەیەدا مێردەکەی دەتوانێت بیگێڕێتەوە، یان بۆ شووکردن ئەگەر جارێکی تر نەگەڕێتەوە لای مێردەکەی لەبەر ئایەتی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ﴾[١]

---

[١] - البقرة:٢٢٨.

بەڵام ئافرەتی دووگیان، عیددەکەی بریتییە لە لەدایك بوونی مناڵەکەی. ئەو ئافرەتانەش کە گەیشتوونەتە تەمەنێك تووشی بێ نوێژی نابن، ئەگەر تەڵاق بدرێن عیددەکەیان سێ مانگە.

٨ . هەر کاتێك ئافرەت لە خوێنی بێ نوێژی پاك بوویەوە، واجبە لەسەری خۆی بشوات، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فإذا أقبلت الحيضة فدعي الصلاة، وإذا أدبرت فاغتسلي وصلي )[1] واتە: کە بێ نوێژیت تووش بوو، ئیتر واز لە نوێژ کردن بهێنە و، ئەگەر پاك بوویتەوە خۆت بشۆ.

- کەمترین واجب لە مەسەلەی خۆشۆردندا ئەوەیە ئافرەت کە پاك بوویەوە، ئاو بەر هەموو لاشەی بکەوێت.

- واجب نییە لەسەر ئافرەت ئەگەر قژی بەسترابێت لە کاتی خۆشۆردندا قژی بکاتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا, إنما يكفيك أن تحثي على رأسك ثلاث حثيات ثم تفيضين عليك الماء فتطهرين)[2]

- ئەگەر ئافرەت لە خوێنی حەیز پاك بوویەوە لە کاتی هەر نوێژێکدا، دەبێت پەلە بکات لە خۆشۆردن، بۆ ئەوەی ئەو نوێژەی ئەنجام بدات، ئەگەر لەسەفەر بوو، یان ئاوی دەست نەکەوت، یان نەخۆش بوو و نەیتوانی ئاو بەکار بهێنیت، دەبێت

---

[1] - رواه البخاري .

[2] - ابن حبان : ١١٩٨ .

(تیمم) بکات و نوێژەکەی ئەنجام بدات. چونکە ئەگەر پاك بوویەوە کات مابوو، ئەوە پاساو نییە بڵێت فریاناکەوم خۆم بشۆم، بۆیە لە ڕووی ناچارییەوە دەتوانێت تیمم بکات و نوێژەکەی ئەنجام بدات.

مەسەلەی سوڕی مانگانە (الحیض) لە ڕووی شەرعی و تەندروستییەوە قسەو باس زۆر هەڵدەگرێت، بەڵام لێرەدا هەر ئەوەندەم بە پێویست زانی بیخەمەڕوو، بۆ زانیاری زیاتر دەتوانن تەماشای هەر کتێبێکی فیقهی موعتەبەر بکەن، دوو نامیلکەی شیخ محمد صالح العثیمین یش هەیە بە جوانی و بەبەڵگەوە بابەتەکانی لە خۆ گرتووە ، بەناونیشانی: (رسالة في الدماء الطبيعية للنساء). و (ستون سؤالًا وجوابًا في أحكام الحيض).

# پەیامی بیست: پوختەیەك دەربارەی تەڵاق

مەسەلەی تەڵاق و جیابوونەوەی هاوسەران لە شەریعەتی ئیسلامدا، مەسەلەیەکی گەلێك گرنگە وپێویستە ژنان و پیاوان پێناسە و حوکم و ڕەهەندەکانی بزانن، لەم کورتە باسەدا، هەوڵ ئەدەم پوختەیەك دەربارەی ئەم پرسە گرنگە بخەمە ڕوو:

١- تەڵاق واتە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی هاوسەرگیری و کۆتایی هێنان بە ژیانی ژن و مێردایەتی، وشەی (الطلاق) ولێوەرگیراوەکانی چواردە جار لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە و ئەسڵی جیابوونەوەش درووستە و بەڵگەی لە قورئاندا هاتوە، وەکو ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ﴾[1]

بەهەمان شێوە لە سوننەتیشدا مەشروعیەتی تەڵاقدان لە زۆر فەرموودەدا جێگیر بووە، لەوانە کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب الله لێی ڕازی بێت خیزانەکەی خۆی لە کاتی سوڕی مانگانەدا تەڵاقدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

---

[1] - الطلاق: ١.

(مُرْهُ فليرُاجعها، ثم ليمسكها حتى تطهر، ثم تحيض، ثم تطهر، ثم إن شاء أمسك بعد، وإن شاء طلَّق قبل أن يمس، فتلك العِدَّة التي أمر الله أن تُطلَّق لها النساء)[1] واته با خێزانەکەی بگێڕێتەوە و لای بێت تاکو پاك دەبێتەوە و جارێکی تر دەچێتە سوڕی مانگانەوە و پاك دەبێتەوە، دوای ئەوە ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات و ئەگەر ویستی بیهێڵێتەوە.

٢- شەرعناسە گەورەکانی ئیسلام وەکو ابن قدامە لە (المغني؛ جـ١٠، صـ٣٢٣)دا فەرموویانە حیکمەت بە ڕوونی لەمەسەلەی تەڵاقدا دیارە، چونکە جاری وا هەیە ژیان لە نێوان دوو هاوسەردا مەحاڵ دەبێت و مانەوەیان پێکەوە زیانێکە بە هەردولایان دەگات و بەرژەوەندی لەو حاڵەتەدا ئەوەیە کە لەیەکتر جیا ببنەوە.

٣- تەڵاق بۆ ئەوەی تەڵاقێکی شەرعی بێت و بکەوێت، پێویستی بە هەبوونی چوار ڕوکن و کۆڵەکەیە:

یەکەم: هاوسەری پیاو: جگە لە مێردی ئەو ژنە کەس ناتوانێت تەڵاقی بدات.

دووەم: هاوسەری ژن: پیاو تەنها توانای هەیە ژنی خۆی تەڵاق بدات و تەڵاقەکەی تەنها لەسەر ئەو جێبەجێ دەبێت.

[1] - البخاري، ٥٢٥١، مسلم، ١٤٧١.

سێیەم: شێوازو دەربڕینی تەڵاقەکە: کە پێویستە بە ڕاشکاوانە بەراستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ، وشەیەکی ڕوون و ئاشکرا بەکاربێت وەکو: تەڵاقت کەوتبێت و قسەی هاوشێوەی تر.

چوارەم: پیاوەکە مەبەستی تەڵاقدان بێت، بۆ نموونە ئەگەر بە هەڵە و بەبێ مەبەست وشەی تەڵاق بێتە سەر زاریدا تەڵاقەکەی ناکەوێت؛ چونکە مەبەستی تەڵاقدان نەبووە.

٤- تەڵاق دوو جۆری هەیە، یەکێکیان تەڵاقی سونئەتییە و ئەوی تریان تەڵاقی بیدعییە، تەڵاقە سوننی ئەوەیە پیاو لە کاتیکدا خێزانی تەڵاق بدات لە بێ نوێژیدا نەبێت، بەڵکو لە سوڕی مانگانە پاك بووبێتەوە و پیاوەکەی نەچووبێتە لای دوای پاکبوونەوە و تەنها یەك تەڵاقیشی بدات نەك سێ بەسێ، الله فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[1]

تەڵاقی بیدعیش ئەوەیە پیاو ژنەکەی لە کاتی حەیز و نیفاسدا تەڵاق بدات، یان پاك بووبێتەوە بەڵام چووبێتە لای لەدوای پاکبوونەوەکەی، یان سێ بەسێ تەڵاقی دابێت بەیەك وشە بۆ نموونە بڵێت سێ بەسێ تەڵاقت کەوتبێت، یان سێ جار بەسەر یەکەوە بڵێت تەڵاقت کەوتبێت، هەموو ئەوانە تەلاقی بیدعی و ناشەرعی پێ دەوترێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی عیلم خیلافیان هەیە لەسەر کەوتنی

---

[1] - الطلاق: ١.

هەرسێ تەڵاقەکە و نەکەوتنی، ڕای پەسەندیش الله أعلم ئەوەیە تەڵاقی سێ بەسێ هەر یەکێکیان دەکەوێت، سەبارەت بە کەوتنی تەڵاقی ئەو ئافرەتەش کە لە بێ نوێژی و زەیستانیدایە، جومهری زانایان لەسەر ئەوەن کە تەڵاقەکە دەکەویت و هەندێکیش دەڵێن ناکەوێت، چونکە وتویانە تەڵاقدانی ئافرەت لەو کاتانەدا پێچەوانەی فەرمانی الله یە و ناکەوێت.

٥- بۆچوونی پەسەند لەلای زانایان ئەوەیە تەڵاقیش وەکو هەر مەسەلەیەکی تر دەچێتە ژێر پێنج حوکمە تەکلیفییەکانەوە، بۆیە: دەگونجێت تەڵاق حەرام بێت و پیاوەکە لەسەر تەڵاقدانی ژنەکەی تاوانبار بێت، دەشگونجیت تەڵاقەکە مکروە یان مستحب یان موباح بێت، هەر یەکەو بە پیی هۆکار و پاڵنەر و نیەتی خۆی، بەڵکو هەندێ جار تەڵاقدانی ئافرەت بە پێی هۆکارەکە رەنگە واجب بێت، حوکمی بە کورتی: تەڵاقەکە پیاوەکە باشی کردووە یان خراپ، تاوانبار دەبێت یان نابێت، لەسەر هۆکاری تەڵاقەکە ڕادەوەستێت.

٦- حەرامە و ئافرەت تاوانبار دەبێت داوای تەڵاق لە پیاوەکەی بکات بێ ئەوەی هۆکارێکی شەرعی هەبێت بۆ ئەو داواکارییەی، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيما امرأة سألت زوجها طلاقًا في غير ما بأس، فحرامٌ عليها رائحة الجنة)[1] واتە: هەر ئافرەتێك بەبێ هیچ هۆکارێك یان زیانێك داوای تەڵاق و جیابوونەوە لە مێردەکەی بکات، بۆنی بەهەشت ناکات. بۆیە دەبێت ئافرەتان لەو مەسەلە ترسناکەدا ترسی پەروەردگاریان هەبێت وداوای تەڵاق نەکەن، تاکو هۆکارێکی زۆر بەهێز لە هاوسەرەکانیاندا نەبینن وەکو بێ دینی ورەوشت خراپی وهۆکاری هاوشێوە، داوای جیابوونەوەیان لێ نەکەن. بێگومان تەڵاقدانی پیاویش بۆ خێزانەکەی بەبێ هۆکار ئەویش هەر کارێکی خراپ و ناشەرعییە وزانایان لە کتێبەکانی فیقهدا بە حەرام و هەندێکیان بە مەکروهیان داناوە.

[1] -(حديث صحيح) (صحيح أبي داود؛ للألباني، حديث ١٩٤٧).

٧- وەكو وتمان شێوازی تەڵاقدان یان بە ڕاشكاوانە دەبێت وەكو تەڵاقت كەوتبێت، لێت جیابوومەوە، یان هەر وشەیەكی تر كە مەعنای جیابوونەوە بگەیەنێت، تەنانەت ئەگەر بە سوعبەت و بۆ خۆشیشی بێت تەڵاقەكە هەر دەكەوێت، ئەمەش جیاوازە لەگەڵ ئەو خالەی پێشتر باسمان كرد كە دەبێت بەهەلە نەبێت و مەبەستی تەڵاقدان بێت، چونكە لەو حاڵەتەدا وشەی تەڵاق دیتە سەر زاری بەهەڵە بێت یان ئاگای لە خۆی نەبێت، نەك بۆ سوعبەت و گاڵتە كردن بێت ئەمەیان تەڵاقەكەی دەكەوێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثلاث جدهن جد وهزلهن جد: النكاح، والطلاق، والرجعة)[١] واتە: سێ شت هەن ڕاستیان ڕاستە و گاڵتەشیان هەر ڕاستە: مارەبڕین وتەڵاق و گێڕانەوەی ژن.

شێوەیەكی تریش هەیە بۆ تەڵاق ڕاشكاوانە نییە، كەوتنی تەڵاقەكە لەو حاڵەتەدا لەسەر نیەتی پیاوەكە دەمێنێت، نیەتی تەڵاق بووبێت دەكەوێت، نیەتیشی تەڵاق نەبووبێت ناكەوێت، وەكو: بڕۆ بۆ ماڵی باوكت، لە ماڵەكەم دەربچۆ، تۆ ئیتر ئازادی، من وتۆ ئیتر نامانكرێت پێكەوە و قسەی لەم شێوە، ئەمانە وەكو وتمان لەسەر نیەتی پیاوەكە دەمێنیت[٢].

---

(١) -(حديث حسن) (صحيح أبي داود؛ للألباني، حديث ١٩٢٠).

(٢) -(فتح الباري؛ ابن حجر العسقلاني، جـ٩ صـ٢٨٢).

٨- شەرعناسان بە پێی بەڵگەکانی کیتاب وسوننەت تەڵاق دەکەنە دوو بەشەوە:
یەکەم: تەڵاقی (رجعي) پێ دەوترێت، واتە ئەو تەڵاقەیە کە پیاو دەتوانێت بە وشەیەك خێزانە تەڵاقدراوەکەی بگێڕێتەوە تەنانەت ئەگەر خێزانی ڕازی نەبێت.
دووەم: تەڵاقی (بائن)ی پێ دەوترێت، واتە مێردەکە توانای نییە وەکو حالەتی یەکەم بە وشەیەك ژنەکەی بگێڕێتەوە، ئەویش دوو جۆرە: جۆرێکیان پێی دەوترێت (بائن بینونة صغری) واتە دەتوانێت بیگێڕێتەوە، بەڵام دوای ئەوەی جارێکی تر مارەی دەبڕێتەوەو مارەییەکی تازەی بۆ دیاری دەکات، بۆ نموونە تەڵاقێکی داوەو لە کاتی عیددەکەیدا نەیگێڕاوەتەوە، دوای ئەوە بەو شێوە دەتوانێت بیگێڕێتەوە.
جۆری دووەمی پیی دەوترێت (بائن بینونة کبری) ئیتر ئیتر بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە بیگێڕێتەوە، واتە دوای تەڵاقی سێیەم، مەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی تر بکات و ئەویش لەگەڵیدا ڕێك نەکەوێت و لەیەکتر جیاببنەوە، ئەو کات مێردی یەکەم دەتوانێت هاوسەری پێشووی بیگێڕێتەوە.

٩- زۆر مەسەلەی پەیوەندیدار بەم باسەوە هەیە وەکو تەڵاقی کەسێك تورە بێت و بەگاڵتەی بێت و هەروەها تەڵاقی سەرخۆش و ئەو کەسەی کە نیەتی تەڵاقە بەڵام هیچ دەرنابڕێت وتەڵاقی ئەو کەسەی بەزۆر ژنی پێی تەڵاق دەدرێت و ئەو کەسەی بە نووسین ژن تەڵاق دەدات وزۆر شتی تر ، باسم نەکردووە لەبەر ئەوەی شیکردنەوەی زۆری دەوێت و زۆربەشیان تاڕاددەیەك خیلاف وڕای جیاوازیان لەسەرە.

١٠- مەسەلەیەکی تریش هەیە زۆر گرنگە لەباسی تەڵاقدا ئەویش تەڵاقی هەڵواسراو، یان مەرجدار کە تەڵاقی (معلق)ی پێ دەوترێت، واتە کەسێك بە ژنەکەی بڵێت بۆ نموونە تەڵاقت کەوتبێت ئەگەر ئەمڕۆ لە ماڵ دەربچیت، یان ئەگەر بچیتەوە بۆ ماڵی باوکت و هەر مەرجێکی تر، لە ڕاستیدا ئەم مەسەلە قسەو باس زۆر هەڵدەگرێت، بەڵام بەڵگەکان لەسەر ئەوەن کە ڕای پەسەند ئەوەی تەڵاقی (معلق) واتە بەستراو بەمەرجێکەوە ناکەوێت، چونکە هیچ بەڵگەیەکی قورئان و سوننەتی لەسەر نییە کە بکەوێت و هاوکات لە بەرانبەریشدا بەڵگەش هەیە کە ئەو جۆرە تەڵاقە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە تەڵاق دانەنراوە، مەسەلەکەش خیلافیە لە نێوان زانایاندا.

١١- ئەگەر پیاوێك بە خێزانەکەی بڵێت حەرام بیت لە من، ئەوەش بەهەمان شێوە حوکمەکەی لەسەر نیەتی ئەو پیاوە ڕادەوەستێت، نیەتی تەڵاق بێت تەڵاقی دەکەوێت، نیەتی (ظهار) بێت، واتە ئەگەر بە خێزانەکەی بلێت وەکو دایکم وخوشکم بیت، کەفارەتی (ظهار )ی دەکەوێتەسەر، ئەگەریش نیەتی سوێندێکی ئاسایی بێت کەفارەتی شکاندنی سوێندی دەکەوێتەر سەر.

١٢- جۆرێکی تر لە تەڵاقدان هەیە لەشەرعدا خولعی پێ دەوترێت، کە بریتییە لە جیابوونەوەی ئافرەت لە مێردەکەی بەرانبەر بڕێك پارە یان گێڕانەوەی مارەییەکە بۆ مێردەکەی و ئەویش لەبەرانبەر ئەوە تەڵاقی بدات، بەڵگەی مەشروعیەتی خولع ئایەتی قورئانە: ﴿وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلا أَنْ يَخَافَا أَلا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾[1]

سەبارەت بەو هۆکارانەی کە ئافرەت دەتوانێت لە ڕیگەی خولعەوە داوای جیابوونەوە لە مێردەکەی بکات، شێخ عبدالله بن جبرين دەڵێت:

- بۆ نمونە پیاوەکە زۆر توندوتیژ و تورە بێت و بە بچووکترین هۆکار سەرکۆنەی ژنەکە بکات وڕەخنەی لێ بگرێت.

[1] - البقرة / ٢٢٩ .

- ئەگەر ئافرەتەکە حەزی لە شەکل وسیمای مێردەکەی نەبێت لەبەر ناشیرینی و نوقسانی ئەندامەکانی و شتی لەو شێوە.

- ئەگەر پیاوەکە دینی لاواز بێت وەکو نوێژنەکردن و نەڕۆیشتن بۆ جەماعەت وڕۆژوونەگرتن و ئەنجامدانی کاری خراپە و فسق وفجور.

- ئەگەر چروك و ڕەزیل بێت و نەفەقەو خەرجی بۆ خێزانەکەی نەکات و جلوپۆشاك و پێویستییەکانی بۆ دابین نەکات لەکاتێکدا توانایشی هەبێت.

- ئەگەر لە مەسەلەی سەرجێییدا توانای نەبیت مافی ژنەکەی بدات، بۆ نموونە نەخۆش بێت، یان حەزی لە ژنەکەی نەبێت، یان ناعەدالەت بێت و لەلای ژنێکی تری بمێنێتەوە، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا ئافرەت بۆی هەیە داوای جیابوونەوە لە مێردەکەی بکات، لەبەرانبەردا پارەیەك یان ماڵێکی پێ بدات یان مارەییەکەی بۆ بگێرێتەوە.

١٣- فەرموودەی: (أبغض الحلال إلى الله الطلاق) فەرموودەیەکی صحیح نییە و فەرموودەناسان بە هۆی نەبوونی مەرجەکانی ڕاست ودرووستی سەنەدەوە ڕەتیان کردووەتەوە، بەڵام مەعناکەی ڕاستە و طلاق بۆ حاڵەتی ناچاری تەشریع کراوەو لە ئیسلامدا وەکو حالەتێکی نەخوازراو تەماشا دەکرێت، مەگەر هۆکارێکی پەسەند هەبێت وەکو ئەوەی ئافرەتەکە کێشەی لە دین و ڕەوشتیدا هەبێت، یان بەهەر هۆکارێکی تر ژیان لە نێوان ئەو دوو هاوسەرەدا مەحاڵ بێت و لەو حاڵەتانەدا تەڵاق چارەسەرە، بەڵام ئەگەر لە حاڵەتی تردا کە دەکرێت سازش و ئاشتەوایی ولێکتێگەیشتن بکرێت لەگەڵ ئەوەشدا پەنا بۆ طلاق دەبرێت ئەوە کارێکی باش نییە و پیاوەکەو خێزانەکەشی ئەگەر هۆکار بن لەو جیابوونەوە تاوانبارن.

بۆ بەشێك لەم نووسینە سوودم لە بابەتی (الطلاق وأحكامه في الإسلام)ی صلاح نجيب وەرگرتووە و وهەروەها بۆ چەند سەرچاوەیەکی تریش گەڕاومەتەوە وەکو کتێبی ( المفصل فی أحكام المرأة والبيت المسلم) وهەندێ فەتوای زانایان لەسەر مەسەلەی تەڵاق.

# پەیامی بیست و یەك: لەم سەرپێچیانە خۆت بپارێزە!

شەریعەتی ئیسلام هەمووی بۆ بەختەوەری و سوودی مرۆڤەکان هاتووە، بۆیە کاتێك موسوڵمان سەرپێچی ئەو شەریعەتە دەکات، کارەکەی بە زیانی خۆی تەواو دەبێت ولەسەری تاوانبار دەبێت، لێرەدا چەند سەرپێچییەك لەوانەی ئافرەتان ئەنجامی ئەدەن و زیانی بۆ خۆیان و بۆ بۆ دەوربەریشیان هەیە دەخەینە ڕوو :

١- بە هیچ شێوەیەك و تا پێت دەکرێت، نوێژەکانت دوا مەخە و لە کاتی دیاریکراوی خۆیاندا ئەنجامیان بدە، چونکە نوێژ دروشمی هەرە گەورەی موسوڵمانێتی تۆیە و کەمتەرخەمی لە نوێژدا نیشانەی ئەوەیە بەباشی دەستت بە دینەکەت نەگرتووە، کە کاتی نوێژەکەت هات، واز لە هەموو شتێکی تر بهێنەو ڕوو لە نوێژەکەت بکە. ئەگەر میوانت بوو، ئەگەر کاتی چێشت کردن و ئیشی ماڵ بوو، ئەگەر دەرچوون و خوێندن و دەرس و هەر وابەستەبوونێکی ترت بوو، هەر هەمووی بخەرە لاوەو بڵێ نوێژەکەم پێش هەموو شتێکە.

٢- هەرگیز نابێت بە خەیاڵ و دڵیشتدا بێت، بیر لەوە بکەیتەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان، لەژێر هەر فشار و کێشەو ناخۆشییەکدا کە بێتە ڕێت، بچیتە لای ساحیر و فاڵچی و کتێب گرەوەو ڕمڵ لێدەر، یان یەنا ببەیت بۆ خوێندنەوەی فنجان وناو دەست، یان باوەڕت بە بورجەکان وکاری هاوشێوەی تر هەبێت، چونکە ئەوە لە دینەکەت داتدەماڵێت و موسوڵمان بوونت سفر ئەکاتەوە، تەنها پشت بە پەروەردگارت ببەستە و تەوەکول لەسەر ئەو بکە.

٣- هەمیشە مێرد ومناڵت وەکو ئەمانەتێك تەماشا بکەو لەوەی پێت دەکرێ گرنگییان پێ بدە، ئەوەت لەبیر بێ هاوسەرەکەت بەهەشت و دۆزەخی تۆیە، واتە بۆی هەیە بە بایەخدانت پێی و گوێڕایەڵیت لە چاکەدا بۆ فەرمان و داواکارییەکانی ودابین کردنت بۆ پێویستییەکانی، یان ئامۆژگاری خێرت بۆی، ئەو ببێتە هۆکاری چوونە بەهەشتت، بە پێچەوانەشەوە، بۆی هەیە بە ئیهمال کردنت بۆی و لەناحەق دڵتەنگکردنی و هەڵنەسانت بە دابین کردنی پێویستییەکانی، ئەو ببێتە هۆکاری چوونە دۆزەخت، با نوێژو وعیبادەتەکانیشت هەبێ ئەو مەسەلە هەر وەکو مەرجێك بۆ دینداریت دەمێنیتەوە، بەڵگەش لەسەر ئەم قسە لەشەرعدا زۆرە، مناڵەکانیشت بەهەمان شێوە فێری نوێژو قورئان و ڕەوشتی جوانیان بکە، لەسەر ڕێزگرتن لە شەریعەت و بنەمای بیروباوەری ئیمان و تەوحید پەروەردەیان بکە، بۆ ئەوەی کە گەورە بوون ئەو پەروەردەکردنەت لە کەسایەتیاندا ڕەنگ بداتەوە.

٤- هەموو کەسێك لەم دونیایە، مردنێك قەرزاردەو مردن تیرێکەو لە کەوان دەرچووە ئەوەندەی ماوە بگاتە جێگای خۆی! بۆیە ئەگەر ئازیزێك و کەسێکی نزیکت مرد، ئەوە قەدەرە و ڕۆژی تەواو بووە، تۆ تەنها ڕازی بوونت لەسەرە، ڕێگە مەدە بە خۆت بە ناشوکری و دەنگ بەرز کردنەوە بەقیژە وگریان و هاوار کردن، الله بە خۆت توڕە بکەیت، بەڵکو خۆراگربەو بزانە ئەوە تاقیکردنەوەیەکی ئیلاهییە، دەبێت هەوڵ بدەیت تێیدا بەسەکەوتوویی نەك بەشەرمەزاری وتاوانباری لێی دەربچیت.

٥- یەکێك لە دیارترین و گرنگترین پێوەرەکانی ڕاستگۆیی تۆ و بەهێزبوونت لە دینداریتدا، جلوبەرگ و پۆشاکەکانتە، خۆت چاك دەزانی چۆن دەتوانیت جلەکانت بەو شێوە لێ بکەیت کە الله لە خۆت ڕازی بکەیت، دەبێت پۆشاکت ڕەنگاورەنگ و بۆندار وتەسك و تەنك وسەرنج ڕاکێش نەبێت، دەبێت پۆشاکەکەت ناونیشان و دروشمی وابەستەبوونی تۆ بێت بە ئیسلامەوە و هەرکێ بتبینێت ئیسلامت بەبەرجەستەکراوی تێدا ببینێت وبۆی دەربکەوێت تۆ نموونەی دەست گرتنی بە دینەکەت.

٦- با ماڵەکەت جێ پەنجەی دینداریتی پێوە دیار بێت، بۆ نموونە نابێت وێنەی هیچ مرۆڤ وگیانداریێك هەڵواسرابێت، نابێت هیچ قاپ کەوچك و کەرەستەیەکی لەو جۆرە لە ئاڵتون و زیو بن، با هەرچەند دەوڵەمندیش بن، نابێت گۆرانی و مۆسیقا لەناو ماڵەکەتدا ببیسرێت چونکە گۆرانی و مۆسیقا بە یەقین حەرامە، تەنانەت نابیت تابلۆی ئایەت و ناوی الله ومحمد ﷺ هەڵبواسرێت چونکە ئەوەش بیدعەیە، بەڵکو دەبێت مناڵەکانت لەسەر بیستنی قورئان ڕابهێنیت چونکە ئەوە بۆ داهاتووی ژیانیان گەورەترین کاریگەری باشی دەبیت لەسەریان، تەنانەت لەو کاتانەش کە یاری ئەلیکترۆنیش دەکەن بۆ نموونە لەگەڵیدا ڕایان بهینە با گوێ لە قورئان بگرن.

٧- لە مەسەلەی هاوسەرگیری و لەکاتی گواستنەوەی کچدا بۆ ماڵی هاوسەرەکەی، زۆر گرنگە لەو کاتەدا نەك دەست بەرداری هیچ حوکم و لایەنێکی دینەکەت نەبیت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوە کاتی دەستگرتنە بە شەرع و فەرمانەکانی پەروەردگارتەوە، دەبێت خۆت لەو کارە ناشەرعییانەی دەکرێت بپارێزیت، وەکو لەبەر کردنی ئەو جلە سپییە بەتایبەت ئەگەر ڕەچاوی شەرعی تێدا نەکرێت و، هەروەها ڕۆیشتن بۆ سالۆنی جوانکاری و خۆ نمایشکردن بۆ خزمان و خەڵکی، هەموو ئەوانە تاوانە و سەرەتایەکی زۆر خراپە بۆ دەست پێکردنی ژیانی هاوسەرگیری.

٨- با دەرچوونت لەماڵ زیاتر بۆ کاری پێویست بێت، نەك بۆ هەموو شتێك هەر دەربچیت، بەتایبەتی مەسەلەی دەرچوون بۆ بازاڕەکان، کە بووەتە جێگای خراپە و ئەوەی الله پێی ناخۆشە لەوێ دەکرێت ودەبینرێت، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَلا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾[1] لەڕاستیدا ئەم سەردەمە بەهەر لایەکدا بچیت تاوان و گوناه وسەرپێچی ڕووبەڕووتە، بەتایبەتی لە مۆڵ وبازاڕەکاندا.

٩- تێکەڵ بوون لەگەڵ خزمانی نامەحرەم کێشەیەکی شەرعی زۆر گەورەیە دەبێت خۆتی لێ بپارێزیت و گوێ بەوە نەدەیت لەسەر ئەوە چیت پێ دەوترێت، ڕەزامەندی الله و دینەکەت لە رەزامەندی خزمەکانت باشترە، ئەو کەسەی لەسەر پارێزگاریکردنت لە سنووری شەرع لۆمەت بکات نابێت گوێی پێ بدەیت، تەنانەت ئەگەر مێرد و سەرپەرشتیاریش داوای ئەوەت لێ بکات لەگەڵ ئەو خزمە نامەحرەمانە زۆر تێکەڵ بیت وبەبێ جلی شەرعی تەواو بچنە نێو هەموو قسەو باسێکەوە نابێت بەقسەی بکەیت، چونکە، لە فەرموودەدا هاتووە: (على المرءِ المسلم السمْع والطاعة فيما أحبّ وكَرِه إلا أن يُؤمَر بمعصية، فإن أُمِرَ بمعصية فلا سَمْع ولا طاعة)[2]

---

(١) - الأحزاب: ٣٣.

(٢) - رواه مسلم.

١٠- جگە لە هەندێ حاڵەتی زەروری و بە مەرج و ڕێوشوێنی خۆی نەبێت، ئەسڵ ئەوەیە ئافرەت نابێت بەتەنها خۆی و بەبێ مەحرەم سەفەر بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَا تُسَافِرْ الْمَرْأَةُ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ)[١]. بۆیە سەفەری ئافرەت بەبێ مەحرەم حەرامە جگە لە هەندێ حاڵەتی حەج و عومرە و هیجرەت نەبێت کە زانایان باسیان کردووە.

١١- هەمیشە وەکو داعی و بانگخواز خۆت ببینە، با زانستیشت کەم بێت، گرنگ ئەوەیە ئەوەی کە دەیزانیت تەواو بێت و لێی دڵنیا بیت، هەموو هەلێکی یەك بینبنت لەگەڵ ئافرەتاندا بقۆزەوە، بۆ ئامۆژگاری و بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی، ئەگەر لە ڕووی تەجوید وعەقیدەوە، بۆ نموونە تەنها سوڕەتی الفاتحة و الإخلاص بزانیت و بۆ ئافرەتانی باس بکەیت ئەوە کارێکی مەزنە، ئەگەر تەنها فەرموودەکانی کتێبی (الأربعين النووية) یان چەند فەرموودەیەکی دیاری کراوی لەبەر بکەیت و واتاکانی بزانیت و باسی بکەیت، ئەوە کارێکی پیرۆز و گەورەی ئەنجامی بدەیت.

---

[١] - البخاري (١٧٢٩) ومسلم (٢٣٩١)

١٢- ئەمڕۆ لەناو موسوڵمانانداا غەیبەت کردن بووەتە ئافات و نەخۆشییەکی بەربڵاو، زۆربەی زۆری خەڵکی ئەنجامی ئەدەن و ئاسایی بوەتەوە لەلایان، گرنگە تۆی ئافرەتی ئیماندار ببیتە نموونەیەکی جوانی بەرجەستەکەر بۆ شەرع، هەر کاتێك غەیبەتی کەسێك کرا، بەشداری نەکەیت و ڕێگە لەوانی تریش بگریت لەبەردەمتدا بیکەن.

١٣- لە خۆباییبوون و لە خۆڕازیبوون با سیفەتێکی دوور بێت لەتۆی ئافرەتی ئیماندار، بەڵکو پێویستە زۆر وریای ئەم حاڵە بیت چونکە لەناو ئافرەتاندا بوونی هەیە و زۆر جار جوانی و باشی گوزەران و تایبەتمەندی مێرد و منداڵ و خانووی باش و سەیارەی باش ومۆدێل بەرز و شتی تر بە شێوەیەك لە شێوەکان دەبێتە هۆی غرور و لە خۆباییبوونی ئافرەتان، ئەوەش بۆ خۆی سیفەتێکی ناشیرینە و مایەی تاوانبارییە.

١٤- زۆر پێویستت بە تەرخان کردنی کاتە بۆ عیبادەت، با کاتێکی کەمیش بێت، گرنگ ئەوەیە بەردەوام بیت لەسەری، وەکو قورئان خوێندن و زیکرەکانی بەیانی و ئێواران، هەروەها بۆ خوێندنەوەی کتێب و زانستە شەرعییەکان، ئەوە ئەوپەڕی کاریگەری باشی بۆ دونیاو دوارۆژت دەبێت إن شاء الله.

١٥- گرنگی زۆر بە هەڵبژاردنی هاوڕێ بدە، لەناو ئافرەتاندا ئافرەتی وا هەیە ئەگەر نزیکت بێت، بەناڕاستەوخۆ و لەڕێگەی گرنگیدانی زۆر و لە ڕاددەبەدەر بە دونیا، لە ئەجرو پاداشت و کاری ئیمانی و کۆشش بۆ قیامەت دوورت دەخاتەوە دڵت دەمرێنیت و کات بە فیڕۆ دەدات، تەمەنیش بە خێراییەکی زۆر تێپەڕ دەبێت و لەسەر مرۆڤەکان حیساب دەکرێت.

١٦- سیلەی ڕەحم و خزمایەتی مەبڕە وبەجێی بهێنە، بەتایبەت بۆ باوك ودایك دەبێت لە هەموو حالەتێکدا بەردەوامیت هەبێت لەگەڵیاندا، جگە لەوان مەسەلەکە لەسەر حاڵ و دەستگرتنی ئەو کەسانە بەدینەوە ڕادەوەستێت، تەنانەت ماڵی براو خوشکیش، ئەگەر دوور بن لە دین و لە ماڵیاندا ڕەچاوی شەرع نەکرێت و سنووری حەڵاڵ وحەرام ڕێزلێگیراو نەبێت، بۆ نموونە تێکەڵ بوون و گۆرانی و مۆسیقا و گوناهو سەرپێچی تر ئەنجام بدرێت، درووست نییە بە پاساوی سیلەی ڕەحمەوە بەشداری سەرپێچییەکانیان بکەیت، بەسە بەتەلەفون یان بە هەر ڕێگەیەکی تر ئەو سیلەی رەحمە بەجێ بهێنیت،
ماڵی خەسوو وخەزورانیش بۆ ژن و پیاویش بە سیلەی ڕەحم ناژمێردرێت، بەڵام چاکە لەگەڵ هەرکەسێکدا کە شایستەی چاکە بێت و لە سنووری شەرعدا بێت، کارێکی باشە و عەیبی نییە.

١٧- هەموو شتێك لە چوارچێوەی قەدەر و ویستی الله تعالی وەربگرە و لە هیچ شتێك ڕەش بین مەبە و تشاؤم مەكە، لە هیچ مەترسە و بڵێت ئەمە شوومە.

با مەسەلەی ترس لە حەسوودیش ژیانت لێ تاڵ نەكات و وا گومان ببەیت خەڵكی ئیشیان نییە خەریكی حەسوودی بردنن بە تۆ و مناڵ و مێرد و سەیارەو خانووتان، زۆر جار ئەوە گومانێكە شەیتان بۆتی دروست دەكات، ئەگینا خۆ تۆ ناو دڵی ئەو كەسەت لەت نەكردووە، ئەگەر ئێرەیشتان پێ ببەن لە دەرەوەی دەسەڵاتی الله هیچیان پێ ناكرێت، بۆیە پشت بەپەروەردگارت ببەستە و معوذات و زیكرەكانی بەیانی و ئێواران بخوێنەو ئیتر لە هیچ مەترسە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيرَةَ، وَلاَ هَامَةَ وَلاَ صَفَرَ، وَفِرَّ مِنَ المَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ)[١].

١٨- درۆ جۆری گەلێك زۆرە، لە هەموویان خۆت بپارێزە، ڕوسوری لای الله و بەندەكانی دەبیت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)[٢]. هەروەها هیچ كات ئازاری دراوسێت مەدە و لێبوردە بە ئەگەر هەڵەیان بەرانبەرت كرد، وریای ئەوەش بە زمانت بەرانبەر هیچ كەسێك، نەفرەت و لەعنەتی پێدا بێت.

---

[١] - رواه البخاري (٥٧٠٧).

[٢] - البخاري (٣٣).

١٩- ڕێز لە کات بگرە و وەکو گەنجینەیەکی بەنرخ تەماشای بکە، بەتایبەتی وریای قسەو دەمەتەقەی بێ سوود و تەلەفۆن کردنی دوورو درێژبە، چونکە ئەگەر ئەوە بکەیتە خوو ، بەشێك لە تەمەنت بەزایە دەچێت، کات کوشتن یەکسانە بە جۆرێك لە خۆکوشتن وبەزایەدانی تەمەن. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالفَرَاغُ)[1].

٢٠- پاراستنی تایبەتمەندی خۆت وەکو ئافرەت، ئەوە ئەرکێکی شەرعی و پێویستییەکی کەسایەتی و دونیایی خۆتە، حەرامە لە جل و بەرگدا لاسایی پیاوان بکەیتەوە: (لعن الله الرجل يلبس لبسة المرأة والمرأة تلبس لبسة الرجل)[2].. لەناو کورددا لەبرکردنی ژنان بۆ شەرواڵ بۆ ئیشکردن و مەبەستی تر هەیە، ئەوەش سەرپێچییەك و تاونێکی گەورەیە، بەڵکو ئافرەت نابێت لە هیچ شتێکدا لاسایی پیاو بکاتەوەو بە پێچەوانەشەوە هەر وایە و بە پێی فەرموودە بەر لەعنەت دەکەون ئەگەر ئەو کارە بکەن،. (لعن رسول الله ﷺ المتشبهين من الرجال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجال)[3]

(١) - البخاري (٦٤١٢).
(٢) - رواه أبوداود (٤٠٩٨)
(٣) -[رواه البخاري والترمذي وأبو داود].

## پەیامی بیست و دوو: ئافرەتی باش دەبێت چۆن بێت؟

نییە لە کەلامی الله تعالی و لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەکەی ﷺ سەرچاوەیەکی باشتر و بە سوودتر بۆ مرۆڤەکان کە هاندەر و یارمەتیدەریان بێ بەرەو گەیشتن بە سەرفرازی دونیاو دوارۆژ، بۆیە لەم کورتە باسەدا و لە روانگەی ئەو دوو سەرچاوە سازگارەوە گرنگترین سیفەتەکانی ئافرەتی چاك دەخەینە ڕوو.

١- ئافرەتی باش، ئافرەتێکی دڵسۆزو ڕاستگۆیە لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا، ئافرەتێکە تەوبەکارە و پەروەردگاری خۆی لە هەموو هەنگاوەکانی ژیانیدا لەبیرە و هەمیشە بۆلای دەگەڕێتەوە. متمانەشی بە پەروەردگاری خۆی هەیە و پشتی پێ دەبەستێت کە لە هیچ تەنگانە و ناخۆشییەکی ئەم ژیانەدا بەتەنها بەجێی ناهێڵێت.

٢- ئافرەتی باش، موسوڵمانێکی راستگۆیە و باوەڕی بەقەزاو قەدەر هەیە و هەرچی بەسەردا بێت، یان بەسەر هەر ئازیزو نزیکێکیدا بێت، دڵنیایە کە ئەوە قەدەرەو نووسراوە، سەبری لەسەر دەگرێت.

٣- یەکێکی تر لە سیفەتەکانی ئافرەتی باش ئەوەیە، لە قورئان دوور ناکەویتەوە، کەلامی الله دەکات بە هاوڕێ و هاودەمی ژیانی و، کارێکی وا دەکات هەمیشە لەناو ماڵەکەیدا ببیسرێت و لە دڵی منداڵەکانیدا خۆشەویستی دەکات.

٤- گرنگیدان بە فێربوونی زانستی شەرعی، یەکێکە لە خەسڵەتە هەرە لە پێشەکانی ئافرەتی باش و، بەگوێرەی توانا بایەخی پێدەدات، بەتایبەتی زانستی عەقیدە و فەرموودە و فیقهو تەفسیر و ژیانامەی پێغەمبەر ﷺ هەروەها لەوەی کە نایزانێت لە کاروباری دینەکەی، پرسیار لە ئەهلی عیلم دەکات و، هاوکات ئەوەشی کە فێری بووە بە خەڵکی تری دەڵێتەوە و فێریان دەکات.

٥- ئافرەتی باش، خاوەن کەسایەتییەکی تۆکمە و بەهێزە، خۆی بەشتی نزم و بچووکەوە سەرقاڵ ناکات، کە پێی بوترێت قال الله و قال الرسول ﷺ، ڕادەوەستێت و دەڵێت سمعنا و أطعنا. با نەفسی خۆیشی حەز بەو شتە نەکات.

٦- ئافرەتی باش، هیچ کاتێك چاکەی دایك و باوکی خۆی لەبیر ناکات و بەسۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا، گوێڕایەڵییان لەسەر هەرندێك عیبادەتی تطوع و نافیلەش پێش دەخات، بەڵکو هەموو ئەوەی باوك ودایکی خۆشیان دەویت، مەگەر ناشەرعی بێت، ئەگینا ئەویش لەبەر خاتری ئەوان خۆشی دەوێت.بەڵکو چاکە لەگەڵ هاوڕێی وخۆشەویستانی ئەوانیش دەکات لەچوار چێوەی شەرعدا.

٧- ئافرەتی باش نوێژەکاتی وەکو چاوی خۆش دەوێت و دوایان ناخات، ئەگەر زەکاتی هەبێت لەکاتی خۆی و بە شێوەیەکی شەرعی دەریدەکات، ویردێکی ڕۆژانەش بۆ خۆی دیاری دەکات لە قورئان و لە زیکری بەیانیان و ئێواراندا.

٨- ئافرەتی باش بێ ئاگا نییە لە باسی شەهیدی و وابزانێت ئەو مەسەلە هیچ پەیوەندی بە ئەو نییە و، لەڕێگەی ئایەت و فەرموودەکانەوە خۆشی دەوێت و ئاواتی ئەوەیە وەکو لەفەرموودەو نزاکاندا هاتووە بەشەهیدی بمرێت، ئیمامی بوخاری بەڕەحمەت بێت لە سەحیحەکەیدا ، بابێکی تایبەت کردووە بەناوی: (باب الدعاء بالجهاد والشهادةللرجال و النساء). (ابن حجر) یش لەشەرحی فەرموودەکانی ئەم بابەدا قسەی زۆر جوانی کردووە بەڕەحمەت بێت. بەڵام شایانی باسە لە ئیسلامدا جیهاد لەسەر ئافرەتان فەرز نییە، بۆیە کاتێك عائیشە الله لێی رازی بێت، پرسیاری جیهادی ئافرەتان لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، پێی

دەفەرموێت جیهادێکی بێ جەنگ وشەڕکردنی لەسەرە، مەبەستی حەج و عومرە بوو. بەڵام زانایانی ئیسلام فەرموویانە ئەگەر دوژمنی داگیرکەر هاتەسەر خاکی موسوڵمانان، ئەو کاتە جیهاد لەسەر هەموو پیاوان و ژنانیش واجب دەبێت و لەو حاڵەتەدا ئەوانیش وەکو پیاوان بەشدار دەبن.

٩- ئافرەتی باش و چاکەکار نابێت لایەنی کۆمەڵایەتی پشتگوێ بخات و پێویستە بزێو وزیرەك بێت بۆ قۆستنەوەی هەموو هەلێکی گونجاو بۆ خزمەتی دینەکەی، نابێت فەقیرۆکە و بێ ئاگا بێت و هەمیشە چاوی لە دەست و لە عەقڵی کەسانی تر بیت شتەکانی پێ بگەیەنن و ڕووداوەکانی بۆ ڕوون بکەنەوە، دەبێت لەسنووری شەرعدا کەسێکی لێهاتوو وزیتەڵ بێت. بەڵکو دەبێت هەمیشە لە خەمی بەهێزکردنی کەسایەتی و عەقڵ و هۆش و ئاستی زانستی خۆیدا بێت و توانای داهێنانی بێت ئەگەر لە سنورێکی کەمیشدا بێت.

١٠- ئافرەتی باش، لە هەموو ڕوویەکەوە ڕەوشتی جوانە، چونکە لەوە تێگەیشتووە، کامڵترین ئیمانداران ئەوانەن کە ڕەوشتیان جوانە، دڵنیاشە لەوەی هیچ شتێك لە تەرازووی کردەوەکاندا نییە قورستر بێت لە ڕەوشت جوانی وەکو لە فەرموووەکاندا هاتووە.

١١- لە ئاكاری ئافرەتی باش دووره لەوەی گاڵتە و سووكايەتی بە هيچ ئافرەتێكی تر بكات و، خۆی لەوان بەباشتر بزانێت، چونكە باوەڕی وايە ئايەتی يانزەی سورەتی پيرۆزی الحجرات، دەبێت وەكو دروشمێك بۆ ژيانی سوودی لێ وەربگرێت.

١٢- ئافرەتی موسوڵمانی باش ئەو كەسەيە كە لەسەرخۆيە و لەبەر ئايەتی: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾[1] توڕەيی خۆی دەخواتەوە و لە خراپەی خەڵكيش لەگەڵيدا خۆش دەبيت و كينە لەدڵ ناگرێت.

١٣- ئافرەتی باش زمانی خۆی لەسەر جنێودان و قسەی خراپ ودوعاكردن، نە لەگەڵ منداڵەكانی و نەلەگەڵ كەسی تردا ڕاناهێنێت، چونكە دەزانێت ئەو سيفەتە لەناو ئافرەتاندا زۆرە ودەبێت ئەو خۆی لێ بپارێزێت، بۆيە پێغەمبەر ﷺ وريايی پێيان داوەو فەرموويەتی: (تكثرن اللعن وتكفرن العشير)[2]. بۆ ئەوەی چاكەكارەكانيان لەو خەسڵەتە خراپە خۆيان بپارێزن.

---

(١) - آل عمران: ١٣٤.

(٢) - البخاري و مسلم

١٤- ئافەرەتی موسوڵمانی باش، هەرگیز هانی مێردەکەی نادات هاوسەرەکەی تری تەڵاق بدات، چونکە دەزانێت ئەوە سیفەتی ئافرەتی موسوڵمان نییە ولەسەری تاوانیار دەبێت و پێغەمبەر ﷺ نەهی لەو سیفەتە خراپە کردووەو فەرموویەتی: (ولا تسأل المرأة طلاق أختها لتكفأ ما في إنائها)[١]. هەروەها لەو ئاكارە بەدووره مێردەکەی لەکەسوکاری دوور بخاتەوەو دڵی گوماناوی بکات لێیان.

١٥- لە سیفەتەکانی ئافرەتی باش ئەوەیە ئافرەتێکی پاك و پاراوەو ئیش و کەرەستەو هەموو ماڵەکەی پاك وخاوێنە و پاکی وڕێکوپێکی نیشانەو دروشمێتی لە ماڵەکەیدا و لە گرنگیدانیدا بەخواردن و جل و پیویستییەکانی خۆی و مێردی ومنداڵی. و وایان لێ دەکات هەست بکەن بایەخی پێداون و پاکی خاوینی ئەوان بەیارمەتی و گرنگیدانی ئەو لەماڵدا بەرقەرار بووە.

١٦- لە نهێنییەکانی بەختەوەری کە هاوکات سیفەتێکە لە سیفەتە باشەکانی ئافرەتی موسوڵمان ئەوەیە، ڕازی بێت بە قسمەت و نسیبی خۆی، بەو بەشەی کە الله بۆی داناوە، رَسولُ اللهِ ﷺ فەرموویەتی: (الْمُتَشبِّعُ بما لم يُعطَ، كَلابِسِ ثَوبيَ زُورٍ)[٢]

---

[١] - البخاري و مسلم

[٢] - متفق عليه.

١٧- خوویەکی خراپە کە ئافرەت هەمیشە بۆڵەی بێت و لەهیچ و بە هیچ ڕازی نەبێت، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە کۆبوونەوەکەی لەگەڵیاندا داوای لێکردن سەدەقە بکەن و پێی فەرموون ئێوە ئەو سیفەتە خراپەتان تێدایە کە (تكثرن الشكاة وتكفرن العشير)[1]. واتە سکاڵا زۆر دەکەن و چاکە لەبیر دەکەن و نکۆڵی لێ دەکەن.

١٨- ڕەزیلی بۆ پیاوو بۆ ژن سیفەتێکی نەخوازراوو خراپە، بۆیە ئافرەتی باش دەبێت لەو سیفەتە بەدوور بێت و هەر بیری لای کۆکردنەوەو پاشکەوت کردن نەبێت، بەڵکو بەوەی کە دەتوانێت دەستی کراوە بێت، چاکە و بەخشینی هەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أنفقي ولا تحصي فيحصي الله عليك، ولا توعي فيوعي الله عليك)[2].واتی فەرموودەکەش هاندانە بۆ بەخشین و نەهی کردنە لەوەی پارە تەنها بۆ هەڵگرتن و پاشەکەوت کردن بەکار بێت.

١٩- ئافرەتی باش بە خزمەت کردنی میوان لە سنووری شەرعدا بێزار نابێت، فەرموودەیەکی زۆر لەو بارەو هاتووە کە هانی موسوڵمان دەدات ڕێز لە میوان بگرێت و نانی بۆ ئامادە بکات.

(١) - مسلم ٨٨٥
(٢) - متفق عليه

٢٠- ئافرەتی باش ئافرەتێکی ئازایەو ترسنۆك نییە، ئافرەتە هاوەڵەکان الله لێیان ڕازی بێت زۆر ئازا و بەجەرگ بوون، لە سەحیحی موسیلمدا هاتووە کە لە ڕۆژی حونەیندا، پێغەمبەر ﷺ دایکی سولەیمی بینی الله لێی ڕازی بێت، خەنجەرێکی بەدەستەوە بوو، پێی فەرموو ئەو خەنجەرەت بۆچییە؟ فەرمووی، بۆ ئەوەمە ئەگەر موشریکێك لێم نزیك بوویەوە سکی بەو خەنجەرە هەڵدەدڕم.

٢١- لە سیفەتەکانی ئافرەتی باش ئەوەیە لەسەر نەخۆشی وناخۆشی ئارامگرە، ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ نەخۆشی (صرع) فێی هەبوو، داوای کرد دوعای بۆ بکات چاك بێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر لەسەر نەخۆشییەکەت ئارام بگریت دەچیتە بەهەشتەوە، ئەگەریش دەتەوێت دوعات بۆ دەکەم چاك بیتەوە، وتی ئارام دەگرم، بەڵام دوعام بۆ بکە لەکاتی نەخۆشییەکەمدا جەستەم دەرنەکەوێت.

٢٢ - لە سیفەتە باشەکانی ئافرەتی باش ئەوەیە بەجوانی و ڕێك وپێکی وبەشێوەیەکی شەرعی خۆی دادەپۆشێت وبەجلی نیوە حیجاب و نیوە وابەستەبوون بە دینەوە خۆی ناخەلەتێنێت و بەجوانی خۆی دادەپۆشێت.

کاتێك ئایەتی ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ دابەزی، ئافرەتانی موسوڵمان لە زیادەی پۆشاکەکانیان گرت و یەکسەر ڕوخساری خۆیان پێ داپۆشی. وەکو لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە.

٢٣- شەرم مرۆڤ جوان دەكاتەوە، يەكێكیش لە جوانترین سیفەتەكانی ئافرەتی موسوڵمان ئەوەیە بەشەرم وحەیا بێت، ئافرەتی بێ شەرم لە فیترەتی خۆی دەرچووە و بێ شەرمی لەكەسایەتی و لە سەنگینی كەم دەكاتەوە، پێغەمبەر ﷺ وا وەسف دەكرێت كە لە كچێكی عازەب بەشەرمتر بووە. یەكێكیش لە دیاردەكانی بێ شەرمی كە لەم ڕۆژگارە سەریهەڵداوە ئەوەیە، سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر دەكەن ﷺ كە فەرمانی پێ كردوون لە دەرەوەی ماڵەكانیان جلیان دانەكەنن، بەڵام زۆرێك لە ئافرەتان لەكاتی جل كڕیندا، لە جێگای تایبەتی ئەو دوكان و مۆڵانە خۆیان دەگۆڕن وجلەكانیان تاقی دەكەنەوە، بەو شێوەش زۆر جار بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن بەڕووتی وێنەیان دەگرن و ڕووداوی نەخوازراویشی بەدوادا دێت.

هەروەها نابێت لەكاتی قسەكردن و میوانداری و لە شوێناندا سەیری ناوچاوی پیاو بكات لەكاتی قسەكردندا، ئەوە لە دەرەوەی پێویستی و زیاد لە حەدی خۆی حەرامە و لە رووی كەسێتی خۆیشییەوە سیفەتیكە ناشیرینە. بەڵكو دەبێت سەیركردنی شەرمی پێوە دیار بێت.

٢٤- لە سیفەت و خەسلەتە باشەکانی ئافرەتی موسولمان ئەوەیە نوێژەکانی لە ماڵی خۆیدا دەکات وناچێتە مزگەوت، چونکە لە چەندین فەرموودەی صحیح دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی نوێژی ئافرەتان لەماڵەکەی خۆی خێری زۆرترە لەوەی لە مزگەوت بیکات.

٢٥- ئافرەتی باش لەکاتی دەرچوونی لەماڵ، خۆی بەدوور دەگرێت لەبۆن لەخۆدان، چونکە لە چەندین فەرموودەی صحیح دا هاتووە داوایان لێ کراوە بۆن لەخۆیان نەدەن، بەڵکو هەڕەشەی توندیش لە هەندێ فەرمودەدا هاتووە کە ئەگەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش بکات و بەلای پیاواندا تێپەڕێت، وەکو ئەوەیە ئاوهاو ئاوهای کردبێت. هەروەها نابێت لەکاتی ڕێکردنیدا جێگای قەرەباڵغی وبەو شوێنانەدا بچێت کە ناچار دەبێت زۆر لە پیاوانەوە نزیك بێتەوەو تاکو بتوانێت پێویستە بەلای دیواردا بڕوات و ناوەڕاستی ڕێگا و جێگە قەرەباڵغەکان نەگرێت وەکو لە هەندی لە فەرموودەکاندا هاتووە.

٢٦- ئافرەتی موسوڵمانی باش، ناهێڵێت و ڕێگە نادات لەبەر هەر هۆکارێك بێت، لەگەڵ پیاوێکی نامەحرەمدا بەتەنها بێت، چونکە ئەوە کارێکی حەرامە و درووست نییە، لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: (إيَّاكم والدُّخولَ على النِّساءِ. فقالَ رجلٌ منَ الأنصارِ : يا رسولَ اللَّهِ ! أفرأيتَ الحموَ ؟ قالَ : الحموُ : الموتُ) بۆیە بەتەنها مانەوەی ئافرەت لەگەڵ براو کەسی مێردەکەیدا کە ئەوە زۆر جار ڕوودەدات، کارێکی ناشەرعییە و بە پێی فەرموودەکە مردن لەوە باشترە.

٢٧- ئافرەتی باش هەمیشە ئافرەتێکی داوێن پاکە و مێردەکەی دەپارێزیت، هەرگیزیش بیر لە پیاوێکی تر جگە لە مێردەکەی ناکاتەوە، چونکە هاوسەران بە گرێبەستێکی شەرعی تۆکمە کۆبوونەتەوە و بە عەهدو پەیمانێکی ئیسلامی پیرۆز بۆ یەکتر حەڵاڵن، بۆیە ئەگەر هەر خەیاڵ و خورەیەکی لەو شێوە بێت بەدڵی هەر ئافرەتێکدا وکەمترین هەنگاوی کردەیی بۆ بنێت، دەبێت بزانێت ئەوە خیانەتە و مادام ئەو گرێبەستە کۆتایی پێ نەهاتووەو ماوەتەوە، ئافرەت فەرزە لەسەری بیپارێزێت و سنووری نەبەزێنێت. الله تعالى فەرموویەتی: ﴿والذين هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ إِلاَّ على أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾[١]

---

[١] - المؤمنون:٥.

٢٨- ئافرەتی باش بە پیاوی باش و موسوڵمان و ئیماندار و موەحید ڕازی دەبێت و تەنانەت ئەگەر هەژاریش بێت هەر پێی ڕازی دەبێت و چاوەڕوانی فەزڵی پەروەدگاری دەکات لەو هەژارییە ڕزگاریان بکات، چونکە الله فەرموویەتی: ﴿إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾[١]

٢٩- ئافرەتی باش بە ئەرك و پێویستییەکانی مێردەکەی هەڵدەسێت و خزمەتی دەکات، ئەگەر هەڵەشی لێ ببینێت ئاگاداری دەکاتەوە و لەسەر کاری چاکە هاوکاری دەکات و لەپەروەردەکردنی منداڵدا هاوکار وکۆمەکی مێردەکەی دەبێت و بێ وەفا نابێت بەرانبەری و چاکەکانی لەبەرچاو دەگرێت و نهێنییەکانی دەپارێزێت و ئەوەی ئەو پێی خۆش بێت لە سنووری شەرعدا ئەمیش پێی خۆشەو، بەڕواڵەت وخۆ ڕازاندنەوەی بۆی دڵی خۆش دەکات و لەگەڵیدا ڕاستگۆ دەبێت و هیچ شێوەیەک لە شێوەکان خیانەتی لێ ناکات و، ئەگەر مێردەکەی لەسەفەرێك بگەڕێتەوە، بەجوانترین شێوە وەکو لە فەرموودەداهاتووە پێشوازی لێ دەکات وخۆی بۆنخۆش دەکات و ئەویش بەدەستی خۆی بۆنخۆش دەکات و، لەگەڵیشیدا لە یەك جێگەدا دەخەوێت ئەگەر لە حەیزو بێ نوێژیشدا بێت و، هەموو ئەمانە لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە.

---

[١] - النور:٣٢.

٣٠- یەکێکی تریش لە سیفەتە باشەکانی ئافرەت لەگەڵ مێردەکەیدا ئەوەیە، لەگەڵیدا ڕۆژانی سەخت و ناخۆش بەڕێ دەکات و ئەگەر مێردەکەی نەخۆش بکەویت چاودێری دەکات و چاکەی لەگەڵدا ئەنجام دەدات و روقیەی شەرعی بۆ دەخوێنێت و لە ماڵەکەشیدا خۆی بەچاودێرو شوان دەزانێت وەکو لە فەرموودەدا هاتووە.

٣١- ئافرەتی باش بەسۆزە لەگەڵ منداڵەکانیدا ماچیان دەکا و جیاوازی لە نێوانیاندا ناکا و هەر لە تەمەنی منداڵییەوە لەسەر ئادابە ئیسلامییە جوانەکان ڕایان دەهێنێ و هەر زوو فێری نوێژ و ڕۆژوویان دەکا هەوڵیش دەدات هەرچۆنێک بووە فێری زمانی عەرەبییان بکات، چونکە ئەوە بۆ دوارِۆژیان یارمەتیدەرێکی باش دەبێت بۆ تێگەیشتنی دینەکەیان و بۆ دونیاشیان هەر باش و بەسوودە.

لە کۆتاییدا داواکارم لە هەموو ئافرەت و کچێکی بەڕێز کە ئەم بابەتە دەخوێنێتەوە، کتێبی (صفات المرأة المسلمة في الكتاب و السنة )ی أم أسامة بنت علي العباسية بخوێنێتەوە، کە لە ئینتەرنێت بەردەستە و بۆ نووسینی ئەم پۆستە لەو کتێبە و لەچەند سەرچاوەیەکی تر سوودم وەرگرتووە، .ئینجا ئەگەرچی لە هەموو ئەو خاڵانەی سەرەوەدا خۆم وابەستەی هێناوەی بەڵگەی کیتاب وسوننەت نەکردووە، بەڵام لەو کتێبەی کە ئاماژەم پێکرد، هەموو ئەوەی لێرە باسم کردووە، لەوێ بە شیکراوەیی ئایەت وفەرموودەکانی لەسەر هێناوەتەوە، بەڵام من لەبەر درێژ نەبوونەوەی بابەتەکە باسم نەکردووە.

# بیست و سێ: میراتی کچ وئافرەت لە ئیسلامدا

بابەتی میراتی لە ئیسلامدا بابەتێکی گرنگە و بایەخی لەو ئاستەدایە کە الله عزوجل خۆی لە قورئانی پیرۆزدا پشك وبەشی خاوەن مافەکانی دیاری کردووە، مافی ئافرەتیش لە میراتدا بە ڕوونی و بەڕاشکاوی لە قورئاندا دیاری کراوەو و، لێرەدا و لە ڕۆشنایی دەقەکانی قورئانی پیرۆز وسوننەتی پێغەمبەردا صلی الله علیه و سلم و ڕاستییەکانی مێژوودا ، لە چەند خاڵێکی کورتدا ئەو مەسەلە دەخەمەڕوو:

١- الله تعالى لە قورئانی پیرۆزدا خۆی پشکی هەموو خاوەن ماف ومیراتگرێکی دیاری کردووە و فەرموویەتی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾[1] ئەو بەش و پشکەش کە الله دایناوە بۆ خاوەن مافەکان فەرزە بدرێت و تاوانێکی گەورەیە بەستەم و فڕوفێڵ خاوەنەکەی لێ بێ بەش بکرێت.

---

[1] - النساء: ٧

٢- جیاوازی کردن لە نێوان کوڕان وکچان و ژنان و پیاوان لە میراتیدا، تاوانێکەو سەرپێچی کردنی سەریحی قورئانی پیرۆزە، هەروەها عادەت و نەریتێکی سەردەمی جاهیلی و بتپەرستەکانە، چونکە موشریکانی پێش سەردەمی ئیسلام دەیانوت کەسێك شایستەی میراتییە کە توانای چەك هەڵگرتن وبەرگری کردنی لە خاك و ئاو هەبێت، بۆیە ئافرەت و مناڵ لە میراتی بێ بەش دەکران. بەر لە ئیسلام و لە لەلای فارس و هند و ئیغریق و نەتەوەکانی تر، ئافرەت نەك هەر میراتی وەرنەدەگرت، بەڵکو خۆیشی دەبوو بە بەشێك لە میراتی و دابەش دەکرا و وەکو پشکێك دەکەوتە بەر کەسێك لە میراتگران! بەڵام لە ئیسلامدا ، چۆن مافی کوڕان لە میراتیدا دەستەبەر کراوە، مافی کچانیش بەهەمان شێوە دەستەبەر کراوە، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾[1]

لە ئیسلامدا میراتی ئافرەت - مناڵی هەبێت یان نەیبێت - بە دادگەری و بەڕوونی لە قورئانی پیرۆزدا دیاری کراوە، الله عزوجل فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم﴾[2].

---

(1) - النساء: ١١
(2) - النساء: ١٢

میراتی دایکیش دیاریکراوەو جیاکراوەتەوە: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ﴾[1]

پشکی کچیش بەهەمان شێوە دیاری کراوە: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾[2]

پشکی خوشکیش بەدیاری کراوی جیاکراوەتەوە: ﴿وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾[3].

تەنانەت الله تعالى باسی هەندێ حاڵەتی تری کردووە لە قورئانی پیرۆزدا وەکو مەسەلەی (الكلالة) کە بریتییە لە مردوویەك منداڵی نییە و خوشکێك یان زیاتری هەیە و پشکەی دیاری کردووە وفەرموویەتی: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾[4].

---

[1] - النساء: ١١

[2] -النساء: ١١

[3] - النساء: ١٢

[4] - النساء/١٧٦

٣- هیچ کەسێك بۆی نییە ئافرەتان و کچان لە میراتیی بێ بەش بکات، یان جیاوازی و فێڵ ونادادگەری لە پێدانی پشکەکانیاندا بکات، چونکە ئەوە لە ئیسلامدا یەکێکە لە تاوانە گەورەکان و واجبە لەسەر موسوڵمانان کار بەشەرع بکەن و ڕەچاوی حوکمەکانی قورئان وسوننەت بکەن لە مەسەلەی میراتیدا، چونکە ئەوە مافێکە الله عزوجل خۆی بەدادگەری ڕەهای خۆی دابەشی کردووە وفەرزی کردووەتە سەر موسوڵمانان بەو شێوە میراتی دابەش بکەن..

هەر کەسێك ستەم لە ئافرەتێك بکات بە بێ بەشکردنی لە مافی خۆی لە میراتیدا، یان بە ترسادنی و هەڕەشە لێکردنی بۆ ئەوەی دەست بەرداری پشکەکەی خۆی بێت، یان بە ئیحراج کردنی وبیکات بەڕووی خۆیەوە وناڕاستەوخۆ وای لێ بکات بڵێت بەشی خۆمم ناوێت، یان بەهەر ڕێگایەکی تر، ئەو کەسە حوکمی شەرعی پەك خستووە و لە حوکمی ئیسلام لایداوە و چووەتە سەر حوکمی هەواو ئارەزوو و ڕێبازە جاهیلییەکان.

هاوکات ئەو کارەش زوڵم وستەمە و الله تعالی ڕقی لە ستەم و لە ستەمکارانە، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾[1]. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اتقوا الظلم فإن الظلم ظلمات يوم القيامة )[2]. واتە: خۆتان لە ستەم بپارێزن و بەدووربگرن، چونکە ستەم تاریکییە لە ڕۆژی قیامەتدا.

---

(١) - الطلاق:١.
(٢) - رواه مسلم

٤- عورف و عادەتی کورد لە ڕابردوودا و بگرە تا ڕاددەیەك بە ئێستاشەوە، ئافرەتی لە پشکی خۆی لە میراتی بێ بەش کردووە، یان پشکێکی کەم و بە پێچەوانەی ئەوەی لە قورئاندا بۆی دیاری کراوە پێی دەدرێت، ئەوە لە ڕاستیدا عورفێکی ناکۆك ودژوارە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا وپێویستە موسوڵمانان ئەو هەڵە گەورەیە چاك بکەنەوەو بەخۆیاندا بچنەوە و بە حیلە و بە قۆستنەوەی هەلی شەرم و لاوازی و نەزانی ئافرەتان ستەمیان لێ نەکەن ولەبەشەکانیان مەحرومیان نەکەن.

٥- مەسەلەیەکیش هەیە زۆر جار ناحەزانی ئیسلام دەیکەن بە بەهانەی ڕەخنەگرتن لە ئیسلام گوایە ستەمی لە ئافرەت کردووە و جیاوازی لە نێوان پشکی نێرینەو مێینەدا کردووە، بەوەی لە میراتیدا کوڕ دوو ئەوەندەی کچ وەردەگرێت، ئەو مەسەلەش هەرچەند لە هەموو حاڵەتەکادا هەر وا نییە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە نەك ستەم نییە، بەڵکو ئەوپەڕی داگەری شەریعەتی ئیسلامە کە بۆ نموونە ئەگەر پیاوێك بمرێت و سی ملیون دینار میراتی هەبێت وکوڕو کچێکی لەدوای خۆی بەجێهێشتبێت، کوڕەکە بیست ملیون و کچەکەی دە ملیۆنی بەردەکەوێت، چونکە پیاو هەندێ ئەرك و واجبی دەکەوێتەسەر کە ئافرەت ئەو ئەرکانەی ناکەوێتەسەر، وەکو:

- پێدانی مارەیی بەئافرەت کە مافێکی حەڵاڵی ئەو ئافرەتەیە هەمووی دەکەویتە سەر پیاو.

- ئیسلام نەفەقە و خەرجی بەڕێوەبردنی ماڵ ومناڵ و ژنی خستووەتە سەر پیاو و ئەو ئەرکانەش بە پارە و توانای دارایی دەکرێت.

- ئافرەت نەفەقە و خەرجی ماڵی ناکەوێتەسەر خۆی، تەنانەت ئەگەر دەوڵەمەندیش بێت، مەگەر خۆی بە ویستی خۆی بیەوێت خەرجی ماڵ بکات.

- ئافرەت لەئیسلامدا لە هەموو حالەتەکانیدا وەکو هاوسەر و کچ و خوشك و دایك هەمیشە خەرجی و ئەرکی مادی دەکەوێتە سەر مێرد و برا و باوك و کەسانی تر و واجبیشە لەسەریان ئەو نەفەقە و ئەرکە هەڵگرن و پێویستییەکانی تەواو بکەن.، تەنانەت لەو کاتەشدا کە لە مێردەکەی جیا دەبێتەوەو تەڵاق دەدرێت لە ماوەی عیددەکەیدا خەرجی هەر دەکەوێتە سەر مێردەکەی کە تەڵاقی داوە. بۆیە لەبەر ئەوەیە کە میراتی ئافرەت بەو شێوە بووە و بەدڵنیاییەوە حیکمەتی تریشی تێدایە، چونکە الله عزوجل دادگەری ڕەهای لە حوکمەکانیدا هەیە و بە ئەندازەی گەردیلەیك ستەم لە کەس ناکات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ﴾[١]

[١] - النساء:٤٠

# پەیامی بیست وچوار: وەڵامی گومانێک دەربارەی فرەژنی

فرەژنی یان چەند ژنی، کە لە زاراوەی شەرعدا (تعدد الزوجات)ی پێ دەوترێت، حەقیقەتێکە لە ئیسلامدا بە بەڵگەی قورئان وسوننەت و ئیجماعی ئوممەت جێگیر بووە، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا﴾[1] هەروەها فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ وسوننەتی کردەیی و وکۆدەنگی زانایان وسەرانی ئوممەتی ئیسلامی لەسەر ئەوەیە.

بەڵام وەکو لە جێگەیەکی تریشدا بە شیکراوەیی باسمان کردووە، مەسەلەی (تعدد الزوجات) بە مەرجەکانی خۆی دەبێت کە ئەویش توانای ڕاگرتنی دادگەرییە لە نێوان هاوسەران و توانای نەفەقە وخەرجکردن ودابین کردنی پێویستییەکانە.

لە ئیسلامیشدا فرەژنی لە چوارچێوەی کۆمەڵێک حیکمەت وهۆکاری پێویستدا تەشریع کراوە، لەوانە:

* فرەژنی ڕێگەیەکە بۆ زۆربوون وبەهێزبوونی ئوممەتی ئیسلام.

* فرەژنی هۆکارێکە بۆ چارەسەرکردنی زۆریی ڕێژەی ئافرەتان بەراورد بە پیاوان.

---

[1] - النساء/٣ .

* فرەژنی چارەسەرێکە بۆ مانەوەی کچان وئافرەتان لە کۆمەڵگادا بەبێ هاوسەرگیری کە جۆرەها کێشەو گرفتی لێ دەکەوێتەوەو.

* مەعلومە کە پیاوان بە هۆی بەشداریکردنیان لە جەنگ و بە هۆکاری تر، زیاتر ڕووبەڕووی مردن دەبنەوەو، بەوەش ناهاوسەنگی بەردەوام هەیە لە نێوان ڕێژەو ژمارەی پیاوان و ژناندا.

* وەکو حەقیقەتێکی فیتری وپێکهاتەی فەسیۆلۆجی پیاوانیش، زۆر جار پیاوان بە یەک ئافرەت پێویستییە جەستەییەکانیان دابین نابێت وئەگەر بە ڕێگەی فرەژنی حەڵاڵ چارەسەر نەکرێت، بۆیان هەیە پەنا بۆ ڕێگای حەرام ببەن وبکەونە هەڵدێری فەساد و تاوانەوە،

* ئەمە جگە لەوەی ئافرەت جاری وا هەیە نەخۆشە وبەچەندین حاڵەتی تری سوڕی مانگانە و دوو گیانی و حاڵەتی تردا تێدەپەڕێت، ، یان هەندێ جار نەزۆکەو منالی نابێت، یان بێوەژنەو منالی بەسەراکەوتووەو پێویستی بە پیاوێکە بەڕێوەی ببات.

* هەندێ جاریش فرەژنی دەبێتە هۆکاری نزیک بوونەوەی دوو خێزان ودوو بنەماڵە پێکەوەو، وەکو زانایان ولێکۆڵەرەوە دادگەرو ڕاستگوکان بەدواداچوونیان بۆ کردووە، فرەژنی لەسەر ئاستی تاک وکۆمەڵ وبۆ پیاوان و ژنان وبۆ چارەسەرکردنی کێشەی قەیرەیی وکەمکردنەوەی فەساد لە کۆمەڵگادا، سوودو شوێنەواری باشی گەلێک زۆرە، ئەگەریش بوترێت دەبێتە مایەی کێشەو

درووست بوونی ناتەبایی لە خێزاندا، لەڕاستیدا ئەو ئەگەرە لە حاڵەتی یەک هاوسەریشدا هەر بوونی هەیە وئەگەر فرەژنی بەو شێوە ئەنجام بدرێت کە ئیسلام دایناوە چارەسەرە وبەسوودی تەواوی کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە،

لێرەدا نەیارانی ئیسلام لەبەر ئەوەی ئامانج و مەبەستیانە فەساد و بێ ڕەوشتی لە ناو کۆمەڵگادا بڵاو بێتەوە، گومانێک باس دەکەن و بەسەرهاتی ڕێگەنەدانی پێغەمبەر ﷺ دەهێننەوە بۆ عەلی الله لێی ڕازی بێت، کە ژن بەسەر فاتیمەی خێزانیدا بهێنێت الله لێی ڕازی بێت، لە کاتێکدا ئەوان باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ و بە دینەکەشی نییە و بە هەموو توانایەکیان دژایەتی ڕەوشت وئاکارە جوانەکا دەکەن و کار بۆ بێ رەوشت کردنی خەڵکی ئەکەن.

بە کورتی دەڵێن ئەگەر فرەژنی بابەتێکی شەرعی وڕێگە پێدراوە، بۆچی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بە زاواکەی خۆی نەدا ژن بەسەر کچەکەیدا بهێنێت؟ وەڵامی ئەو گومانەش بە کورتی ولەژێر ڕۆشنایی قسەی زانایاندا بەم شێوەیە:

١- فەرموودەی ڕازی نەبوونی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ژنهێنانی عەلی بەسەر فاتیمەدا الله لێیان ڕازی بێت، فەرموودەیەکی صحیح ە، لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمدا ڕیوایەت کراوە.

٢- بە ڕوونی و بە ڕاشکاری لە فەرموودەکە دەردەکەوێ، کە پێغەمبەر ﷺ کێشەی لەگەڵ فرەژنیدا نەبووە و فەرموویەتی فرەژنی حەڵاڵە و من حەرامی ناکەم: (لست أحرم حلالاً ولا أحل حراماً) واتە من شتێك حەڵاڵ بێت حەرامی ناکەم وحەرامیش حەڵاڵ ناکەم، واتە لەو نارازیبوونەیدا ﷺ مەبەستێکی تری بووە.

٣- هۆکاری یەکەمی ناڕازیبوونی پێغەمبەر ﷺ کە لەفەرموودەکەدا دەردەکەوێت ئەوەیە هاوسەرگیری عەلی لەگەڵ کچی ئەبوجەهلدا، دەبووە مایەی ئازا بۆ فاتیمەی کچی، بۆیە فەرمووی (فَإِنَّمَا هِيَ بَضْعَةٌ مِنِّي ، يُرِيبُنِي مَا أَرَابَهَا ، وَيُؤْذِينِي مَا آذَاهَا)[١] .. واتە پارچەیەکە لە من، ئازاردانی فاتیمەی کچم ئازاردانە بۆ من، ئەوەی کچەکەم بێ تاقەت بکات منیش بێ تاقەت ئەکات، الله تعالى لە قورئاندا ئازادانی پێغەمبەری ﷺ حەرام کردووە وفەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ﴾[٢]

(١) - رواه البخاري (٥٢٣٠) ، ومسلم (٢٤٤٩)
(٢) - الأحزاب:٥٣.

٤- هۆكاری تری سەرەكی بۆ ناڕازیبوونی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو كە عەلی كچی ئەبو جەهلی دوژمنی ئیسلامی هەڵبژاردبوو بیكات بە هاوسەری خۆی و بیهێنێت بەسەر فاتیمەدا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا تَجتَمِعُ بِنتُ رَسولِ اللهِ ﷺ وبِنتُ عدُوِّ اللهِ عندَ رَجلٍ واحدٍ) واتە: نابێت كچی رسول الله ﷺ و دوژمنی الله لە یەك ماڵدا كۆ ببنەوە.

٥- پێغەمبەر ﷺ دەیزانی ئەو هاوسەرگیرییە لەگەڵ كچی ئەبو جەهلدا دەبێتە مایەی فیتنەی فاتیمەی كچی لە دینەكەیدا بۆ ڕێگری لێ كرد: (وَأَنَا أَتَخَوَّفُ أَنْ تُفْتَنَ فِي دِينِهَا )[١] واتە دەترسم زەواجی عەلی لەگەڵ كچی أبو جهل دا ببێتە مایەی تاقیكرنەوەیەكی سەخت لەسەر كچەكەم لە دینەكەیدا.

٦- لەوانەیە وەكو پێشەوا النووي دەڵێت: ( وَيَحْتَمِلُ أَنَّ الْمُرَاد تَحْرِيم جَمْعهمَا ... وَيَكُون مِنْ جُمْلَة مُحَرَّمَات النِّكَاح : الْجَمْع بَيْن بِنْت نَبِيّ اللَّه وَبِنْت عَدُوّ اللَّه)[٢] واتە لە بنچینەوە كۆبوونەوەی كچی پێغەمبەر ﷺ وكچی دوژمنێكی ئیسلام وەكو أبو جهل خۆی لە خۆیدا حەرام و نادرووست بێت.

---

[١] - البخاري (٣١١٠).

[٢] - شرح صحيح مسلم " (١٩٩/٨).

٧- ئەو ناڕازیبوونەی پێغەمبەر ﷺ وەکو ابن حبان دەڵێت بە هۆی پلەو پایەی بەرزو تایبەتی فاتیمە بووە الله لێی ڕازی بێت کە نابێت لەگەڵ نەشیاوە لەگەڵ کچی ئەبوجەهلدا لەیەك ماڵدا کۆببنەوە: (وإنما كرهه صلى الله عليه وسلم تعظيماً لفاطمة ، لا تحريما لهذا الفعل)[١].

٨- ابن حجر العسقلاني - وەکو محمد صالح المنجد الله ڕزگاری بکات لێی دەگێڕێتەوە - فەرموویەتی بە دووری ناگرم ئەو حاڵەتە یەکێك بێت لە تایبەتمەندییەکانی رسول الله ﷺ کە زاواکانی بۆیان نەبێت ژن بەسەر کچەکانیدا بهێنن و، لەوانەشە تەنها تایبەت بێت بە فایتمەوە الله لێی ڕازی بێت.: (والذي يظهر لي أنه لا يبعد أن يُعدَّ في خصائص النبي ﷺ أن لا يتزوج على بناته ، ويحتمل أن يكون ذلك خاصاً بفاطمة رضي الله عنها)[٢]. ڕاستییەکیشە هەموو کەس دەیزانێت هیچ حاڵەتێکی تری هاوشێوە درووست نابێت تا ڕۆژی قیامەت، چونکە نەکەس دەبێتە پێغەمبەر ﷺ و نە هیچ کچێکیش دەبێت کچی پێغەمبەر ﷺ بێت.

---

[١] - صحيح ابن حبان" (٤٠٧/١٥).

[٢] - فتح الباري" (٣٢٩/٩)

٩- فاتیمه الله لێی ڕازی بێت سەرگەوەری ئافرەتانی بەهەشتە و بەوەی کەوا کچی پێغەمبەرە ﷺ واتە کچی باشترین مرۆڤە بە ڕەهایی ومێردەکەشی بەهەمان شێوە خاوەن پلەو پایەی بەرزو مەزنە، ، هاوکات لەبەر ئەوەی ئەبو جەهلیش کەسێکی نەفرەت لێکراوەو دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بووە ، خاوەنی نزمترین پلەو پایەیە و خرپترین کەسە، بۆیە نەشیاوو ناشاییستە بوو کە کیچی باشترین کەس و خراپترین کەس لە یەك ماڵدا پێکەوە ژیان بەسەر ببەن.

١٠- هەندێك لە زانایان باسی ئەوەشیان کردووە کە پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی مەرجی ئەوەی لەسەر عەلی داناوە کە ژن بەسەر فاتیمەدا نەهێنێت، بۆیە کە عەلی ئەو نیازەی کردووە ژن بهێنێت پێغەمبەر ﷺ ناڕەزایی دەربڕیوە و هاوکات و ئەمەك و وەفای زاوایەکی تری باسکردووە کە ناوی أبو العاص بن الربيع بووە باس کردووە وەکو ئەوەی بڵێت تۆ بەئەەك نەبووی بۆ پەیمانی ژن نەهێنانت بەسەر فاتیمەدا.

١١- هەندێ لەزانایان وەکو ابن التين، وەکو لە فتح الباري دا هاتووە، فەرموویانە ناڕەزایی پێغەمبەر ﷺ لە خۆشەویستی عەلی بووە، چونکە دەیزانی بەو ئازارەی بە ژنهێنانەکەی عەلی بە فاتیمە دەگات و بەتایبەتی کە کچی ئەبو جەهلیش بیت ئازار بە پێغەمبەر ﷺ دەگات، بەوەش عەلی تاوانبار دەبێت، چونکە هەرکێ ببێتە هۆکاری خەفەتبار بوونی رسول الله ﷺ سنووری تێپەڕاندووەو الله تعالى ی لە خۆی تورە کردووە.

١٢- ئەم هۆکارانەی سەرەوە بە تێکڕا، یان بەشێکیان بە جیاوازی، بوون بە مایەی ناڕازیبوونی پێغەمبەر ﷺ کە عەلی زاوای ژن بەسەر کچەکەیدا بهێنێت، ئەگینا فرەژنی شەریعەتێکی کارپێکراو بووە لەو سەردەمی پێغەمبەرایەتی و لەسێ سەدە باشەکانی ئیسلام لەسەردەمی سەلەف و لە هەموو سەردەمانی تری ئیسلامدا، ئەگەر ئەو بەسەرهاتە حاڵەتێکی تایبەت و بۆ بۆنەو دۆخێکی دیاریکراو نەبوایە، دەبوو کەمترین کاریگەری لەسەر شەریعەتی فرەژنی بەجێبهێڵێت لە ئیسلامدا.

١٣- لە کۆتاییشدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە موسوڵمان دەبێت عەقیدەو باوەڕی وابێت، کە پێغەمبەر ﷺ بەهیچ شێوەیەك نادادگەری و هەڵەی شەرعی و کاری ناشایستەی لێ ناوەشێنیتەوە، بەڵگو هەموو شتێك کە ئەندامی دەدات بێ حیکمەت نییە و کاردانەوەی ئەو هاوشێوەی کاردانەوەی مرۆڤی ئاسایی نییە، بۆیە هەر جۆرە گومانێك لە رسول الله ﷺ ڕێگای بەدبەختی و تیاچوونە بۆ موسوڵمان، چونکە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾[1]

---

[1] - النجم:٣-٤.

# پەیامی بیست و پێنج:
# حوکمی چارەسەر وەرگرتنی ئافرەت لەلای پزیشکی پیاو

دیاردەی بە ئاسایی تەماشا کردنی سەردانی نەخۆشی ئافرەت بۆ لای پزیشکی پیاو بە بێ هەبوونی زەرورەت، دیاردەیەکی ناشیرین و ناشەرعییە و نیشانەی نەفامی یان گوێنەدانە بەشەرع و، هاوکات لەلایەن سەرپەرشتیارانەوە ئاماژەیە بۆ جۆرێك لە بێ نەپاراستی سنووری شەرع و غیرەتیش.

ئەوەی کە لەم بارەوە درووستە تەنها حاڵەتی ناچاریە کە لە شەرعدا بە (ضرورات) دەربڕینی لێ دەکرێت، زانایان تەنها وەکو حاڵەتی ناچاری ڕێگەیان داوە پزیشکی پیاو پشکنین و چارەسەر بۆ نەخۆشی ئافرەت بکات، بەتایبەتی ئەگەر جێگای نەخۆشییەکە لەو جۆرە بێت کە زانایان بە (العورة المغلظة) ناویان بردوە.

بنچینەیەکی کارپێکراوو جەخت لەسەر کراوەش لەلای زانایانی ئیسلام هەیە کە بریتییە لەوەی (الواجب أن يطبب الرجل الرجال وأن تطبب المرأة النساء) واتە: پێویستە پزیشکی پیاو نەخۆشی پیاوان تیماریان بکات و پزیشکی ئافرەت ئافرەتان تیمار بکەن، لە دەرەوەی ئەم بنەمایەش دەچێتە بازنەی پێویستی و ناچارییەوە کە ئەوەش خۆی بۆ خۆی بنەمایەکی سەربەخۆیە و چەسپاوە بە ئایەتی:

﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[1].لەو ئایەتەشەوە بنچینەی " الضرورات تبيح المحظورات " و " الضرورات تقدر بقدرها" وەرگیراوە، جگە لە چەندین فەرموودەی پەیوەندیار...بۆیە لەم بارەوە بە کورتی چەند خاڵێك دەخەمە ڕوو:

١- لە بنچینەدا موراجەعەی ئافرەت بۆ لای پزیشکی پیاو، بەتایبەتی بۆ نەخۆشییەك کە پێویست بکات ئەو جێگایانە لە لاشەیدا ببینیت کە لەشەرعدا بە عەورەت دانراوە، حەرامە و درووست نییە، هەر ئاسانکاری و کەمتەرخەمی و گوێنەدانێك لەم بارەوە لادانە لە شەرع و بگرە لە فیترەتیش.

٢- زانایان لە کۆن و نوێدا، بۆ کاتی ناچاری و نەبوونی پزیشکی ئافرەت، با موسوڵمانیش نەبێت، ڕێگەیان داوە ئافرەتی نەخۆش لە لای پزیشکی پیاو پشکنین بکات و چارەسەری بۆ بکرێت، بەڵام ئەوە وەکو وتمان مەرجدارە بەوەی کە ئەگەر پزیشکی ئافرەت لەو دەڤەرە یان لە جێگەیەکی تر کە بتوانن بە ئاسانی پێی بگەن بوونی نەبێت.

---

[1] - البقرة/ ١٧٣

٣- لە شەرعی ئیسلامدا ئەسڵ ئەوەیە پیاو لای پزیشکی پیاو و ئافرەت لای پزیشکی ئافرەتی موسوڵمان چارەسەر بکرێت و پشکنینی بۆ بکرێت، ئەگەر نەبوو لەلای ئافرەتێکی ناموسوڵمان و ناوابەستوو بوو بە شەرع، ئەگەر ئەویش نەبوو، ئەوسا لەلای پزیشکێکی پیاوی موسوڵمانی وابەستە بەدین، ئەویش لە ڕووی ناعیلاجییەوە، ئەگەر ئەویش نەبوو ئەو کاتە ناچار چارەسەر بکرێت ئەگەر لای پزیشکێکی ناموسوڵمان و نا مولتەزیم یش بووە، لەبەر ئەوەی مەترسی لەسەر ژیانی درووست نەبێت، چونکە پاراستنی گیانی مرۆڤ لە ئیسلامدا ئامانجە.

٤- ئەگەر نەخۆشی و کێشەی ئافرەتەکە لەو جێگایانە بوو کە تا رادەیەك ئاساییە پشکنینی بۆ بکرێت بەراورد بە شوێنەکانی تر، ئەوە لە ڕووی زەرورەتەوە ئاسانترە تا ئەوەی بگاتە پشکنین و چارەسەر کردنی هەندێ ئەندامی ئافرەت کە بە عەورەتی مغلظة لە شەرعدا ناوبراوە، ئەمەیان پێویستە لەسەر ئافرەتەکەو سەرپەرشتیارەکەشی زۆر لێی وردببنەوە تا بتوانن لە ڕێگەی سەفەر کردن بۆ شارو شوێنی تر و پارە خەرج کردنی زیاتر بۆ لای پزیشکی ئافرەتی ببەن و ، ڕێگە نەدەن خوشك و دایك و هاوسەرەکانیان بخەنە بەردەستی کەسانێك ڕەنگە لە ژیانیاندا نەك یەك ڕکات نوێژیان نەکردبێت، بەڵکو هەر نەزانن حەڵاڵ و حەرام یەعنی چی؟! ئەوەش بۆ کەسی سەرپەرشتیار - ئەگەر ناچار نەبێت - ستەمێکە لەو کچ و ئافرەتەی دەکات.

٥- كە ئەڵێین زەرورەت واتە یەكەم پزیشكێكی ئافرەتی موسوڵمان یان نا موسوڵمان لەو شارو شوێنەی نەخۆشەكە بوونی نەبێت جگە لە پزیشكی پیاو نەبێت، هەروەها نەخۆشیی ئافرەتەكەش بە شێوەیەك بێت دواخستن هەڵنەگرێت و بە چارەسەر نەكردنی زیان لە تەندروستی بكەوێت و مەترسی لەسەر سەلامەتی درووست ببێت.

**تێبینی:** زانایان باسی مەرجەكانی زەرورەتیان كردووە كە حەرامی بۆ حەڵاڵ ئەبێت، بەڵام ئێرە جێگای شیكردنەوەیان نییە.

٦- ئەگەر ئەو زەرورەتەی ئاماژەمان پێكرد درووست بوو، پێویستە ئەو ئافرەتە نەخۆشەی كە پزیشكی پیاو چارەسەری دەكات مەحرەمێكی لەگەڵدا بڕواتە ژوورەوە بۆ لای دكتۆرەكە، چی لە نۆرینگە بێت یان لە هۆڵی نەشتەرگەری، سەرپەرشتیارەكە هەوڵی خۆی دەدات ئەگەر ڕێگە نەدرا لە ڕووی شەرعەوە پۆزشی بۆ خۆی هێناوەتەوە.

٧- گومانی تێدا نیە تاکە شتێك کە مرۆڤ لە هەڵە و تاوان بگێرێتەوە دینە و ترسی پەروردگار ورۆژی دواییە، کەواتە ئەو پزیشکەی کە هیچ وابەستە بوونێکی بە دینەوە نییە، یان بە کەسێکی بێ دین ناسراوە، هیچ متمانەیەکی لەسەر نییە ئافرەتێك بخرێتە ژێر دەستی، وابزانم زۆربەشمان لەو بارەوە چیرۆکی ناخۆش و تاڵمان بیستووە، ئەو پزیشکە هەرچەند پیشەییش بێت لە کارەکەیدا و بەسەرڕاستی و ڕیك و پێکی ناسرابێت، ئەوە مەسەلەیەکی کاتی و ڕێژەییە، مەرج نییە هەموو جارێك سنووری ئەو پیشەیی بوون وئاکار جوانییە بپارێزێت، بەڵکو پزیشکی وابەستە بوویش بە دینەوە لە هەر لەحزەیەکی لاوازی ئینسانیدا وەکو پزیشکە ناوابەستەبووەکە مامەڵە دەکات، هەر بۆیە زانایان فەرموویانە پزیشکی ئافرەت ئەگەر موسوڵمانیش نەبێت لە پێشترە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ژن، لە پزیشکی پیاو با موسولمان و پابەندیش بێت بەدین و ئاکاری جوانەوە.

٨- یەکێکی تر لە پێوەرەکانی زەرورەت ئەوەیە، ئافرەتەکە نەخۆشییەکی بەپەلە ولەناکاوی هەبێت و پێویستی بە فریاکەوتنی هەنووکەیی هەبێت و تەنها پزیشکی پیاویش هەبێت بۆ چارەسەرکردنی، بە پێچەوانەی هەندێ نەخۆشی کە ئاساییە دوابخرێت تا بوار دەرەخسێت بۆ ئەوەی بچێتە لای پزیشکێکی ئافرەت.

٩- ئینجا زانایان ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە سەرپەرشتیاری هەر ئافرەت و کچێك ئەگەر توانای بوو لەسەر خەرجی خۆی چارەسەریان لەلای پزیشکی ئافرەت بکات و بەو پارە خەرج کردنە ئیتر ناچار نەبوو بیانباتە لای پزیشکی پیاو، ئیتر ئەو کارە پێویست دەبێت لەسەری بیکات .

١٠- زانایان لەم بارەوە جەختیان لەسەر ئەوە کردووەتەوە ئەگەر بە بنەمای زەروەت کار کرا، پێویستە ڕەچاوی بنەمایەکی تر بکرێت کە بریتییە لە: (الضرورة تقدر بقدرها) واتە زەرورەت و پێویستی بە پێی خۆی و بەو ئەندازەی کە پێویستە ئەنجام دەدرێت نەك بەڕەهایی، بۆ نموونە پێی نەخۆشەکە پێویستی بەچارەسەرە، حەرامە لەوە زیاتر بۆ نموونە تاکو ڕانی دەربخرێت، لەمەشدا دینداری و زانستی شەرعی وکەسایەتی بەهێزی ئافرەتەکە و سەرپەرشتیارەکەی ڕۆڵی باش دەگێڕێت.

١١- هەر لەسەر مەسەلەی زەرورەت خاڵێکی تر هەیە شایانی ئاماژە پێکردنە ئەویش ئەوەیە هەندێ جار پزیشکی ئافرەت هەیە بەڵام لێهاتو نییە و بە ئەزموون دەرکەوتووە لە پسپۆڕییەکەیدا کارامە نییە و پزیشکی پیاو هەیە لەو بەتواناترە، لەو حاڵەتەدا و لەبەر گرنگی ژیانی مرۆڤەکە پەنا بۆ پزیشکە پیاوەکە دەبرێت لەڕووی ناچارییەوە.

١٢- پرسێکی تر هەیە شایانی هەڵوەستە کردن و لێ وردبوونەوەی زۆرە، ئەویش بریتییە لە سەردانی ئافرەتی دووگیان بۆ لای پزیشکی پیاو! وەکو پشکنینی تیشك وسۆنار وتەنانەت پشکنینی عەورەتی ئافرەت و مەسەلەی مناڵبوون، ئەم بوارە بێگومان پزیشکی ئافرەتان زۆرن و بێگومان لەو بوارەدا لە پیاوانیش لێهاتووترن، هەڵەیەکی شەرعی زۆر گەورەیە و سیفەتێکی ناشیرینە بۆ ئافرەت و سەرپەرشتیارەکەی ئەوە قبوڵ بکەن، مەگەر لە نەبوونی پزیشکی ئافرەتدا کە ئەوەش لە مەحاڵەوە نزیکە.

١٣- هەروەها سەبارەت بە سەردانی کردنی ئافرەت بۆ لای پزیشکی ددانی پیاو، کە ئەمەیان حاڵەتی بەپەلە و لەناکاوو ناچاری زۆر کەمترە، ئەمەش لەلایەن موسوڵمانانەوە کەمتەرخەمییەکی زۆری تێدا درووست بووە و سنووری شەرعی زۆر تێدا - بە خۆرایی - دەبەزێنرێت، چونکە سروشتی ئیشەکە وا پێویست دەکات پزیشکەکە زۆر لە ئافرەتەکە نزیك بێتەوە و بۆ چەندین سعات ئەو ئافرەتە - جاری وا هەیە دوو بە دوو - لەبەردەستی پزیشکێکی پیاودا دەبێت - کە ئەو دکتۆرە ئەگەر کەسێکی زۆر پابەندیش بێت بە شەرعەوە، دواجار مرۆڤە و قابیلی گوناه کردنە و بەبەردەوامی ئەنجامدانی ئەو کارە تەواو لەلای ئاسایی دەبێتەوە - ئینجا چارەسەرکردنەکە لە کەشێکی بەریەککەوتن و تەماشاکردنی ناشەرعی و ناشیریندا بەڕێوە دەچێت و زانایانی ئەم سەردەمە بەتایبەت فەتوای حەرامی

سەردانی ئافرەتیان بۆ لای پزیشکی ددانی پیاو داوە و شاراوەش نییە کە پزیشکی ددانیش لە ئافرەتاندا زۆرە ، ئەمەش مەگەر لە ڕووی زیانێکی مسۆگەردا و لە نەبوونی پزیشکی ددانی ئافرەت یان هەبێت بەلام لێهاتو نەبێت و ئەگەری سەقەتکردنی دانەکانی هەبێت، ئەو کاتە لەڕووی زەرورەتەوە ڕێگە دەدرێت، بەڵام بەداخەوە هەندێ جار بە بیانووی جیاوازەوە ئافرەتان خۆیان حەز لەسەردانی پزیشکی پیاو دەکەن و پیاوانیش بە هەمان شێوە حەز بە سەردانی پزیشکی ئافرەت دەکەن، کە ئەمەش لە ڕووی شەرعییەوە ولەبەر نەبوونی پاساو کارێکی نادرووست و ناشەرعییە.

ئەم پرسە لە کتێبی زانایان لە کۆن و نوێدا بەتێروتەسەل باس کراوە، لێرەدا هەوڵمداوە پاش خویندنەوەی بۆچوون و وتەکانیان لەو بارەوە ، پوختەیەك پێشکەش بکەم بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە لە واقعدا بە چاوی خۆم دەیبینم..والحمد لله الذي بنعمته تم الصالحات.

## پەیامی بیست و شەش:
## ئێوە پابەندی ئیسلام بن؛ نەوەیەکی دیندار بەڕێوەیە

کە دەبینم کچێك یان ئافرەتێکی کورد پابەندی ئیسلامە و بڕیاڕی داوە بە ڕاستی عەقیدەی تەوحید بکاتە بنچینەی ژیانی خۆی و سەرەڕای ئاستەنگەکانی جاهیلەییەتی سەردەم، شەرعی ئیسلام لە خۆیدا بەرجەستە بکات،
کە دەبینم دەیەوێت لەو هەڵانەی ساڵانێکە بە هۆکاری جۆراوجۆرەوە لە ڕێگەی نەیارانی ئیسلام و تەنانەت ئەو دۆستانەش کە ناڕاستەوخۆ ڕۆڵی نەیاریان بینیوە، دەیەوێت دەربازی بێت و تەنها شانازی بە دینەکەی بکات لە ڕێگەی هەردوو سەرچاوەی کیتاب و سونەت و پێیان سەربەرزە..
دڵم خۆش دەبێت و هەست بە ئاسوودەیی دەکەم و ئەو دوور کەوتن و گومڕاییە فیکری و مەنهەجییەی ئەمڕۆ کورد تێکەوتووە وباڵی ڕەشی بەسەر زۆرینەدا کێشاوە، لەلام ئاسان دەبێت و دەڵێم:
هێشتا هیوای گەڕانەوە بۆ ڕێگای ڕاستی قورئان و سونەت هەر ماوە! زیاد بوونی ژمارەی ئەو ئافرەتانەی بەرەو تەوحید و ئیسلامی ڕاستەقینە دەڕۆن و واقیعی تاڵی موسوڵمانانیان بۆ دەرکەوتووە و ڕاستییەکان وەکو خۆی دەبینن و ، بەجاهیلییەتی هاوچەرخ فریو ناخۆن و لەبەرزایی ئیمانەوە تەماشای زەلکاوەکانی بەناو

شارستانێتی هاوچەرخی ڕۆژئاوا دەکەن سەبارەت بە دیدو تێڕوانینیان بۆ ئافرەت کە وەکو ئامرازێکی سێکسی تەماشای دەکەن، .

ئەوە لە ڕاستیدا حالەتێکی دڵخۆشکەرە و نیشانەیەکی باشە و ئاماژەیە بۆ ئاییندەیەکی پرشنگدار با زۆریش نزیك نەبێت.

تا ئەو کاتەی لەناو ئافرەتاندا پابەند بوون بەمەنهەجی پێشینانی ئوممەت بوونی هەبێت و لە وردەکاری عەقیدە تەوحید تێبگەن و وردببنەوەو ئامادە بن بە باڵا پۆشـــی ڕواڵەتیان و بە پاراوی ناخیان ڕوو بەڕووی ئەم جاهیلییەتە ببنەوە و بەرانبەر تـانە و تەشـــەری کۆمەڵگـا ئـارام بگرن، کەواتە خێر و چـاکە هەر ماوەتەوەو، ئەو لادان و کەم و کورتییەی ئەمڕۆ لە واقیعی موسـولمانـاندا هەیە، ســـبەی لەڕێگەی ئەم ئافرەتانەوە نەوەیەك ســـەرهەڵدەدات کە شـــانازی بە دینەکەیـانەوە دەکەن و، لە هەموو لادان و شـــێوانـدن و لێـڵ کردن و دوورخســـتنەوەیەك لە هەردوو ســـەرچاوە ســـازگارەکەی دەیپارێزن، لە جیاتی ئەوەی نانی پێوە بخۆن و بیکەنە ڕێگەی خۆ پێگە یاندنی دونیایی، خۆیان بە قوربانی دەکەن، ئەگەر ئێوە دەســـت بە ئیســـلامی کتاب و ســـونەت و ڕێبازی پێشـــینانی چاکی ئەم ئوممەتە بگرن، کەواتە خێر و ڕوو ناکی لە ناوماندا نابڕێتەوە و تاریکی جەهل بە ئیســـلام لە داهاتودا هەر دەڕوێتەوە و کەم دەبێتەوە.

باوەڕم وایە ڕۆڵی یەك وابەستە بووی ئێوە بە ڕاستەقینە بە کیتاب و سوننەتەوە ، ڕۆڵ و کاریگەری لە چەندین پیاو بە هەمان وابەستە بوونەوە زیاترە! چونکە ئێوە لە ڕێگەی پەروەردەکردنی زانستی و مەنهەجی خۆتان و بازنەی ژنان و کچانی نزیك لە خۆتان و منداڵەکانتانەوە کە دەتوانن ئەنجامی بدەن، دەتوانن گۆڕانکاری گەورەو جەوهەری لە واقیعی نالەباری موسوڵماناندا درووست بکەن، بە مەرجێك لە لادانەکانی جاهیلییەتی هاوچەرخ کە هەندێکی بە ناو ئیسلامیشەوە دەکرێت ڕزگارتان ببێت و ئەو تاقیکردنەوە تێپەڕێنن و بە عەقیدەو مەنهەجی ڕاستی پێشینان قەرەبووی بکەنەوە و، لە ڕێچکە و ڕێبازی تەم و مژاوی ئەم واقیعەی ئەم ڕۆژگارەدا ڕزگارتان ببێت.

# پەیامی بیست و حەوت: ئافرەت چۆن مامەڵە لەگەل ستەم و (نشوز) ی مێردەکەیدا بکات؟

زۆر جار ڕوو دەدات ستەم و سنوور بەزاندن لە لای پیاوانەوە بێت، جا هەر چەند ئەم زنجیرە تایبەت بوو بە ئافرەتانەوە، بەڵام بە باشم زانی ئاماژەیەکی خێرایش بە (نشوز) و خراپەی پیاوانیش بکەم.

ئەگەر (نشوز) و کەمتەرخەمی بەرانبەر مافە شەرعییەکانی ئافرەت لە لایەن پیاوەوە ڕووی دا، ئەوە نابێتە پاساو بۆ ئافرەت ئەویش لە بەرانبەردا یاخی بێت و سنووری ڕێزگرتن لە مێردەکەی ببەزێنێت بە گوێرایەڵی نەکردنی یان قسە پێکردن و ئازاردانی، چونکە ئەو خراپەو سنوور بەزاندنەی مێردەکەی - ئەگەر چی کارێکی خراپە و پەروەردگار پێی ناخۆشە - بەڵام مافەکانی لەسەر ژنەکەی لانادات و ئافرەت هەر دەبێت ڕێز لە مێردەکەی بگرێت و دەتوانێت ئەم هەنگاوانە لە پێناو چاککردنی ئەوەدا هەڵگرێت:

یەکەم: ئامۆژگاری بکات و بە الله تعالی بیترسێنێت و ئەوەی بۆ ڕوون بکاتەوە کە هاوسەر پێویستە بە هیچ شێوەیەك ستەم لە هاوسەری خۆی نەکات و هەموو مافێکی شەرعی کە ئیسلام پێی داوە ئەویش بە ئەو پەڕی ڕازیبوونەوە پێی بدات.

دووەم: ئەگەر بەو شێوە سوودی نەبوو، پەنا بباتە بەر کەسێکی دڵسۆز وژیر و خاوەن تەقوا کە کاریگەری لەسەر ئەو پیاوە هەبێت، بۆ ئەوەی ڕۆڵێکی کاریگەر لە چاککردنی ئەو هاوسەرەدا ببینێت، بەڵام بێ ئەوەی ناوزڕاندن و گەورە کردنەوەی کێشەکەی تێدا بێت بۆ کێشەیەکی نوێ لە جۆرێکی تر.

سێیەم: ئەگەر مێردەکە لەسەر خراپەکانی بەردەوام بوو و زیانی بەو ئافرەتە گەیاند وگوێڕایەڵی شەرعی ئیسلامی نەکرد لە مەسەلەی ڕێزگرتن لە هاوسەرەکەی و پێدانی مافەکانی و، ئافرەتەکە لە توانایدا نەبوو بەردەوام بێت لەو ژیانە، مافی خۆیەتی و دەتوانێت داوای جیابوونەوەی لێ بکات، ئەوەش پێویستە دوای وردبوونەوەی زۆر و ڕاوێژ و بەراوردکردنی چاکەو خراپەی ئەو جیابوونەوە بکرێت، چونکە (طلاق) لە ئیسلامدا راستە لە کاتی پێویستدا ڕێگە پێدراوە وچارەسەریشە هەندێك جار، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی کاتێك پەنای بۆ ئەبرێت کە هەموو دەرگاکانی چارەسەر بە ڕووی هاوسەرەکاندا دابخرێت وتەنها تەڵاق و جیابوونەوە بمێنێتەوە، چونکە تەڵاق زۆر جار دەرەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە و هاوسەرەکان لەو هەنگاوە پەشیمانی دەدوورنەوە.

هەروها زانایان باسیان لەوە کردووە، ئەگەر ئافرەت نەخۆش بوو، یان تەمەنی گەورە بوو بوو، یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر و هاوکات حەزی دەکرد لە گەڵ هاوسەرەکەیدا بەردەوام بێت، ئاساییە سازش ی لە گەڵدا بکات بە واز هێنان لە هەندێ لە مافەکانی خۆی وەکو مانەوەی مێردەکەی لەلای، یان کەم کردنەوەی هەندێ لە نەفەقە و خەرجییەکانی، بە مەرجێك ئەو مێردە لەلای خۆی بیهێڵێتەوە و لێی جیا نەبێتەوە، وەکو الله تعالی لە قورئاندا فەرمویەتی: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا﴾[1]

لەم بارەوە دایکمان عائیشە الله لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: (هي المرأة تكون عند الرجل لا يستكثر منها فيريد طلاقها ويتزوج عليها تقول له أمسكني ولا تطلقني وأنت في حل من النفقة علي والقسمة لي) واتە ئافرەتێك مێردەکەی زۆر حەزی لێ نەکات و لێی بێزار بووبێت، یان سوور نەبێت لەسەر مانەوە لەگەڵیدا و بیەوێت تەڵاقی بدات و ژنی بەسەردا بهێنێت، ئافرەتەکە بڵێت با لەلات بمێنمەوە و تەڵاقم مەدە و لەمەسەلەی نەفەقەو مانەوەی شەو سازشی لەگەڵ بکات بە چاوپۆشی کردن لە مافەکانی، یان هەندێك لە مافەکانی خۆی. زۆر جاریش هەیە ئەم بژاردەیە بۆ ئافرەت باشترە و لەوە زیاتر لە بەرژەوەندیدایە کە لێی جیابێتەوە. ئەمەش بە واتای ئەوە نایەت کە هەر پێشێلکارییەکی مێردەکەی بۆ مافی هاوسەکەی لە ڕووی شەرعەوە دروستە.

[1] - النساء:١٢٨.









بە شێوەیەکی گشتی ستەم و (نشوز)ی پیاو هۆکاری زۆرە و چارەسەرکردنی و مامەڵە کردن لەگەڵیدا بە پێی هۆکاری ئەو حالەتانەدا دەبێت، بۆ نموونە:

١- جاری وا هەیە هۆکاری نشوزی پیاو خراپی مامەڵە و ڕەفتاری ئافرەتەکەیە.

٢- نەمانی گفتوگۆ و لێکتێگەیشتن لە نێوان ژن و پیاودا ئەوەی کە (الطلاق النفسي) جیابوونەوەی دەروونی پێ دەوترێت.

٣- گەورەیی تەمەنی ئافرەتەکە و نەتوانینی بۆ دابین کردنی پێویستییەکانی مێردەکەی.

٤- ڕێکنەکەوتن و کێشە بە هۆی هەبوونی زیاتر لە ژنێك و زاڵ نەبوونی پیاو بەسەر دۆخەکەدا.

٥- هەندێ جار ستەم و خراپی پیاو پەیوندی بە منداڵ نەبوونی ژنەکەی هەیە و پیاوەکە ناتوانێت لەوە تێبگات کە ئەوە لە دەسەڵاتی ئەودا نییە و تەنها بەدەستی الله عزوجل ە.

٦- هەندێ جار پەیوەندی بە سروشت و پێکهاتەی خودی پیاوەکە هەیە کە ناتوانێت پابەندی ژیانی خێزانی ببێت و هەمیشە حەزی لەدەرەوەی ماڵەو بە دانیشتن و مانەوە لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانیدا ئاسوودە نابێت.

# پەیامی بیست و هەشت: سایکۆلۆژیای بێوەژن بوون

بێوەژنی قەیرانێکی دەروونی و کۆمەڵایەتییە بۆ ئەو کەسەی تووشی دەبێت. جا چۆن تێپەڕبێت بە سەلامەتی و بێوەژنان بتوانن درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن؟!

کاتێك مێرد یان هاوسەرەکەی وەفات دەکەن، هەمووان بە مەبەستی دڵنەوایی و سەرەخۆشی دەورەیان دەدەن، بەڵام لەگەڵ تەواوبوونی ڕۆژانی ماتەمینی و پرسە، ئەو کەسە تەنها دەبێتەوە و لەگەڵ یادگارییەکانیدا دەژێت و تاڵی تەنهایی و دڵەڕاوکێ لە داهاتوو دەچێژێت.

ئینجا بێوەژنی، یان مردنی یەکێك لە هاوسەرەکان لەکاتی پیریدا کارەساتێکی زۆر ناخۆشە و ڕووداوێکی دڵتەزێن و گرفتێکی قورسە، چونکە لە کاتێکدایە کە مرۆڤ لە ئەوپەڕی پێویستیدایە بە هاوڕێ و هاودەم و یارمەتیدەر؛ بە شێوەیەکی گشتیش پیاوان زیاتر تووشی پەژارە و کاریگەری دەبن، بۆیە دەبینی زووتر دەگەنە هاوسەرەکانیان پاش لەدونیا دەرچوونیان.

بەڵام لە واقیعدا قەیرانی بێوەژنی بارێکی قورسترە بەسەر ئافرەتانەوە تاکوو پیاوان. زۆر جاریش مێردەکان لەپێشدا دەمرن، بۆیە هاوسەرەکانیان ناچار دەبن ڕۆڵی ئەوانیش ببینن و مناڵ بەخێو بکەن و ئارام بگرن سەبارەت بە دیدی کۆمەڵگا بۆ ئافرەتێکی بێمێرد، کە دەبینیت چاودێریی هەموو هەڵسوکەوت و هەڵوێستێکیان دەکەن، تەنانەت هەناسەکانیشیان لەسەر دەژمێرن!

بەلای هەندێکەوە ژیانی ئافرەت بریتییە لە کۆمەڵێك چاوەڕوانی؛ چاوەڕوانی شووکردن و منداڵبوون و گەورەبوونیان و ژنهێنان و شووکردنیان. بۆیە ئافرەت -بەتایبەتی لە کۆمەڵگای خۆماندا- زۆرێك لە هیواکانی دەبەستێتە هاوسەرگیرییەوە، لەو هاوسەرەش چاوەڕوانە کە ببێتە بەخێوکەر و پشتیوان و هەمووشتێك بۆی، ئا لێرەوە دەبینین بێوەژن بوون ، دەبێتە مایەی تاڵی چەشتنێکی دەروونی و عاتیفی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، قووڵتر لەوەی کە لەلای مێرد دروست دەبێت لەکاتی مردنی هاوسەرەکەیدا. پیاو بەتایبەتی ئەگەر بەتەمەن بێت، بە مردنی هاوژینەکەی تووشی ناڕەحەتی و گیروگرفتی بەڕێوەبردنی ماڵ و زۆر شتی تر دەبێتەوە، بۆیە دەبینیت ناچار دەبێت ژن بهێنێت. بەڵام ئافرەت بە مردنی مێردەکەی قۆناغێك لە ناهاوسەنگی و گۆشەگیری بۆ دروست دەبێت، بۆیە یان دەبێت خۆڕاگر بێت بۆ ئەوەی بتوانێت هەڵسێت بە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی و بەخێوکردنی منداڵەکانی بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر بۆ تێپەڕاندنی ئەو قەیرانە، بۆ ئەوەی بتوانێت ڕۆڵی دایك و باوك پێکەوە ببینێت، یان ئەوەیە تووشی هەرەس و ڕووخان بێت و خۆی بە دەستی زۆرێك لەو ئازارانەوە بدات.

بێوەژن تووشی ئازار دەبێت لەڕێگەی زۆر پرسیار کە لەلایەن منداڵەکانییەوە ئاراستەی دەکرێن و نازانێت چۆن وەڵامیان بداتەوە، یان لەو کاتەی وەفاتنامەی مێردەکەی وەردەگرێت و، لەو کاتانەی کێشەی دارایی بۆ دروست دەبێت و، یان جاری وا هەیە هەندێك لە خزمان تەماعی میراتی مێردەکەی دەکەن.

هەروەها تووشی ئازار و فشاری دەروونی دەبێت کاتێك دەچێتە نێو کۆمەڵگا بەبێ هەبوونی مێرد کە ڕۆڵی پۆشاکێکی دەبینی بۆ داپۆشینی کەموکورتییەکانی، جگە لەوەش دەترسێت خەڵکی بە خراپە تەماشای بکەن و باسی بکەن، ڕۆژانەش یادگارییەکانی هاوسەرەکەی ئێش و ئازاری دەدەن، لەکاتێکدا هەمووشتێك لە دەوروبەری ئەوی وەبیر دەهێننەوە، هاوکات تووشی گیرۆدەییەکی سەخت دەبێتەوە بەتایبەتی ئەگەر لە بەهاری تەمەنیدا بێت؛ لەنێوان شووکردن و ترس و دڵەڕاوکێ لەسەر دواڕۆژی مناڵەکانی.

لەوانەیە یەکێك لەو هۆکارانەی کێشە و فشارە کۆمەڵایەتییەکانی لەسەر لابەرێت، ئەوە بێت باوك و دایکی بێوەژنەکە یان یەکێکێکیان لە ژیاندا بن، چونکە کۆمەڵگا جاری وا هەیە شووکردنی بێوژن بە جۆرێك لە بێوەفایی بەرانبەر مافی ئەو مێردە لەقەڵەم دەدا. بێ گومان ئەم دیدەش لە ڕووی شەرعییەوە هەڵەیە، ئینجا ئەگەر بیەوێت شوو بکات و مناڵی هەبێت، کێشەی بەخێوکردنی مناڵەکەی بۆ دروست دەبێت یان جاری وا هەیە کەسوکاری مێردە مردووەکە بەهۆی مناڵەکانەوە داوا لە بێوەژنەکە دەکەن شوو بە یەکێ لە ئەندامانی خێزانەکە بکات.

لەوانەشە خۆشەویستی بۆ منداڵەکانی و ترسی لەسەر دواڕۆژیان زاڵ بێت بەسەریدا. ئەوەی ماوەتەوە لە تەمەنی بۆ ئەوانی تەرخان بکات و هاوسەرگیری نەکات. هاوکات دەشترسێت پاش هەموو ئەو ساڵانەی لە چاودێریکردنی منداڵەکانیدا بەسەری برد، ژن بهێنن و بەتەنها بەجێی بهێڵن، یان لەگەڵیاندا بژی بەڵام بەلایەوە ئەستەمە کە میوانێکی قورس بێت لەلای خێزانێك یا خێزانی یەکێك لە کوڕەکانیشی بێت. بەهۆی ئەمانەشەوە دەبینین زۆرێك لە بێوەژنان (٣٥% بەپێی هەندێك لێکۆڵینەوە) دووچاری چەندین نەخۆشیی و ڕووداو دەبن.

## چۆن بێوەژن بەسەرکەوتوویی درێژە بە ژیانی بدات؟

- سەرەتا پێویستە لەسەریان هاوسەنگی و جێگیربوون و هێمنی بۆ خۆیان بەدی بهێنن لەڕێگەی عیبادەت و دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی دڵەڕاوکێ و ئاڵۆزبوون، چونکە ژیان بە مردنی مێردەکەی کۆتایی پێ نایەت. هەموو ساتێکی ئەم ژیانەش نیعمەتێکی ئیلاهی بەنرخە. ستەمە بەزایە بدرێت لەڕێگەی خەم و ئازارەوە. دەرگای خەمەکان دابخە و پەنجەرەی ڕازیبوون بکەرەوە بۆ ئەوەی تیشکی هێمنی و دڵنیابوون و ئارامی بۆ خۆت و منداڵەکانت بێتە ژوورەوە.

- پێویستە هەوڵ بدەن بۆ بەدەستهێنانی زانیاری ئەوتۆ کە یارمەتییان بدات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ واقیعی تازەدا بەسەرکەوتوویی، پێویستە بیرۆکەی بێدەسەڵاتی و بێ چارەیی ڕاو بنێن و بیر لە سەربەخۆیی و پشتنەبەستن بە کەسانی تر بکەنەوە.

- بێوەژنان پێویستیان بە هەندێك کاتە بۆ ڕاهاتن لەگەڵ ژیانی نوێیاندا، پێویستە لەسەر منداڵەکانیش جۆرەکانی چاودێری بۆ دایکیان بڕەخسێنن و چاکەی باوکیشیان لەم قۆناغە نارەحەتەدا بگێڕنەوە و خۆشەویستی و سۆز بۆ دایکیان بنوێنن و بازنەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان فراوان بکەنەوە و ئەو بۆشاییەی کە دروست بووە پڕی بکەنەوە.

- بێوەژن - لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ یادگارییەکانیدا بژێت - پێویستە لەسەری هەندێ پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بۆ خۆی ساز بدات، وەکوو فریاگوزاریی پەلە بۆ سارێژکردنی برینەکانی.

- ئەگەر بێوەژن بەئەمەك بێت بۆ مێردەکەی و کۆشش بکات لەپێناوی منداڵەکانیدا، سۆز و یارمەتی و پشتگیری بەدەست دەهێنێت بۆ تەواوکردنی گەشتەکەی لە پەروەردەکردن و چاودێریی منداڵەکانیدا.

- شووکردنەوە بۆ ئافرەت مافێکی شەرعییە پاش تێپەڕبوونی عیددەکەی، بەتایبەت ئەگەر لە سەرەتای گەنجیدا بێت و مناڵی هەبێت لەچوارچێوەی خێزانێکی ئاساییدا پێویستی بە چاودێری هەبێت بۆی هەیە شوو بکات و مێردێکی باش هەڵبژێرێت کە لەگەڵیاندا باش بێت و لێپرسراوێتییان هەڵگرێت. ئەو کەسەش لە ماڵی خۆیدا هەتیو بەخێو دەکات، پلەوپایەکی هەرەبەرزی هەیە لە دونیا و دواڕۆژدا.

پێویستە لەسەر منالی پێگەیشتوویش بایەخ بەدایکیان بدەن و چاکەی لەگەڵ بکەن و پشتگیری بکەن ئەگەر ویستی شوو بکاتەوە. ئەوەش کە دەیخوێننەوە لە کتێب و ڕۆژنامەکاندا دەربارەی مێردی ئەو بێوەژنەی مناڵەکانی دەرکردووە یان دایکی بێوەژنەکە مناڵکانی بەخێو ناکات، ئەوانە حاڵەتی دەگمەنن و پێوەر نین بۆ هەڵوێستی کۆمەڵگا لە شووکردنی بێوەژن.

- ئەگەریش بێوەژن بڕیاری شوونەکردنی دا، با بەباشی چاودێریی مناڵەکانی بکات و بزانێت چۆن هەڵسوکەوت دەکات و لە کارەکانیدا سەرکەوتوو دەبێت. با زۆر بەسۆز و وردبین بێت لە کاروبارەکانیدا و ببێتە پێشەنگ بۆیان.

- لەکۆتاییشدا لەسەرمانە کەش و هەوایەکی وا بدۆزینەوە نەك هەر تەنها ببێتە مایەی چارەسەرکردنی گرفتەکانی قەیرانی بێوەژنی، بەڵکوو ببێتە مایەی پەیداکردنی ژیانێکی ئاسوودە بۆیان. لەجیاتی ئەوەش کە بێوەژن بارو کێشەیەك بێت بەسەر کرمەڵگا، یان لە پەراوێزیدا بێت، لەکاتێکدا خودی کۆمەڵگا لەو جۆرەی زۆر تێدایە، با ببێتە فاکتەرێکی کاریگەر بۆ دروستکردنی ئەو کۆمەڵگایە و، هەستیش نەکات جێگەی بەزەییبە لەلایەن خەڵکییەوە، بەڵکو هاوبەشێکە لەنێو ئەندامەکانیدا و پێویستە سوودمەند بێت لە هەموارکردنی ژیانێکی سەربەرزانە.

# پەیامی بیست و نۆ:
# (نشوز)و یاخیبوونی ئافرەت پێناسەو هۆکارو دیاردەکانی

پێناسەی ( نشوز) ژیانی هاوسەرگیری جاری وا هەیە بە بێ کێشە و ناخۆشی بەسەر دەچێت و زۆر جاریش کێشەو ناخۆشی تێدەکەوێت، یەکێکیش لە دیاردەکانی ناخۆشی لە ژیانی خێزانیدا مەسەلەی یاخیبوون و بەلەسە بوون و هەلگەرانەوەی ئافرەتانە بەسەر مێردەکانیاندا کە لە شەرعدا بە (نشوز) دەربڕینی لێکراوە.

لە ڕاستیدا (نشوز) حوکمێکی شەرعییە لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا ڕوودەدات زیاتر پەیوەندی بە ئافرەتانەوە هەیە، لە قورئان و لە فەرموودەکاندا باسی هاتووە و زانایان بە تێروتەسەل قسەیان لەسەر کردووە و، باسەکەش زۆر باسێکی گرنگەو کاریگەری نەخوازراوی لەسەر ئاسوودەیی خێزانەکان هەیە، جا با بزانین (نشوز) واتای چییە و دیاردەو هۆکار و سنوورەکانی چیین؟

سەرەتا با پێناسەی لە دوو ڕووەوە بکەین، وەکو زمانەوانی و وەکو زاراوە:

١- (نشوز) لە ڕووی زمانەوانییەوە وەکو لە فەرهەنگەکانی زماندا هاتووە واتای بەرزی ( الارتفاع) دەگەیەنێت، لە زمانی عەرەبیدا دەوترێت: (مکان ناشز) واتە جێگایەکی بەرزە.

بۆ نموونە دەتوانیت لەم سەرچاوانەوە زیاتر لە واتای زمانەوانی وردبیتەوە: (لسان العرب، لابن منظور ٤١٧/٥-٤١٨، باب الزاي، فصل النون)، (المعجم الوسيط، ٢٥٦/٢، باب النون) ، (الصحاح للجوهري، ٨٩٩/٣، باب الزاي، فصل النون).

لە ڕووی زاراوەو شەرعیشەوە (نشوز) ئەو ئافرەتە دەگرێتەوە کە هەڵناسێت بە جێبەجیکردنی ئەو مافانەی لە ڕووی شەرعەوە لەسەریەتی بەرانبەر بە مێردەکەی، بۆیەش بەو جۆرە ئافرەتانە وتراوە ( ناشز) چونکە خۆیان لەوە بەرزتر دەکەنەوە کە گوێڕایەڵی حوکمەکانی شەرع بن کە وەکو ژن لەسەریان دانروە. (نشوز) یش لە نێوان ژن و مێردد ا واتە ڕق لیبوونی یەکێکیان لەوی تر، یان هەردوکیان لەیەکتر.

ئایەتی: (وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ)، ( نُشُوزَهُنَّ) واتە: هەڵگەڕانەوەو یاخی بوونیان، (نشوز) یش بە شێوەیەکی گشتی حوکمێکە لە بنچینەدا پەیوەندی بە ئافرەتانەوە هەیە . ئەمەی خوارەوەش چەند پێناسەیەکی زانایانە بۆ ئەو زاراوەیە:

- (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی پیناسەی ئافرەتی ناشیز فەرموویەتی: "المرأة الناشز هي: الكارهة لزوجها، السيئة العشرة" واتە ئافرەتی (ناشز) ئەو ئافرەتەیە کە حەز بە مێردەکەی ناکات و ڕەفتارو مامەڵەی ناشیرینە.

- (ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا بە پێناسەیەکی نزیك لە پێناسەکەی القرطبي فەرموویەتی: " المرأة الناشز: هي المرأة المرتفعة على زوجها، التاركة لأمره، المعرضة عنه، المبغضة له". واتە: ئافرەتی هەڵگەڕاوە ئەو ئافرەتەیە خۆی بەرز دەکاتەوە بەسەر هاوسەرەکەیدا و گوێڕایەڵی فەرمانی ناکات و پشت گوێی دەخات و حەزیشی لە مێردەکەی نییە.

هەندێکیش لە زانایان وەکو لە (الموسوعة الفقهية) دا هاتووە پێیان وایە (نشوز) لە ژن و لە پیاویشەوە دەردەکەوێت، وەکو ( الشرقاوي) دەڵێت: (إن النشوز يكون من الزوجة ومن الزوج وإن لم يشتهر إطلاق النشوز في حق الرجل) واتە: نشوز لە ئافرەت و لە پیاویشەوە ڕوو دەدات، ئەگەر چی وا بە ناوبانگ نییە نشوز بۆ پیاوان بە کار بێت.

## هۆکارەکانی (نشوز) و یاخی بوونی ئافرەت

هەڵگەرانەوەو یاخی بوونی ئافرەت هۆکاری زۆرە، ئەمەی لێرە باسکراوە هەندێکیانە:

١- ناڕێکی خودی ئافرەتەکە بە هۆی وەرنەگرتنی پەروەردەیەکی ئیسلامی یان خێزانی باش، کە بیپارێزیت لەوەی ڕەفتاری نەشیاو و مامەڵەی نەگونجاو لە ژیانی هاوسەرگیریدا بکات.

٢- هەڵبژاردنی هەڵە بۆ هاوسەر لە بنچینەوە، بۆیە ئەگەر هەڵبژاردنی هاوسەر لەسەرەتاوە لەسەر بنچینەی دینداری و ڕەوشت جوانی بێت دەرەنجامیشی زۆر جار باش ئەبێت، بە پێچەوانەشەوە دەرەنجامی هەڵەی هەڵبژاردنی هاوسەر ، دەرەنجامەکانی زۆر جار دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

٣- تێنەگەیشتنی ئافرەت لەو مافانەی کە لەسەریەتی بەرانبەر هاوسەرەکەی، بە هەمان شێوە تێنەگەیشتنی پیاویش لەو مافانەی کە هاوسەرەکەی هەیەتی بەسەرییەوە و ئیسلام بۆ هەردوو لایان دیاری کردووە.

٤- هەبوونی کەسێك وەکو هۆکار وهاندەر بۆ ئەوەی ئافرەت یاخی بێت ولە گوێڕایەڵی مێردەکەی دەربچێت.

٥- جیاوازی کۆمەڵایەتی و فیکری لە نێوان هەردوو هاوسەرەکەدا، واتە (تکافؤ) هاوسەنگی نییە لە نێوانیاندا، ئەو هاوسەنگییەش لە سەرەتا و پێش دەستپێکردنی پرۆسەی هاوسەرگیری باشترە بایەخی پێ بدرێت، چونکە جیاوازی زۆری نێوان ژن و مێرد لە ڕووی خوێندن و بڕوانامە و سیما ڕوخسارو جیاوازی هەردوو بنەماڵە لەڕووی فیکری و بیروباوەڕو دەوڵەمەندی و باری کۆمەڵایەتی، ئەگەر بێت و بەکاریگەری دینداریيەکی تۆکمە نەبێت لەلایەن هاوسەرانەوە، زۆر جار کەلێنك لە نێوان هاوسەرەکاندا درووست دەکات جا لەگەل ڕۆژگاردا یان نامێنێت و دەتوێتەوە، یان گەورەتر دەبێت و چارەسەری نامێنێت.

٦- کاریگەری ڕاگەیاندن و عەولەمە و هەندێ یاساو ڕێسای ڕۆژئاوایی کە لە لای خۆمان برەوی پێبدەدرێت و کار بۆ چەسپاندنی لە کوردستان دەکرێت هەموو ئەوانە کاریگەری لەسەر هەندێك لە ئافرەتان هەیە وهەڵیان دەخەڵەتێنێت و هانیان دەدا سووکایەتی بە مافی مێرد و بگرە پیرۆزی خێزانیش بکەن .

٧- هەبوونی کێشەو دەمەقاڵە لە نێوان هەردوو هاوسەرەکەدا.

٨- ستەم کردن و لە خوانەترسانی میرد و نەپاراستنی بۆ سنوورەکانی الله تعالی، چونکە هەندێك لە پیاوان وەکو کوێلە تەماشای هاوسەرەکانیان دەکەن و وا دەزانن ئەوان لەبەر ئەوەی پیاون ئیتر ڕێگەیان پێدراوە ستەم لە ئافرەت بکەن و ئەو مافانەی کە ئیسلام پێیانی داوە ئەوان پێشێلی بکەن، ئیتر ئەو جۆرە ڕەفتارانەش دەبێتە ڕێگەخۆشکەر بۆ هەڵگەڕانەوەو (نشوز) ی ئافرەت، لەم بارەشەوە ئیسلام بە توندی ڕووبەڕووی ئەو جۆرە پیاوانە وەستاوەتەوەو لە چەندین ئایەت و فەرموودەدا فەرمان بە پیاوان کراوە چاکە لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا بکەن، بەرانبەر ئەوانەش کە خراپن لە گەل هاوسەرەکانیاندا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أما يستحي أحدكم أن يضرب امرأته كما يضرب العبد يضربها أول النهار، ثم يجامعها آخره؟)

لە دیاردەکانی (نشوز) و یاخی بوونی ئافرەت:

یەکەم: نکۆڵی لەوە بکات بچێتە لای پیاوەکەی، ئەمەش هەڕەشەی توندی لەسەر هاتووە لە فەرمودەدا وەکو ئەوەی لە صحيح البخاري دا هاتووە: (إذا دعا الرجل إمراته فراشه فأبت أن تجيء لعنتها الملائكة حتى تصبح.

دووەم: بە قسەنەکردنی مێردەکەی، بۆ نموونە لە ماڵ دەرچوون بەبێ ڕازی بوونی یان سەردانی کردنی کەسێك کە مێردەکەی پێی ناخۆشە، یان هێنانی کەسێك بۆ ماڵی خۆی کە مێردەکەی پێی ناخۆشە، وەکو لەو فەرموودەدا هاتووە کە مسلم ریوایەتی کردووە: (إن لكم عليهن أن لا يوطئن فرشكم أحدا تكرهونه فإن فعلن فاضربوهن ضربا غير مبرح).

سێیەم: گوێڕایەڵی نەکردنی مێردەکەی لە چاکەدا وەکو ئەوەی ڕازی نەبێت خزمەتی بکات، یان کەمتەرخەمی لە پەروەردەی منداڵەکانیدا بکات، یان ڕازی نەبێت لەگەڵ مێردەکەی سەفەر بکات، یان ئەگەر مێردەکەی بڕیاری ماڵ گواستنەوەی دا بۆ جێگەیەك ئەو هاوڕێتی نەکات، دەربارەی ئایەتی: ﴿الرجال قوامون على النساء﴾ ابن عباس الله لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: پیاوان فەرمانڕەوان و پێویستە لە سەر هاوسەرەکانیان لە چاکەدا گوێڕایەڵییان بکەن و لە قسەیان دەرنەچن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا صلت المرأة خمسها، وصامت شهرها، وحفظت فرجها، وأطاعت زوجها، قيل لها: ادخلي الجنة من أي الأبواب شئت) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. واتە: ئەگەر ئافرەت پێنج فەرزە نوێژی خۆی کرد و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو و داوێنی خۆی پاراست و

گوێڕایەڵی مێردەکەی خۆی کرد، پێی دەوترێت: لە هەرکام لە دەرگاکانی بەهەشتەوە دەتەوێت بچۆ ژوورەوە.

چوارەم: ناشیرین مامەڵە کردن لە گەل مێردەکەی و زاڵبوون بەسەریدا بە قسەی ناشیرین و بێزارکرن وتووڕەکردنی و خراپەکردن بەرانبەر کەس و کاری مێردەکەی. ابن عباس و غەیری ئەویش وشەی الفاحشة یان لە ئایەتی ﴿لا تخرجوهن من بيوتهن ولا يخرجن إلا أن يأتين بفاحشة مبينة﴾ بەوە تەفسیر کردووە کە مەبەست لە قسەی ناشیرین و نابەجێی ئافرەتە بە کەس و کاری مێردەکەی.

پێنجەم: لە دیاردەو شێوازەکانی یاخی بوون و (نشوز) ی ئافرەت ئەوەیە لە ماڵ دەربچێت بەبێ مۆڵەتی پیاوەکەی، یان دەرگا لەسەر مێردەکەی دابخات وبۆی نەکاتەوە بۆ ئەوەی بچێتە ژوورەوە، هەروەها زانایان فەرموویانە ئافرەت بە (ناشز) دادەنرێت ئەگەر خۆی لە مێردەکەی قەدەغە بکات لە ڕووی ڕازی نەبوونەوە نەك لە ڕووی نازەوە، وەکو (الخطيب الشربيني) لە "مغنى المحتاج" (٣/ ٢٥٩ ط/ دار الفكر)دا فەرموویەتی: [وَالنُّشُوزُ هُوَ الْخُرُوجُ مِنْ الْمَنْزِلِ بِغَيْرِ إذْنِ الزَّوْجِ لا إلَى الْقَاضِي لِطَلَبِ الْحَقِّ مِنْهُ، وَلا إلَى اكْتِسَابِهَا النَّفَقَةَ إذَا أَعْسَرَ بِهَا الزَّوْجُ، وَلا إلَى اسْتِفْتَاءٍ إذَا لَمْ يَكُنْ زَوْجُهَا فَقِيهًا وَلَمْ يَسْتَفْتِ لَهَا، وَكَمَنْعِهَا الزَّوْجَ مِنْ الاسْتِمْتَاعِ وَلَوْ غَيْرَ الْجِمَاعِ لا مَنْعِهَا لَهُ مِنْهُ تَدَلُّلا، وَلا الشَّتْمُ لَهُ، وَلا

الإِيذَاءُ لَهُ بِاللِّسَانِ أَوْ غَيْرِهِ بَلْ تَأْثَمُ بِهِ، وَتَسْتَحِقُّ التَّأْدِيبَ عَلَيْهِ، وَيَتَوَلَّى تَأْدِيبَهَا بِنَفْسِهِ عَلَى ذَلِكَ].

ئەم حاڵەتانە بە (نشوز) دانانرێت

١- ئەگەر ئافرەت لە کاری ناشەرعیدا گوێڕایەڵی مێردەکەی نەکرد، بۆ نموونە پێی وت سەرپۆش فڕێبدە، یان عارەق بخۆ، یان داوای لێکرد هاوڕێتی بکات بۆ جێگایەك کە ناشەرعی و تێکەڵ بوونی تێدا ئەنجام ئەدرێت، لەو حاڵەتانەدا نەك بە گوێنەکردنی بۆ قسەی مێردەکەی ئاساییەو یاخیبوون و(نشوز) نییە، بەڵکو درووست نییە و گوناهباریش ئەبێت ئەگەر بە قسەی بکات، چونکە (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) و (إنما الطاعة في المعروف) . بە گوێکردنی فەرمانی پیاو تەنها لە کاری شەرعیدایە نەك لە هەموو حاڵەتێکدا.

٢- داوای شتیکی لێ بکات زیانی تێدا بێت لەسەری، چی لەسەر دینی یان لەسەر کەسی خۆی.

٣- ئەگەر ئافرەتەکە ویستی سەفەرێکی فەرز بکات وەکو فەریزەی حەج و مێردەکە ڕێگری لێ کرد بەبێ پاساوێکی شەرعی، ڕای پەسەند ئەوەیە ئەو ئافرەتە بەو گوێڕایەڵی نەکردنەی بۆ مێردەکەی نابێتە (ناشز).

٤- ئەگەر گوێڕایەڵی مێردەکەی نەکات لە بانگهێشت کردنی بۆ کاری شەرعی بە هۆی نەگونجانی کات و شوێن و تەندروستی و هەر هۆکارێکی تری پەسەند و راستەقینە گوێڕایەڵی نەکردنەکەی بە یاخیبوون و (نشوز) دانانرێت.

٥- ئەگەر ئافرەت پەیوەندی لەگەڵ کەس و کاری مێردەکەی بڕییەوەو هاتوچۆی نەکردن بە هۆی خراپی ئەوان لەڕووی پابەند نەبوونیان بە ڕەوشت و بیروباوەری ئیسلامییەوە لەو حاڵەتە نابێتە یاخی و (ناشز).

٦- گوێڕایەڵی مێردەکەی نەکات کە داوای کارێکی لێ بکات لە توانای خۆی قورسترەکو ئافرەت، یان بۆ سروشتی ئافرەت گونجاو نەبێت، چونکە: ﴿لا يكلف الله نفسا إلا ما آتاها﴾.

٧- ئەگەر ئافرەت مێردەکەی ژنی بەسەردا بهێنیت و بیەوێت بە زۆر لەیەك ماڵدا نیشتەجێیان بکات و ئافرەتەکە بەوە ڕازی نەبێت، نابێتە (ناشز) و مافی خۆیەتی داوای سوکنای سەربەخۆ بکات، مەگەر خۆی بەوە ڕازی بێت کە لە یەك ماڵدا پێکەوە بژین.

بە کورتی هەر کردارێك یان واز لێهێنانێك کە ببێتە مایەی زیانێکی دینی یان دونیایی لەسەر ئافرەتەکە و بە قسەی پیاوەکەی نەکات ئەوە یاخی بوون نییە و ئەو ئافرەتە پێی ناوترێت (ناشز) و کارەکەی حوکمی (نشوز) ی لەسەر جێبەجێ نابێت.

# پەیامی سی: حوكمی تەڵاقدانی ژنی دووەم بەبێ هۆكار

١- ژیانی هاوسەرگیری گرێبەستیكی پیرۆزە و وابەستەبوونی تێدایە، پێویستە هەر لەسەرەتاوە لە سەر بنەمای ڕاستگۆیی و لە خواترسان ونیازپاكی دابمەزرێت، نەك لە سەر بنەمای حەزێكی كاتی و جۆرێك لە بەرژەوەندی ناڕوون و نابەردەوام، الله تعالی فەرموویەتی: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ).

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (استوصوا بالنساء خيرا)[١] واتە پێغەمبەر ﷺ داوای لێكردووین كە چاكەیان لەگەڵ بكەین و ستەمیان لێ نەكەین و مافەكانیشیان بدەین، هەروەها ئارامیش لەسەر خراپییەكانیان بگرین چونكە لە كۆتایی فەرموودەكەدا هاتووە: (فإنهن خلقن من ضلع وإن أعوج شيء في الضلع أعلاه فاستوصوا بالنساء خيراً).

پەروەردگاریش كە خۆی مرۆڤەكانی درووست كردووە و تواناو پێویستیكانیان دەزانێت و لە هەموو كەس باشتر دەیانناسێت، چی باشە بۆیان و كەم وكورتییەكانی ژیانیان بۆ پڕ دەكاتەوە، هەرچیش لە شەرعدا واتە لە كیتاب و سەحیحی سونەتدا هاتووە - كە فرەژنیش یەكێكە لەو تەشریعاتە - هەمووی لە بەرژەوەندی مرۆڤەكانە و بەپێی عەقدی موسوڵمانێتی نابێت موسوڵمان ڕەخنەی

[١] - رواه الشيخان،

لێ بگرێت و لەڕوویدا بوەستێت، بۆیە بە مەرجەکانی خۆی پیاو بە ڕێگەپێدانی ڕوون و ئاشکرای کیتاب و سوننەت بۆی هەیە تا چوار هاوسەرگیری بکات وپێویستە ئەو هاوسەرەش کە ژنی بەسەردا دێت ئەوە قبوڵ بکات و زەواجی دوای زەواجی یەکەم بە کارەسات نەزانێت و کەسیش وەکو کەتن و تاوانێك تەماشای نەکات بە شێوەیەك پیاوەکان ناچار بن بە نهێنی ئەو کارە بکەن، بەڵکو ئەگەر مەرجە شەرعی و دونیاییەکان جێبەجێ بوون و پیاو ئەهلیەتی ئەوەی بوو ژنی دووەم بهێنێت ئیتر ئەو مەسەلە بە ئاسایی وەربگیردرێت.

٢- لە بەرانبەریشدا پێویستە لەسەر ئەو پیاوەی هاوسەرگیری دووەم دەکات، حیسابی هەموو شتێکی کردبێت وبڕیارێکی پەلەی نەدابێت بێ بیرکردنەوەی تەواو و وەرگرتنی ڕێوشوێنی مادی و مەعنەوی پێویست و پێش هەموو شتێکیش تەقواو دادگەری لە خۆیدا درووست بکات و ترسی پەروەردگاری لە نێوان چاوەکانی خۆیدا دانابێت و لەوە دڵنیابێت ئەم ئافرەتەی کە دەیکاتە هاوسەری دووەمی خۆی مرۆڤە و پێویستە هەموو مافێکی شەرعی و دونیایی بۆ دابین بکرێت، نەك وەکو ئامرازێك بۆ تاقیکردنەوەی پرۆسەی هاوسەرگیری دووەم بەکاری بهێنێت و تەنها بیری لای لایەنی حەزو ئارەزووی خۆی بێت و لەیەکەم کێشە کە تووشی ئەبێت پەنا بۆ تەڵاق و جیابوونەوە بدات، وەکو ئەوەی بێزار بووبێت لە پرۆسەکە، یان بڵێ تەواو تێگەیشتم ژیانی هاوسەرگیری دووەم چۆنە و کۆتایی پێ ئەهێنم.

٣- هەروەها پێویستە ئەو ئافرەتانەش کە خوازبێنیێ دەکرێن وەکو هاوسەری دووەم وزیاتر، پەلە نەکەن لەڕازی بوون و دیراسەی مەسەلەکە بەوردی بکەن و پرسیاری پێویست دەربارەی کەسایەتی و دینداری و ئاستی هەست کردن بە بەرپرسیارێتی ئەو پیاوەی خوازبێنیان دەکات بکەن، چونکە لەڕاستیدا ڕاستگۆیی و جیددییەتی پیاو دەردەکەوێت و کەسایەتییەکەی هەر زوو ئاشکرا دەبێت بۆ ئەو ئافرەتەی مەبەستی بێت حەقیقەتی بۆ دەربکەوێت، بۆیە ئەگەر دواتر پیاوەکە لە ئاستی بەرپرسیارێتی نەبوو، ژنی دووەمیش بەشێك لە دەرەنجامی سەرنەگرتنی پرۆسەکە هەڵدەگرێت، کە پەلەی کردووەو لێکۆڵینەوەی پێویستی بۆ پرۆسەکە نەکردووە.

٤- پێشم ناخۆشە ئەم قسە دەکەم، بەڵام واقیعێکی تاڵە ودەبێت بوترێت، لەم چەن ماوەی دواییدا، بە بەهانەی شەرعی بوونی زەواجی مسیارو ودەیان وڕەنگە سەدان مەلا وبەناو بانگخواز کە پسپۆڕیان بووەتە ڕێکخستنی ئەو جۆرە زەواجە وبوونەتە جێگای خوازیارانی ئەو جۆرە زەواجە!، بە هۆی ئەوانەوە ئەمڕۆ جۆرێک لە نابەرپرسیارێتی بەرفراوان لەو بوارەدا درووست بووەو ، تەنانەت پیاوانی بەناو ئیسلامی مولتەزیمیش لە ڕێگەی دەلاڵەکانی زەواجی میسیارەوە بە کەمترین پارەو، بەڵکو هەندێک جار بەپەنابردن بۆ حیلەی شەرعی وفڕوفێڵی مەزهەبەکان و بۆ کەمترین ماوە لە پرۆسەیەکی نزیک لە زەواجی موتعەی لای شیعەکان ئەو زەواجە ئەنجام ئەدەن، لەگەڵ ئافرەتی بێوەژندا زەواج دەکەن و

دوای ماوەیەک تەڵاقیان دەدەن وزەواجێکی تر دەکەن، واش دەردەکەوێت هەندێک لەوانە لەسەرەتاوە بەنیازی تەڵاق ۆان ئەو زەواجە ئەنجام ئەدەن چونکە ڕێکخەرانی ئەو زەواجە ئەوەشیان بۆ حەڵاڵ کردوون! مەلای وا هەیە کە سەرقاڵی ئەو بابەتەیەو کردییەتی بە پیشە بۆ خۆی، دەیان زەواجی لەو شێوەی بۆ خۆی ڕێکخستووە، بەداخەوە بازاڕی ئەو جۆرە زەواجە ئێستا لە سلێمانی ولە شارەکانی تری کوردستاندا بازاڕێکی گەرمەو وەکو لە کەسی متمانە پێکراوو ڕاستگۆ زانیومە بازاڕێکە جمەی دێت وهەندێ جار دەڵێن بە پەنجا هەزارێکی مانگانە ڕەنگە ئەو زەواجە دەست بکەوێت، زۆر جاریش تەنها ژن وپیاوەکەو مەلاکەو دوو شایەت حازری مارەبڕینەکە دەبن و، دوو شایەتەکەش نەناسراون، وەکو بڵێی ئیشیان شایەتیدانەو مەرجیان ئەوەیە دوای ئەنجامدانی کارەکەیان ئیتر لێی دەربچن وکەس بانگیان نەکاتەوە، کە ئەوەش جۆرێکە لە سووککردنی ئەو پرۆسە پیرۆزەو و حاڵ وا بڕوات دەبێتە جۆرێک لە موتعەو لەفرۆشی دەمامکدار، کە وا دەزانم ئێستا هەنگاوە یەکەمەکانی ئەو سووککردن و سیغە دەمامکدارە لێرە لە سلێمانی و لە ڕانیە و هەولێر و شوێنەکانی تریش سەری هەڵداوەو درووست بووە.

لێرەشدا بەباسکردنی ئەم حەقیقەتە ناخۆشە، مەبەستم ئاگادار کردنەوەی خوشکانی بەڕێزە بەتایبەتی لە بێوەژنان کە بەو مەلاو بانگخوازانە نەخەڵەتێن، چونکە ئەو جۆرە زەواجە زۆرێکی تەنها تێرکردنی شەهوەتەو هەستکردنی

بەرپرسیارێتی و قودسیەتی خێزان تێیدا بوونی نییە، بۆیە دەبێت کچان وئافرەتان وریای خۆیان بن و نەکەونە داوی ئەو دەڵاڵ و بازرگانانەوە کە بەناوی دینەوە فریویان دەدەن.

٥- لە بنچینەدا تەڵاق لە ئیسلامدا کارێکی ڕێگە پێدراو و جائیزە، دەکرێت لە کاتی پێویستدا پیاو پەنای بۆ ببات ومافی خۆیەتی: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ واتە جائیزە پیاو لە هاوسەرەکەی جیابێتەوە ئەگەر نەیانتوانی پێکەوە ژیانێکی خۆش وئارام و ئاسوودە بەسەر ببەن.

لە ڕاستیدا - ئەگەرچی ئەسڵ لە زەواجدا بەردەوامییە - بەڵام مەرج نییە زەواج گرێبەستێکی هەتا هەتایی بێت ومێرد لە هەموو حاڵەتێکدا هەر ناچار بێت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بمێنێتەوە، هەروەکو چۆن خودی پرۆسەی هاوسەرگیریش کارێکی موباح و ڕەوایە و پیاو بە ئارەزووی خۆیەتی ئەنجامی بدات یان نەیدات، جگە لە هەندێ حاڵەتی تایبەت نەبێت.

بەڵام تەڵاقدان بێ ئەوەی هۆکارێکی ڕوونی هەبێ و ئەگەر ببێتە مایەی زیان گەیشتن بەو ئافرەتە، ئەوە کارێکی حەرامە و پیاوەکەی پێ گوناهبار دەبێ لەبەر ئەوەی لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا نەبووە و لە ئەنجامدا بەبێ هۆکار زیانی بە ژیان و دەروونی مرۆڤێکی موسوڵمان گەیاندووە کە هاوسەرە تەڵاقدراوە کەیەتی.

٦- هەر لەم بارەشەوە باشترە بزانرێت کە زانایان تەڵاقیان وەکو هەر مەسەلەیەکی شەرعی تر خستووەتە ژێر پێنج حوکمە ئوسوڵییەکانی ئیسلامەوە، واتە: تەڵاقدانی پیاو بۆ ژنەکەی یان یەکێك لە ژنەکانی و بەپێی هۆکاری جیابوونەوەکە، بەدەر نییە لەوەی یەکێك لەم حوکمە شەرعییانە بیگرێتەوە: (حرام و مکروە و مباح و مستحب و واجب) ئەمەش ڕوونکردنەوەیەکی خێرایە بۆ ئەم حوکمانە:

یەکەم: دەگونجێت جیابوونەوەی پیاو لە هاوسەرەکەی کارێکی حەرام بێت و پێی تاوانبار بێت، ئەگەر ئەو جیابوونەوە بەبێ هیچ خراپەو کەمتەرخەمیەك بێت لەلایەن ژنەکە و هاوکات تەڵاقدانەکەش زیانی پێ بگەیەنێت.

دووەم: لەوانەیە تەڵاقدانەکە کارێکی ناپەسند و مکروە بێت، واتە نەکردنی باشتر بێت، ئەگەر بەبێ هۆکارێکی ڕوون بێت، بۆ نموونە تەنها لەبەر ئەوە بێت کە پێی مورتاح نییە و حەزی لێ ناکات، باشترە لەو حاڵتەدا پیاو ئارام بگرێت و ژنەکەی تەڵاق نەدات.

سێیەم: ئەگەر پیاو هەستی کرد ناتوانێت بە مافەکانی ئەو ژنە هەڵسێت، یان ناتوانێت ڕێز و مامەلەی جوانی لەگەڵدا بکات،لەو حاڵەتە تەڵاقدانەکەی کارێکی موباحە واتە ئەتوانێت بیکات و مانعێکی شەرعی نییە بۆ ئەنجامدانی.

چوارەم: دەکرێت جیابوونەکە کارێکی باش و مستحب بێت ئەگەر ژنەکە تەبیعەت و ڕەفتاری خراپ بوو وقابیلی چاك بوونەوە نەبوو و زیانی بە مێردەکەی

دەگەیاند، بۆ نموونە زمان درێژی بەسەردا دەکرد، یان هەر ناڕەحەتی و بێزارییەکی تری لەگەڵ میردەکەی دەکرد، بە شێوەیەك کە ژیانی ناخۆش کردبێت.
پێنجەم: لە هەندێ حاڵەتیشدا تەڵاقدانی ژن حوکمی واجب وەردەگرێت و پێویستە لێی جیابێتەوە، بۆ نموونە: ڕەوشتی ناشیرین بێت، یان ناوبانگ و سومعەی خراپ بێت، یان ئازاری باوك و دایکی میردەکەی بدات و خراپەی تری هاوشێوە ئەنجام بدات، لەو حاڵەتەدا تەلاقدانی پێویستە.

٧- بۆیە ئەو پیاوەی کە ژنی دووەمی بە نهێنی دەهێنێت ئەگەر پەشیمان بوونەوەکەی هۆکاری شەرعی و مەعقولی نەبێت و تەنها لە ترسی ژنی یەکەمیدا بەنیازی تەڵاقدانی ژنی دووەم بێت، یان لەبەر ئەوەی لە بچنینەدا لەو کارەیدا جیددی نەبووبێت و هەستی بەرپرسیارێتی ئایینی و کۆمەڵایەتی تێدا نەبووبێت، وەکو نەزوەیەکی کاتی کردبێتی و یان تەنها ویستبێتی وەکو تاقیکردنەوەیەکی پرۆسەی ژنی دووەم ئەو کارە بکات و ئێستا بەبێ هیچ هۆکارێك یان هەڵە و خراپەیەك لە ژنی دووەمەوە تەڵاقی بدات، بێگومان کە گوناهبار دەبێت وکارێکی ناپەسەند دەکات ئەگەر تەڵاقی بدات، ئەگەرچی جیابوونەوەکەشی درووستە و تەڵاقەکە دەکەوێت.

٨ - بەڵام ئەگەر هەر هۆکارێکی تری هەبێت، ئەوە بەپێی ئەو هۆکارە حوکم لەسەر کارەکەی دەدرێت و یەکێك لە پێنج حوکمەکە وەردەگرێت، بۆی هەیە کارێکی پەسەند وباش نەبێت وەکو وتم، یان بە پێچەوانەوە ئەگەر دەرکەوت جیابوونەوەکەی هۆکاری تری لە پشتەوە بووە، لەو حاڵەتەدا جیابوونەکەی لەو ئافرەتە مافێکی شەرعی و ئاسایی خۆیەتی.

ئەگەریش تەڵاقدانەکە بە هۆی داواکاری ژنی یەکەمەوە بێت و دیسان بەبێ هۆکارێکی شەرعی و تەنها لەبەر ئەوەی بێت کە هەوێیەتی و حەزی لێ ناکات و حەز دەکات بەتەنها خۆی لەگەڵ پیاوەکەی بێت ئەوە تاوانە و ستەمە و لەسەری گوناهبار دەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تَسْأَلُ طَلاَقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا ، فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا)[١] واتە: ڕەوا نییە بۆ ئافرەتیك داوا لە مێردەکەی بکات ژنەکەی تری تەڵاق بدات بۆ ئەوەی تەنها ببێتەوە لەگەل مێردەکەی، ئەگەر تەڵاقیشی بدات لەوەی کە الله تعالى بەشی داوە زیاد ناکات.

بەڵام ئەگەر ژنی یەکەم لەبەر هۆکارێکی شەرعی و لەبەر خراپی ژنی دووەم داوا لە مێردەکەی بکات لێی جیابێتەوە، ئەوە ئامۆژگارییەکی باشە و نەك گوناهبار نابێت بەڵکو خێریشی دەگات. والله أعلم.

---

[١] - رواه البخاري( ٤٨٥٧).

# پەیامی سی و یەك:
# ڕێکەوتننامەی (سیداو) پرۆسەیەکی نێودەوڵەتی بۆ فەساد

ناوی ڕێکەوتننامەکە بە زمانی ئینگلیزی بریتییە لە Convention on Elimination of All Forms of Discrimination Against Women

واتە: ڕێکەوتننامەی نەهێشتنی هەموو جۆرە جیاوازییەك لە دژی ئافرەتان.

لە ساڵی ١٩٧٩ لە لایەن نەتەوە یەکگرتوەکانەوە ئیمزای لەسەر کرا پاش ئەوەی سەدوهەشتا و نۆ دەولەت ئیمزایان لەسەر جێبەجێکردنی کرد کە لە نێوانیاندا پەنجا دەوڵەت بە شێوەیەکی مەرجدار و بە (تحفظ) لەسەری ڕازی بوون.

بنەماو بنچینەی ڕێکەوتننامەی (سیداو) لەسەر یەکسانی ڕەها و هاوشێوەیی وهاوتا بوونی تەواو لە نێوان ژنان و پیاواندا دامەزراوە لە بوارەکانی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری و لە هەموو بوارە جیاجیاکانی تردا.

لە ڕاستیدا بیرۆکەی یەکسانی کردن لە نێوان هەموو خەڵکیدا بە ژنان و پیاوانەوە، ئەو بنەمایە بوو کە زۆربەی پەیمان وڕێکەوتننامە جیهانییەکانی لەسەر درووست بوو، بۆ نموونە سەرانی شۆرشی فەرەنسی ئەو دروشمەیان بەرز کردبوویەوە بەو ئیعتیبارەی کە پیاوان و ئافرەتان لە هەموو بوارەکانی ژیانداهیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە، هەر بۆیە یەکەمین مادەی ڕێکەوتننامەی سیداو بریتی بوو لەوەی کە نابێت هیچ جیاوازییەك بکرێت لە نێوان ژنان و پیاواندا و پێویستە بە مەبەستی

ڕێگەگرتن لە هەر جیاوازییەك لە بوارەکانی ژیاندا لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزە بەرەنگاری هەر هەوڵێك بۆ کز کردنی ئەو ئاراستە ئەنجام بدرێت.

لە ڕاستیشدا یەکسانی لە نێوان ژنان و پیاوان لە ئیسلامدا مەسەلەیەکی بڕاوەیە و جیاوازییان لە نێواندا نەکراوە وەکو ماف و لایەنی مرۆیی، مەگەر لە کاتێکدا نەبێت کە یەکسانی لە گەڵ دادگەریدا تێکگیرابێت، ئەو کات وەکو پاراستنی مافی ئافرتان لە یەکسانییەوە دەگویزرێتەوە بۆ دادگەری، چونکە لە هەندێك حاڵەتدا یەکسانی کردن لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزەدا دەبێتە جۆرێك لە نادادگەری کە خودی ئافرەتەکە، یان بەرانبەرەکەی تێیدا زیانمەند دەبێت.

گومانی تێدا نییە کە ڕێکەوتننامەی (سیداو) لە گەڵ شەریعەتی ئیسلامدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پێچەوانەیە و تێکدەگیرێت، ئەوەندەش بەسە کە ڕێکەوتننامەکە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچووە و جاڕی بۆ دراوە کە نەتەوە یەکگرتووەکان هیچ جۆرە ڕێزێك نە لە ئیسلام و نە لە هیچ ئاکار و ڕەوشتێکی کۆمەڵگاکان ناگرێت وبگرە مەبەستێتی یاساو تەشریعاتی کاریگەر دەربکات بۆ لاوازکردن و نەهیشتنی پێگەی شەریعەت لەسەر زەمینەی واقیعدا.

هەروەها دژایەتی کردنی ڕەوشت و هەڵوەشاندنەوەی خێزان و بڵاو کردنەوەی بێ ڕەوشتی یەکێکە لە ئامانجە گەورەکانی ئەو دەزگایە، ئەمەش دیارترین ئەو خاڵانەیە کە لە دوو توێی ڕێکەوتننامەکەدا هاتووە وپێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە:

١- لە ماددەی دووەمی ئەو ڕێککەوتنامەیەدا هاتووە ، کە پێویستە لەسەر هەموو ئەو دەوڵەتانەی ئیمزایان لەسەری کردووە هەموو جۆرە ڕێنمایی و ئاراستەو حوکمێك لە یاساکانیان پووچەڵ بکەنەوە کە جیاوازی دەخاتە نێوان ژنان و پیاوان بەوانەشەوە کە لەسەر بنەمایەکی ئایینی درووست بوونە وەکو میراتی بۆ نموونە، ئەم ماددەیەش بە ڕوونی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا ناکۆکە و پێچەوانەیە، چونکە کە ئیسلامدا جیاوازی لە نێوان پیاوان و ژناندا کراوە و لە ڕووی فیترەتیشەوە ئەو دوو ڕەگەزە جیاوازی زۆریان لە پێکهاتەو تواناو باری دەروونی و توانای جەستەیی لە نێواندا هەیە، وەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنْثَى﴾[1] ئینجا کارکردنیش بەو ماددەیە لە ڕێکەوتننامەکە وەکو هەڵوەشاندنەوەیە بۆ ئەو ئایەتانەی باسی حوکم کردن بە قورئان و سوننەت دەکەن، وەکو: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً﴾[2].

---

(١) - آل عمران:٣٦.
(٢) - النساء:٦٥.

٢- لە ماددەی شانزەدا بە هەمان شێوە کۆمەڵێك جیاوازی و تێکگیرانی تێدایە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا وەکو:

* لابردنی هەموو جۆرە سەرپەرشتی و ویلایەت و خاوەندارێتییەك لەسەر کچان و ئافرەتان لەلایەن باوك و براو مێرد و هەر سەرپەشتیارێکی تر، بۆ ئەوەی یەکسانی تەواو لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا درووست بێت، بۆ نموونە کچ ئازاد بێت هاوسەرگیری یان پەیوەندی لەگەڵ هەر کوڕێکدا بگرێت با بێ دینیش بێت، ئەمەش لەگەڵ شەریعەتدا پێچەوانەوەیە، بۆ نموونە لەگەڵ ئەو فەرموودەی پێغەمبەر دا ﷺ: کە دەفەرموێت (أيما امرأة نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل فنكاحها باطل فنكاحها باطل)[1] واتە: هەر ئافرەتێك بەبێ ڕازیبوونی خاوەنەکەی شوو بکات شووکردنەکەی بەتاڵە.

- لەبڕگەیەکی تری ماددەی شانزەدا هاتووە، کە کچ دەتوانێت ناوی دایکی هەڵبگرێت وەکو چۆن دەتوانێت ناوی باوکی هەڵبگرێت، ئەمەش لەگەڵ بنەمایەکی سەرەکی قورئاندا تێکدەگیرێت کە فەرموودەی الله یە عزوجل: (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ) واتە کەسەکان بە ناوی باوکیانەوە بانگ بکەن و بیاندەنە پاڵی ئەوان نەك دایکیان، چونکە ئەوە مایەی درووستبوونی دادگەرییە.

---

[1] - صحيح ابي داود / ٢٠٨٣.

* له بڕگەیەكی تری ئەو ماددەیەدا بەڕاشكاوی هاتووە، كە فرەژنی پێویستە قەدەغە بكرێت، واتە لە ڕووی یەكسانییەوە چۆن ئافرەت بۆی نییە زیاتر لە میردێكی هەبێت، بە هەمان شێوە پیاویش بۆی نییە زیاتر لە هاوسەرێكی هەبێت! ئەمەش لە كاتێكدایە كە الله تعالى بە ڕاشكاوی لە قورئاندا ڕێگەی بە فرەژنی داوەو فەرموویەتی: ﴿فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ﴾[1] تەنانەت لە ئایەتەكدا الله باسی یەك هاوسەری نەكردووە، بەڵكو لە دوو هاوسەرەوە تا چواری باس كردووە كە ئەوەش ئاماژەیەكی ڕوونە - وەكو زانایان فەرموویانە - ئەگەر لە توانای پیاودا هەبێت ومەرجەكانی تێدا هەبێت، زیاتر لە هاوسەرێكی هەبێت بۆ دین و بۆ دونیا و بۆ ئوممەتی ئیسلامیش باشترە.

كاتێكیش هەندێ دەوڵەتی ئیسلامی ڕەخنەیان لەو بەندە گرت لیژنەی سیداو بە توندی قەدەغەكردنی فرەژنیان دوو پات كردەوە و وتیان فرەژنی دەرەنجامی زۆر ترسناكی هەیە لەسەر ئافرەت و لەسەر كۆمەڵگا ، لە جیاتی فرەژنیش بە حەڵاڵی ئەوان ڕێگەیان داوە بە پەیوەندی ناشەرعی لە نێوان ژنان و پیاواندا و هەموو ئاسانكارییەك لەو بارەوە دەكەن، تەنانەت بۆ ئەو منداڵە ناشەرعییەش كە لە ئەنجامی پەیوەندی ناشەرعی ژنان و پیاواندا درووست دەبێت، گرنگ ئەوەیە هاوسەرگیری دووەم نەكرێت و ئەو شەریعەتەی ئیسلام لەو بوارەدا ڕەتبكرێتەوە.

---

(1) - النساء:٣.

٣- هەروەها لەڕووی یەکسانی ڕەها لە نێوان ژنان و پیاواندا چۆن پیاو پاش جیابوونەوە لە هاوسەرەکەی یان مردنی، بۆی هەیە بێ چاوەڕوان کردن هاوسەرگیری بکات، بەو شێوەش پێویستە ژنان ئەو مافەیان هەبێت ، پاش مردنی هاوسەرەکانیان، یان جیابوونەوەیان لەیەکتر، ئافرەت بتوانێت لەگەڵ هەرکەسێك ڕاستەوخۆ شوو بکات بە بێ چاوەڕوانی، ئەمەش بانگەشەیەکی ئاشکرایە بۆ نەهێشتنی تەشریعی (عیددە) کە بەڕوون و ئاشکرا بەشێکە لە شەریعەتی ئیسلام.

٤- بە پێی ڕێکەوتننامەکە، پیاو بە هیچ شێوەیەك لە خێزاندا مافی سەرپەرشتی بەسەر خێزانەکەیەوە نییە، بەوەش ئایەتی ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾[١] هەڵدەوەشێتەوە و پیاو هیچ مافێکی سەرپەرشتی و چاودێری بەسەر خێزانەکەی نامێنیت.

٥- بەرز کردنەوەی تەمەنی ڕێگە پێدراو بۆ شوو کردنی کچان بۆ هەژدە ساڵ، وەکو ڕێخۆشکردنێك بۆ ئەوەی دواتر بیگەیەنن بە بیست و یەك ساڵ، ئەمەش پێچەوانەی چەندین دەقە لە شەریعەتی ئیسلامدا بۆ نموونە: (يَا مَعْشَرَ الشَّبَاب ، مَنْ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ؛ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)[٢]. دوای جاریش ڕێگەیەکی ناڕاستوخۆیە بۆ بڵاوبوونەوەی فەساد لناو کۆمەڵگادا.

---

[١] - النساء:٣٤.

[٢] - رواه البخاري ومسلم واللفظ للبخاري

٦- بە پێی ڕێکەوتننامەکە، ئافرەت مافی خۆیەتی و ئازادە منداڵی ببێت یان نەبێت، هەروەها مافی خۆیەتی ئەگەر بیەوێت کۆرپەڵەکەی لەبار ببات، ئەمەش بە ڕاشکاوی لەگەڵ فەرموودەی الله جل جلاله پێچەوانەیە کە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾[1]

٧- ڕێکەوتننامەکە مافی مێردی سنووردار کردووە سەبارەت بە مافی سەرجێیی و چوونە لای هاوسەرەکەی و ئەگەر بەڕەزامەندی ژنەکە نەبێت بە دەستدرێژی هاوسەرگیری (اغتصاب زوجي ) دادەنرێت و سزایشی بۆ دیاریکراوە لە نێوان سزادان بە پارەو زیندانی کردندا، لە کاتێکدا الله لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾[2]. هەروەها رسول الله ﷺ وەکو لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە فەرموویەتی: (إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ ).

سەبارەت بەو پرسیارەش کە ڕەنگە لای کەسانێك درووست بێت ئایا ڕێکەوتننامەی سیداو خاڵی باش و مادەی بە سوودی لە خۆ گرتووە بۆ ئافرەتان؟ یان هەمووی ماددەکانی هەر لەو جۆرە زیان بەخشن بۆی؟ لە وەڵامدا دەڵێین:

(١) - الاسراء:٣١.
(٢) - البقرة:٢٢٣

بەڵێ دەربارەی مافی دایکایەتی و جەخت کردنەوەی لەسەر پارێزگاری کردن لەسەر مافی ئافرەت لە کاتی دوو گیانیدا و هەروەها دەستەبەرکردنی چاودێری تەندرووستی بۆ ژنان بێ جیاوازی لەگەڵ پیاواندا و ڕەخساندنی هەلی کار و سوودی ئابووری بەدەست هێنانی قەرز و خاڵی ئیجابی تری بۆ ئافرەتان تێدا هاتووە، قسەکەش لەسەر ئەو خاڵە باشانە نییە کە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا دەگونجێ و کۆکن، بەڵکو دەربارەی ئەوەیە کە زۆربەی بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە لەگەڵ عەقیدەو شەریعەتی ئیسلامدا تێکەگیرێت و لە ڕاستیدا سیداو هەوڵێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی بەشێکی هەستیار و ترسناك لە ئیسلام کە بەدیلەکەی بڵاوبوونەوەی فەساد و بێ ڕەوشتییەو شیرازەی کۆمەڵگاو خێزان تیکدەدات.

بە کورتی: ڕێکەوتننامەی (سیداو) کە ئێستا لە کوردستانیشدا لە ڕێگەی ڕێکخراوکانی بەناو مافی ئافرەتان و کۆمەڵگای مەدەنییەوە کاری بۆ دەکرێت و بە شێوەیەکی فەرمیش پشتیوانییان لێ دەکرێت، لە زۆربەی بڕگەکانیدا نەك تەنها لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا، بەڵکو لەگەڵ فیترەت و سروشتی ئافرەتیشدا زۆر ناکۆکە و تەنانەت ناوی ڕێکەوتننامەکە هەڵەیە وزۆر نالۆژیکییە بوترێت نابێت هیچ جیاوازییەك لە نێوان ژنان و پیاواندا هەبێت! ئەگەر بێت و ناوەکەشی بریتی بوایە لە بەرەنگاربوونەوەی هەموو جۆرە ستەمێك کە لە دژی ئافرەتان ئەنجام دەدرێت ڕاستتر دەبوو. پوختەی ڕەخنەکانیش کە ئاراستەی (سیداو) کراوە بریتین لە:

- بونیاتنانی ئەو ڕێکەوتننامەیە لەسەر یەکسانی ڕەها و هاوشێوەیی تەواو لە نێوان ژنان و پیاواندا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە تەشریع و سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئابوری و وەرزشی و ئازادییە گشتییەکان و یاساکانی خێزان و پێدانی ڕەگەزنامە و ئەهلیەتی یاسایی.

- ڕێکەوتننامەکە پڕە لە دژایەتی لە نێوان ژنان و پیاواندا و دیمەنەکە وا دەردەخات کە پەیوەندی ژن و پیاو پەیوەندییەکی ڕکابەری و دوژمنایەتیە و ئەوان هاتوون سنوورێك بۆ ئەو ستەمەی لە دژی ئافرەتان دەکرێت دابنەن ، لە کاتێکدا خۆی وا نییە.

- ڕێکەوتننامەکە تەماشای ئافرەت وەکو تاکێکی سەربەخۆ دەکات نەك ئەندامێك لە نێو خێزانێکدا.

- ڕێکەوتننامەکە مەبەستێتی هەموو جۆرە جیاوازییەك لە نێوان ئافرەتان و پیاواندا هەڵبگرێت با ئەو جیاوازییانەش بە پێی سرووشت و فیترەتیش بێت.

- ڕێکەوتننامەکە نوقسانە، چونکە جەخت لەسەر مافەکانی ئافرەت دەکاتەوە و ئەرکەکانی پشت گوێ خستووە و باسیان ناکات.

- ڕێکەوتننامەکە کار بۆ داگیرکارییەکی ناوخۆیی  نوێ دەکات و هەوڵێکە بۆ درووست کردنی دەوڵەتێك لە ناو دەوڵەتێکدا و بە پێی برگەی حەقدەش مافی بە لیژنەی چاودێری داوە چۆن بیەوێت ئاوها لێکدانەوەی ڕێکەوتننامەکە بکات و ڕاپۆرت بەرز بکاتەوە.

ئەو تێکگیرانەش لەم نووسینە کورتەدا دەربارەی (سیداو )باسمان کرد، بریتی نەبوو لە هەموو ئەو خاڵانەی کە پێچەوانەی ئیسلامە و لەو ڕێکەوتننامەدا جەخت لەسەر جێبەجێکردنی کراوەتەوە، بەڵکو هەندێ ئاماژەو نموونەی خێرا بوو بۆ ئەوەی وەکو بەڵگە لەم بارەوە بخرێتە ڕوو.

ئەوەش کە جێگەی داخە زۆرێك لەوانەی پشتگیری لێ دەکەن یان وەکو هەڕەشەیەك لەسەر ئایینی خەڵکی و ئاکاریان تەماشای ناکەن، کەسانێکن لە ڕاستیدا نازانن ناوەڕۆك و ڕەهەندەکانی ڕێکەوتننامەی (سیداو) تا چەند کاریگەری لەسەر دینی موسوڵمانان هەیە و چەند ڕۆڵ دەبینێت لە دوور خستنەوەی موسوڵمانان لە دینەکەیان، بە دیاری کراویش ئەو ڕێکخراوو لایەنانەی کە پشتگیری ڕەهای لێ دەکەن هۆکاری دەرك نەکردنیانە بەو شوێنەوارانەی ئەو ڕێکەوتننامە لەسەر کۆمەڵگای موسوڵمانان بەڵکو کۆمەڵگا بە گشتی بەجیی دەهێڵێت، ئەوەندەش بەسە کە بزانرێت سەرەڕای ئیمزا کردنی زیاتر لە ١٨٠ دەوڵەت لەسەر ئەو ڕێکەوتننامە کە یەکەم دەوڵەت سوید بوو و

قەتەریش لە ساڵی ٢٠٠٩ ئیمزای لەسەری کرد، بەڵام ئەمریکا بەهەندیَ بەهانەوە تاکو ئێستا لەو ڕێکەوتننامەدا بەشدار نییە، جگە لە ئێران و سوودان کە ئێستا ئاراستەی بەرەو ڕازیبوونە، زۆربەی دەوڵەتە عەرەبییەکان تێیدا بەشدارن، ئەو (تحفظ)ش کە هەندێك لەو دەوڵەتانە نیشیانیان داوە سەبارەت بە هەندیَ لە بڕگەکانی هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت چونکە ئەو دەوڵەتانە بە شێوەیەك لە شێوەکان خۆیان وابەستەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەی (سیداو) کردووە.

گرنگیشە بەلامەوە بزانن ئەمەی کە لە ئێستادا لە کوردستان دەگوزەرێت لە هەوڵی ئەوەی کەسەکان بەناوی دایکیانەوە بانگ بکرێن یان ئەو باسانەوە لە ژێر ناونیشانی جیندەرەوە خۆیان دەبیننەوە! ئەوە هەمووی جێبەجێکردنە بۆ هەندێك لە بڕگەکانی ڕێکەوتننامەی (سیداو)، بێگومان لەبەرنامەشیاندا هەیە - ئەگەر بۆیان بچێتەسەر وخەڵکی بێ دنگ بن - یەك بە یەکی بڕگەکانی سیداو کە دژ بە شەریعەتی ئیسلامە لە کوردستاندا جیبەجێی بکەن.

بۆ ئەم نووسینەم سوودم لە چەند سەرچاوەیەك بینیوە، لەوانە:

* حقوق المرأة في الاسلام واتفاقية سيداو/ محمد يحيى النجمي.

* سيداو في الميزان/ نزار محمد عثمان.

* بنود اتفاقية السيداو ومخالفتها للشريعة الاسلامية/ أسماء سعد الدين.

* موحازەرەیەکی پەیوەندیداری دکتۆر محمد أحمد الزين ی مامۆستام لە مادەی الثقافة الاسلامية لە کاتی خوێندنی ماستەر.

## پەیامی سی و دوو:
## مسیار زەواجێکی شەرعییە یان ڕێخۆشکەری خراپەیە؟

١- زەواجی مسیار لە کتێبەکانی فیقهدا بەر لە ئەم سەردەمەی خۆمان بەم ناوەی ئێستا باسی نەهاتووە، بەڵام بە هەندێ ناوی تری جیاوازەوە باسی هاتووە و حوکمیشی باسکراوە، سەرەتا با بزانین بە دیاریکراوی مەبەست لە ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە چیە؟

زەواجی مسیار، یان مصیاف، یان زەواجی سیاحی، یان زەواجی (النهاریات) بەواتای هاوسەرگیری ڕۆژانە، بریتییە لەوەی کە: پیاوێك هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکدا دەکات و مەرجی لەگەڵ دەکات کە پەیوەندی هاوسەرگیرییان بە ڕۆژ پێکەوە دەبێت و بەشەوان لە لای نامێنێتەوە، بەڵکو لەلای ژنی یەکەمی دەمێنێتەوە، بە کورتی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە شاردنەوە و ئاشکرانەکردنی مەبەستە لەلای پیاوەکە و ئەگەر ئیعلانیش بکرێت لە بازنەیەکی سنوورداری خزم و هاوڕێی زۆر کەمدا دەبێت و زۆر جار ئافرەتیش لەم جۆرە هاوسەرگیرییەدا لە مافەکانی خۆی وەکو مافی نەفەقە و مانەوەی شەو و دابین کردنی شوێنی نیشتەجێبوون خۆش دەبێت و تەنازولی لێ دەکات.

٢- زەواجی مسیار بەم شێوەی کە ئێستا هەیە بە پێی قسەی هەندێك لە شارەزایان یەکەم جار لە وڵاتی سعودیە سەری هەڵداوە و دواتر لە وڵاتانی تر تەشەنەی کردووە و زیاتریش ئەو ئافرەتانە پێی ڕازی دەبن کە هەلی شووکردنیان لە کاتی خۆیدا لە دەستچووە، یان لە مێردەکانیان جیا بوونەتەوە یان یان مێردەکانیان مردوون، یان لەبەر هەل و مەرجی تایبەتی تر، بەو جۆرە زەواجە ڕازی دەبن.

٣- لە هۆکارەکانی درووست بوونی ئەم جۆرە هاوسەرگیریەش، گەورەیی تەمەنی کچە  کە پێی دەوترێت قەیرەیی و حاڵەتەکانی جیابوونەوەو بێوەژنی، هەروەها هەندێ ژنیش هەیە بەهۆی ئەوەی مناڵیان هەیە و دەیانەوێت پەروەردەیان بکەن و هاوکات پێویستییان بە پیاوێك دەبێت بە مەبەستی چاودێری و پاراستنیان ئەم جۆرە زەواجە گونجاوە بۆیان، جگە لەو هۆکارانەش مەسەلەی گرانی مەسرەف و تێچووی ژنهێنان و بە نامۆ تەماشاکردنی کۆمەڵگا بۆ کەسێك کە ژنی دووەم وسێیەم بهێنێت و هۆکاری تریشی لە پشتەوە هەیە..

٤- شەرعناسە کۆنەکان وا دیارە باسی  حوکمی زەواجی (مسیار) یان لە ژێر ناوی زەواجی نەهاریات دا کردووە، چونکە پیاو لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا ئەوە بە مەرج دەگرێت کە بەڕۆژ بچێتە لای هاوسەرەکەی نەك بە شەو، بۆ ئەوەی بەشەو لای هاوسەری یەکەمی بێت و پێی نەزانێت، بە گشتی ئەم هاوسەرگیرییە

هاوسەرگیرییەکە بەڕواڵەت مەرجە شەرعییەکانی لە خۆ گرتووە، بۆیە سەرەڕای ئەوەی زۆرێك لە زانایانی ئەم سەردەمە مسیاریان بە زەواجێکی شەرعی زانیوە لەبەر هەبوونی مەرجەکانی هاوسەرگیری، بەڵام هاوکات حەزیان لی نەکردوە و بە مەکروهیان زانیوە ونەکرنیان بە شیاوتر و چاکتر زانیوە بۆ دین و کەسایەتی موسوڵمان..

٥- ئەم زەواجە بەوە لە جۆرەکانی تر لە هاوسەرگیری جیا دەبێتەوە، کە ئافرەتەکە دەست لە هەندێ لە مافەکانی خۆی هەڵدەگرێت کە شەرع پێی داوە و تەنازولی لێ دەکات، بۆ نموونە داوای نەفەقەو خەرجی و خانوو، هەروەها داوای مانەوەی شەو لە مێردەکەی ناکات لەلای، زۆربەی جاریش پیاوێك ئەم زەواجە دەکات کە خۆی هاوسەرێکی تر یان زیاتری هەبێت.

٦- لە ڕاستیدا ئەم زەواجە لە بنچینەدا زەواجیکی تەواوە ئەگەر مەرجەکانی زەواجی شەرعی بە تەواوی لە خۆ بگرێت، وەکو ڕازی بوونی هەردوولاو هەبوونی دوو شایەت و مارەیی و ڕازی بوونی وەلی ئەمر و سەرپەرشتیار و مەرجەکانی تر، ئەوەی تێدایە هاوسەرگیرییەکە بە نهێنی دەمێنێتەوە و ئافرەتەکە ڕازی دەبێت بە یەکسانی لەگەڵ هاوسەری یەکەمی مێردەکەی مامەلەی لەگەڵدا نەکرێت، بە تایبەت لەمەسەلەی مانەوەی شەو.

٧- ئەوەی کە باسمان کرد شێوازی زۆرینەی ئەو جۆرە زەواجەیە، بەڵام مەرجیش نییە لە هەموو حاڵەتەکاندا لەلایەن ئافرەتەکەوە تەنازولی تێدا هەبێت لە مافەکانی وەکو نەفەقە و مارەیی شایستە و حالەتەکان بە پێی هەل و مەرجەکان جیاوازییان لە نێواندا هەیە و ئەوە نییە هەمووی بە یەك شێوازو شێوە بەڕێوە بچێت..

٨- لە ڕاستیدا وازهێنانی ئافرەت لەو مافانەی خۆی وەکو خەرجی و مانەوەی مێردەکەی بەشەو لەلای ئەوە پرسێکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە و مافی خۆیەتی و ئاساییە واز لەو مافانە بهێنێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە دایکی ئیمانداران سودة بنت زمعة (رضي الله عنها) وازی لەشەوەکەی خۆی هێنا بۆ دایکی ئیمانداران عائشة (رضي الله عنها) و پێغەمبەر ﷺ ئەوەی قبوڵ کرد، بەڵام ئەگەر ئەو تەنازولانە بکرێتە مەرج و لە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەدا بنووسرێن هیچ ئیعتیبارێکیان نییە و ئافرەتەکە مەجبور نییە پابەندی بێت، چونکە مەرجیکی ناشەرعییە هەر بۆیە ئافرەت ناچار نابێت دوایی پێوەی پابەند بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما بالُ أقوامٍ يشترطون شروطًا ليست في كتابِ الله؟ من اشترطَ شرطًا ليس في كتابِ اللهِ فهو باطلٌ ، وإن كانَ مائةَ شرطٍ ، كتابُ اللهِ أحقُ وشرطُ اللهِ أوثقُ).

٩- ئەهلی عیلم فەرموویانە زەواجی شەرعی پێویستە پێنج مەرجی تێدا بێت:

یەکەم/ دیاریکردنی هاوسەرەکان: پێویستە بەدیاریکراوی و بەناو ناو ببرێن کێ هاوسەرگیری لەگەڵ کێدا دەکات.

دووەم/ ڕازی بوونی هەردوو هاوسەرەکە بەو هاوسەرگیرییە.

سێیەم/ ئامادەبوون یان ڕازی بوونی باوکی کچەکە یان سەرپەرشتیارەکەی چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا نكاح إلا بولي) هەروەها فەرموویەتی: (أيما امرأة نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل. فنكاحها باطل. فنكاحها باطل)

چوارەم/ هەبوونی شایەت: وەکو لە فەرموودەدا هاتووە: (لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل).

پێنجەم/ نەبوونی ڕێگر (موانع): بۆ نموونە ئایینیان جیاواز بێت، یان مارەیان لەیەکتر نەیەت، یان شیریان پێکەوە خواردبێت.

کە ئەم مەرجانەش لەهەر زەواجێکدا بوونی هەبوو بە زەواجی مسیاریشەوە وەکو لایەنی شەرعی شەرعییە و زەواجەکە دادەمەزرێت، بەڵام:

١٠- زانایان و دانایان و ئەوانەی ئەزموونی دونیایان هەیە، ئامۆژگاری کەس ناکەن بەو شێوە هاوسەرگیری بکات، چونکە بەهۆی نهێنیی بوونەکەی ئامانجەکانی ئیسلامی لە هاوسەرگیریدا تێیدا درووست نابێت، مەگەر پێویستییەکی ڕاستەقینە و قایلکەر هەبێت ئەگینا وا دەرناکەوێت کە پەنابردن بۆ ئەو جۆرە زەواجە کارێکی باش یان جوان بێت، بەڵام ئیتر لەو لاشەوە بنەمایەکی ترمان هەیە کە پێی دەوترێت للضرورات أحكام، بۆیە ناتوانرێت دەرگای ئەو جۆرە زەواجە بەتەواوی دابخرێت لەبەر ئەو زەرورەتەی کە باسمان کرد و لەوانەیە بۆ پیاو و بۆ ژن پێشبێت، ئەگەرنا، ئەو زەواجە بەرژەوەندییەکانی زەواجی شەرعی لێ چاوەڕوان ناکرێت، بەڵکو زۆربەی حاڵەتەکان وەکو ئەوە دیتە پێش چاو کە تێرکردنی شەهوەت و ئارەزوویەکی کەسەکان بێت و هیچی تر، چونکە پیاو بە شێوەیەکی گشتی توانای پەروەردە کردنی مناڵەکانی نابێت یان پابەندی نابێت بە پێی ڕێککەوتنەکە، بگرە توانا و دەسەڵاتی بەسەر هاوسەرەکەشیدا نییە و ناتوانێت ئاراستەی بکات، بۆیە ئەوەی کە پێی دەوترێت (مقاصد الشرع) لەو زەواجەدا ئەستەمە درووست بێت، هەروەها لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە لەناو خەڵك و دراوسێ و خزم و هاوڕێدا پشتگیری ناکرێت و هەردوو هاوسەرەکە تووشی سەرزەنشت و ئیحراجی زۆر دەبنەوە ومناڵەکانی ژنی یەکەمیش بەهۆی ئەو هاوسەرگیرییە نامۆیەی باوکیانەوە ڕەنگە تووشی شەرمەزاری ببن لەبەردەم خەڵکیدا و ئەوەش کاریگەری خراپ لەسەر دەروونیان درووست دەکات.

١١- زۆربەی زانا هاوچەرخەکان کە ڕێگەیان داوە ئەم زەواجە بکرێت، لەبەر ئەوەیە کە مەرجەکانی زەواجی سەحیحیان تێدا بەدی کردووە، ئەوانەش کە بە مەکروهیان زانیوە یان هەندێکیان کە هەر بە حەرامیان زانیوە، تەماشای ئاسەوار و کاریگەرییە خراپەکانیان کردووە، لەوانە:

* ئەم زەواجە سەرەڕای هەبوونی مەرجە شەرعییەکان، بەڵام مەبەستەکانی شەرعی تێدا جێبەجێ نابێت، نە سەقامگیری و نە سوکنایی و نە هەستکردن بە هەبوونی خاڵی هاوبەشی زۆر و نە خۆشەویستی ڕاستەقینە و نە بەزەیی و پەروەردە کردنی مناڵ..ئەوانە بوونیان لە زۆربەی حاڵەتەکاندا نییە.

* هەروەها هەبوونی جۆرێك لە ستەم ونادادگەری لەسەر ئافرەتەکە کە بە بێ خەرجی و دابین کردنی خانوو و مانەوەی شەو ڕازی دەبێت، کە بێگومان لە ناچاری بەو ناداگەرییە ڕازی دەبێت نەك خۆی حەز بەوە بکات.

* قوامة و توانای پیاو لەسەر ئاراستەکردن و پەروەردەکردن و بەڕێوەبردنی ماڵ بە شێوەیەکی ڕاست و درووست بوونی نییە لەم زەواجە، ماوەی جارێك سەر لە هاوسەرەکەی دەدات و لەرووەیەکەوە وەکو ئەو هاوڕێتییەیە وایە کە لە نێوان ژنان و پیاواندا لە ڕۆژئاوا درووست دەبێت.

* ئەم زەواجە زۆرجار بەکارهێنانی ژنە وەکو ئامرازێك بۆ تێرکردنی ئارەزووی پیاو و هیچی تر، تەنانەت پیاوەکە لە ڕووی جۆرەکانی لێپرسراوێتییەوە هیچی ناکەوێتە سەر ومەسەلەکە زیاتر تێرکردنی هەندێ حەزە بۆ هەردوولا.

* وەکو پێشتریش باسمان کرد ئەو مەرجانەی کە دەسەپێتە سەر ئافرەت مەرجی بەتاڵ و ناشەرعین، بۆیە لە کاتێکدا کە هەندێ لە ئەهلی عیلم گرێبەستەکە بەڕاست دەزانن، لە هەمان کاتدا مەرجەکان بە بەتاڵ دەزان، لەولاشەوە هەندێ زانای تر هەن لەبەر هەمان ئەو مەرجە ناشەرعییانە وتوویانە گرێبەستەکەش ناشەرعی و بەتاڵە.

* ئەم زەواجە لەڕاستیدا ڕێگەو هۆکارێکە بۆ بڵاوبوونەوەی خراپەو فەساد لە کۆمەڵگادا، بۆیە ئەوانەی کە نکوڵی لەم زەواجە دەکەن دەڵێن: زەواجی مسیار زۆر لە زیناوە دوور نییە، ئاسانکاری لەڕادەبەدەر لە گرێبەستەکەدا دەکرێت و مێرد بەرپرسیارێتییەکی وای ناکەوێتە سەر و بە ئاسانی لە هاوسەرەکەی ئەتوانێت جیا بیتەوە و زۆربەی حاڵەتەکانیش لە نهینیدا دەبێت، بەم شێوەش ئەم زەواجە دەبێتە یارییەك بەدەست ئەوانەی هیچ خەمێکیان نییە جگە لە ئارەزوو و حەزەکانی خۆیان نەبێت، بە فیعلیش وای لێهاتووە و تەنانەت نووسینگەی تایبەتی خۆی هەیە و بووەتە جۆرێك لە نیکاحی موتعە.

١٢- بە کورتی زانایانی ئەم سەردەمە ئەگەرچی زۆرێکیان زەواجی مسیار یان بە سەحیح داناوە لە ڕووی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە لەبەر هەبوونی مەرجەکان، بەڵام هاوکات بە هۆی درووست نەبوونی مەبەستەکانی شەرع لە هاوسەرگیری و ناچاربوونی ئافرەت لە تەنازول کردن لە مافەکانی خۆی ئەو زەواجەیان بە مەکروهـ زانیوە و مەترسی ئەوەیان هەیە کە ببێتە بەهانەیەك بۆ بڵاوبوونەی خراپە و فاحیشە لە ناوکۆمەڵگادا، لە هەمان کاتدا کۆمەڵێك شەرعناسی تر ئەم زەواجەیان بە حەرام زانیوەو ڕێگەیان نەداوە بکرێت و هەندیکیش وەستاون و نەیانتوانیوە ڕایەکی یەکلاکەرەوە بدەن لەسەر ئەم پرسە.

هەندێ لە زانا گەورەکانی ئم سەردەمەش پاش ئەوەی فەتوای حەڵاڵ بوونی ئەم زەواجەیان دابوو، بەڵام دوای ئەوەی بینییان زەواجی مسیار بە ئاراستەیەکی پێچوانەدا ڕۆیشتووە و لە زەواجی موتعە و سیغەوە خەریکە نزیك دەبێتەوەو بووەتە هۆکارێك بۆ بڵاوبوونەوەی خراپە، لە فەتواکەیان پاشگەزبوونەوە و وتیان مسیار زەواجێکی نادرووستە.

١٣- وەکو لە جێگەیەکی تری ئەم زنجیرەشدا وتوومە و لێرەش دووپاتی دەکەوە: زەواجی مسیار خەریکە لە ڕێڕەوی خۆی و مەبەستەکانی لادەدرێت و نزیکە لەوەی سەر لە ئاراستەیەکی تری جیاواز و ناشەرعی لە مەبەستی زەواجی شەرعییەوە سەر دەربهێنێت، لەم چەند ماوەی دواییدا، بە بەهانەی شەرعی بوونی زەواجی مسیارو ودەیان وڕەنگە سەدان مەلا وبەناو بانگخواز کە پسپۆڕیان بووەتە ڕێکخستنی ئەو جۆرە زەواجە وبوونەتە جێگای خوازیارانی زەواجی مسیار!، بە هۆی ئەوانەوە ئەمڕۆ جۆرێک لە نابەرپرسیارێتی بەرفراوان لەو بوارەدا درووست بووەو ، تەنانەت پیاوانی بەناو ئیسلامی مولتەزیمیش لە ڕێگەی دەڵاڵەکانی زەواجی میسیارەوە بە کەمترین پارەو، بەڵکو هەندێک جار بەپەنابردن بۆ حیلەی شەرعی وفرِوفێڵی وحیلەی ناو مەزهەبەکان و بۆ کەمترین ماوە لە پرۆسەیەکی نزیک لە زەواجی موتعەی لای شیعەکان ئەو زەواجە ئەنجام ئەدەن، لەگەڵ ئافرەتی بێوەژندا زەواج دەکەن ودوای ماوەیەک تەڵاقیان دەدەن وزەواجێکی تر دەکەن، واش دەردەکەوێت هەندێک لەوانە لەسەرەتاوە بەنیازی تەڵاق دان ئەو زەواجە ئەنجام ئەدەن چونکە ڕێکخەرانی ئەو زەواجە ئەوەشیان بۆ حەڵاڵ کردوون! بە کورتی خەریکە دەبێت بە جۆرێك لە زەواجی سیغە، مەلای وا هەیە کە سەرقاڵی ئەو بابەتەیەو کردییەتی بە پیشە بۆ خۆی، دەیان زەواجی لەو شێوەی بۆ خۆی ڕێکخستووە، لەملاوە زەواج دەکات و لەو لاوە تەڵاق دەدات چونکە هیچی تێناچێت و خۆیشی بەوە خەڵەتاندووە کە زەواجێکی شەرعییە،

بەداخەوە بازاڕی ئەو جۆرە زەواجە ئێستا لە سلێمانی ولە شارەکانی تری کوردستاندا بازاڕێکی گەرمەو وەکو لە کەسی متمانە پێکراوو ڕاستگۆ زانیومە بازاڕێکە جمەی دێت وهەندێ جار دەڵێن بە پەنجا هەزارێکی مانگانە ڕەنگە ئەو زەواجە دەست بکەوێت، زۆر جاریش تەنها ژن وپیاوەکەو مەلاکەو دوو شایەت حازری مارەبڕینەکە دەبن و، دوو شایەتەکەش نەناسراون، وەکو بڵێی ئیشیان شایەتیدانەو مەرجیان ئەوەیە دوای ئەنجامدانی کارەکەیان ئیتر لێی دەربچن وکەس بانگیان نەکاتەوە، کە ئەوەش جۆرێکە لە سووککردنی ئەو پرۆسە پیرۆزەو و حاڵ وا بڕوات دەبێتە جۆرێک لە موتعەو لەفرۆشی دەمامکدار، کە وا دەزانم ئێستا هەنگاوە یەکەمەکانی ئەو سووککردن و سیغە دەمامکدارە لێرە لە سلێمانی و لە وهەولێر و شار و شوێنەکانی تریش سەری هەڵداوەو درووست بووە. لێرەشدا بەباسکردنی ئەم حەقیقەتە تاڵ وناخۆشە، مەبەستم ئاگادار کردنەوەی خوشکانی بەڕێزە بەتایبەتی لە بێوەژنان کە بەو مەلاو بانگخوازانە نەخەڵەتێن و ئەم مەسەلە ئێستەش ئەگەر بەتەواوی نەبووبێتە جۆرێك لە بازرگانی ناشەرعی و ناشیرین، لە داهاتوودا دەبێت، چونکە ئەو جۆرە زەواجە زۆرێکی تەنها تێرکردنی شەهوەتەو هەستکردنی بەرپرسیارێتی و قودسیەتی خێزان تێیدا بوونی نییە، بۆیە دەبێت کچان وئافرەتان وریای خۆیان بن و نەکەونە داوی ئەو دەڵاڵ و بازرگانانەوە کە بەناوی دینەوە فریویان دەدەن.

١٤- پوختەی ئەم باسە ئەوەیە: زەواجی مسیار زەواجێکی درووستە ئەگەر مەرجەکانی زەواجی شەرعی تێدا بێت لە ئیجاب و قبول و ڕازیبوونی وەلی ئەمر ومارەیی و ئیعلان کردن گرێبەستەکە دادەمەزرێت و شەرعییە، ئەم زەواجەش بۆ هەندێ کەسی خاوەن بارودۆخی تایبەت گونجاوەو دروستە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە هەندێ خەڵکی دین لاواز ئەم پرسەیان بە ئاراستەیەکی خراپدا بردووەو ئێستا زەواجی مسیار بە هۆی جێبەجێ نەکردنی مەرجەکانی خەریکە دەبێتە ڕێگەیەك بۆ خراپە و بڵاوبوونەوەی فەسادی دەمامکدار، وەڵامی ئەو پرسیارەی ئاسا زەواجی مسیار دروستە یان درووست نییە بە بەلێ نەخێر نابێت، واجب ئەوەیە سەیری حاڵەتەکە بکرێت و بەپێی مەرجەکان و شەرعی بوون و نەبوونی وەڵام بدرێتەوە، ئەگەر حاڵی ژن و پیاوەکە بە شێوەیەك موافیقی شەرع بوو ودیار بوو کە ئامانجی شەرعی و سوکنایی خێزانی تێدایە و مەرجەکانیشی تێدا بوو، ئەوە دروستە و بۆ هەردوو لا کارێکی ڕێگەپێدراوو بە سوودە، ئەگەریش تەنها بۆ تێرکردنی ئارەزوو وحەزیکی کاتی بوو و ئەو دوو لایەنە ئەزموونی لەو جۆرەیان زۆر بوو و بەوە ناسرابوون ئەو زەواجە دەکەن و جیادەبنەوەو دووبارەی دەکەنەوە ئەوە هەمان ئەو زەواجەیە کە سیغەو موتعەی پێ دەوترێ و پۆشاکیکی شەرعی ساختەی لەبەر کراوە، وەکو خۆشم نەسیحەتی هیچ کەسێك ناکەم تاکو پێی دەکرێت پەنا بۆ ئەو جۆرە زەواجە ببا، چونکە چەندین تەمومژو وناڕوونی و کێشە و ئیحراجی کۆمەڵایەتی و ناڕوونی دەرەنجام تێدایە إلا ما رحم ربي.

بۆیە موسوڵمان هەرگیز پەنا نەبات بۆ ئەم جۆرە زەواجە باشترە و ئەگەر ئەیەویت زەواجی دووەم و سێیەم بکات، پێویستە مەرجەکانی تێدا هەبێت وپیاوانە و موسوڵمانانە ئەو کارە بکات و ئەوە مافێکی دەستەبەکراوی خۆیەتی لەشەرعدا و قورئان و سونەتدا بە ڕوونی بێ هیچ گومان و کێشەیەك ڕێگەیان پیداوە، بەوەش بێ نیاز دەبێت کە پەنا بۆ ئاوها زەواجێك ببات کە بەداخەوە خاڵی هاوبەشی لەگەڵ زەواجی موتعە و گێڵ فرێندی ڕۆژئاوادا خەریکە لێ پەیدا دەبێت، بەڵام وەکو پێشتریش ئاماژەم پێکرد ئەم پێناسە و حوکمەی هاوسەرگیری مسیار بە ڕەهایی گشتگیر نییە و مەرج نییە لەسەر یەك بە یەکی ئەوانەی کە ئەم زەواجە دەکەن جێبەجێ بێت، بەڵکو زیاتر مەبەستم بوو جەخت لەسەر بەرجەستەکردنە خراپەکەی ئەم زەواجە بکەم. ...والله اعلم بالصواب.



# پەیامی سی و سێ: ئادابی خوازبێنی و مارەبڕین و ژن گواستنەوە

١- زەواج لە ئیسلامدا گرێبەستێکی پیرۆزە شەرع پارێزگاری لێ دەکات و کۆمەڵێك حیکمەتی تێدایە، لەوانە:

* پارێزگاری کردن لە مانەوەی مرۆڤەکان و ڕەچەڵەکانیان.

* پاراستنی کۆمەڵگا لە بەدڕەوشتی و هەڵوەشانەوە خێزان.

* هاێیکاری نێوان ژنان وپیاوان لە پێناو پێکهێنانی خێزان و پاراستنی کۆمەڵگا لە تەشەنە کردنی جۆرەها دەرد وبەڵاو نەخۆشی.

* بەرقەراربوونی ئاسوودەیی دەروونی و وروژاندنی هەستی دایکایەتی و باوکایەتی لە نێوان ژنان و پیاواندا و زۆر حیکمەتی تریش.

٢- پێویستە هەڵبژاردنی هاوسەر لەسەر بنەمای دینداری و ئیمان و عەقیدەی ڕاست دابمەزرێت، ئەگەر کچان و کوڕان و سەرپەرشتیارانیان بەو شێوە بیر بکەنەوە و هەڵبژاردن لەسەر بنەمای ڕەوشت و دین و ڕەچەڵەکی باش و بەرێز بێت، بێ ئەوەی لە سنووری شەرع وچوارچێوەی مەعقولدا دەستبەرداری هیچ مەرجێکی تریش ببن ئەگەر گونجا، لەو حاڵەتەدا بەختەوەری خێزانی و پەروەردەی تەندروست و جوان بۆ منداڵەکانیان دەستەبەر دەبێت و شوێنەوارە باشەکانیشی لەسەر تەواوی کۆمەڵگا دەبینرێت.

٣- لە مەسەلەی زەواجدا دوای ڕەچاوکردنی مەرجی دین و ڕەوشت و مەرجەکانی تر، بۆچوونێك لە لای زانایان هەیە کەوا هاوسەرگیری لە گەڵ کەسانی دووردا، لە خزمی نزیك گونجاوتر و باشترە، لەوانەیە لە ڕووی تەندرووستیشەوە هەر وابێت، هەندێ فەرموودەش لەو بارەوە هاتووە بەڵام سەنەدیان صحیح نییە، بە عەقڵ و بە ئەزموونیش دەرکەوتووە، هەندێ جار زەواجی خزمی نزیك نەخۆشی منداڵ و هەندێ کێشەی خیزانی و کۆمەڵایەتی لێ دەکەوێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زەواج لەگەڵ کەسانی دوور و غەریبدا خزمایەتی تازە دروست دەکات و لە ڕووی تەندرووستی و لە ڕووی تریشەوە ڕەنگە باشتر بێت، ئەمەش مەعنای ئەوە نییە زەواج لەگەڵ خزمی نزیکداحەرامە و ڕێگەپێنەدراوە لە شەرعدا، بەڵکو سەیر دەکرێت بزانە بەرژەوەندی دین و دونیای کەسەکە لە کامیاندایە ئەوە بکات وتاکو پێی دەکرێت کەسە دوورەکە پێش بخات ونەشکرا بچێتە سەر خزمی دوور وئینجا نزیک و الله أعلم.

٤- لە هەندێ لە فەرموودە سەحیحەکانیشدا ئەوە هاتووە کە کچی عازەب لە بێوەژن گونجاوترە بۆ زەواج، بەڵام ئەوە بۆ هەڵبژاردنە لە نێوان دوو حاڵەتدا کە هەردوکیان بەردەست بن، نەک بە مەعنای نەهی کردن لە مارەکردنی بێوەژنان، لەوانەشە مەبەستی پەسەندکردنی کچ بەسەر بێوەژندا بۆ کەسێکی گەنج بێت کە بۆ یەکەم جارە هاوسەرگیری دەکات، نەک بۆ هەموو کەسێک کە بیوێت هاوسەرگیری بکات، هەروەها شەرع جەختی لەسەر هەڵبژاردنی ئەو

کچانەکردووە کە منالْیان زۆر دەبێت، ئەوەش بە تەندروستی باشی کچەکە و سەیرکردنی دایك و خوشکی لەمەسەلەی منالْ بووندا دەردەکەوێت. هەروەها تەندروستی باش وساغی جەستە ئەویش بۆ خۆی خالْێکی گرنگە و شایانی بایەخ پێدانە لە کاتی هەڵبژاردنی هاوسەردا. مەسەلەی تکافؤ وهاوتابوونیش لە نێوان هاوسەراندا ئەگەر بکرێت کارێکی خراپ نییە ئەگەرچی دین خالْی سەرەکی ویەکەمی هاوتاییە وخاڵەکانی تر وەکو پێگەی کۆمەڵایەتی وجوانی و دەوڵەمەندی وبڕوانامە مەسەلەیەکە لەسەر قەناعەندتی خودی کەسەکان ڕادەوەستێت.

٥- خوازبێنی قۆناغی پێش مارە بڕینەو ئەویش پێویستی بە وەرگرتنی هەندێ ڕێ وشوێنە، وەکو:

- بینینی خوازبێنیکەر و خوازبێنی کراو بۆ یەکتر، لەو بارەشەوە فەرموودەی صحیح هاتووە، وەکو: (انْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا)(١) بەڵام ئەو کەسەی دەیەوێت خوازبێنی بکات بۆی نییە تەماشای خوازبێنیکراوەکە بکات تاکو تەواو بڕیاری کۆتایی نەدات لەسەر ئەوەی بیەوێت زەواجی لەگەڵدا بکات. هەروەها لە کاتی پێویستدا دەتوانێت زیاتر لە جارێك سەیری بکات و لە کاتی خوازبێنیکردندا دەشتوانێت قسەی لەگەڵ بکات.

(١) - الترمذي (١٠٨٧) وابن ماجه (١٨٦٥).

- تاكو خوازبێنی بە مارەبڕین كۆتایی نەیەت وگرێبەستی هاوسەرگیری دانەمەزرێت، هەموو جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان كچ وكوڕدا حەرامە، وەكو تەوقە كردن و بەتەنها پێكەوە بوون.

- خوازبێنیكار دەتوانێت لە كاتێكدا تەماشای خوازبێنیكراو بكات كە پێی نەزانێت ئەو سەیری دەكات.

٦- حەرامە ئافرەت ئەگەر لە عیددەی تەڵاق ومردنی مێرددا بێت خوازبێنی بكرێت، بەڵام دەكرێت بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ تێبگەیەنرێت كە دوای تەواو بوونی عیددەكەی كەسێكی دیاریكراو بەنیازە بچێتە پێشەوە بۆ داواكردنی ، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُمْ بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ أَوْ أَكْنَنْتُمْ فِي أَنْفُسِكُمْ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَكِنْ لَا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّا أَنْ تَقُولُوا قَوْلًا مَعْرُوفًا﴾[١]

٧- گرێبەستی هاوسەرگیری ئەو گرێبەستەیە كە ژن وپیاو بۆ یەكتر حەڵاڵ دەكات، بنەماو بنچینەی ئەو گرێبەستەش لەسەر ئیجاب و قبول دادەمەزرێت، واتە ڕازی بوونی هەردوو لا لەسەر پێدانی كچ و قبوڵ كردنی ئەو هاوسەرگیرییە لەلایەن خوازبێنیكەرەوە.

[١] - البقرة:٢٣٥.

٨- گرێبەستی شەرعی ودرووست کە ژن و پیاو بۆ یەکتر حەڵاڵ دەکات پێویستە چەند مەرجێکی تێدا بێت بۆ ئەوەی پێی بوترێت گرێبەستێکی شەرعییە و راستە:

یەکەم: پێویستە ئەو کەسەی خوازبێنی دەکرێت بەناوی خۆی دیاری بکرێت، بۆ نموونە باوکی یان وەلی ئەمرەکەی بڵێت فڵانی کچم لێ مارە کردی و ئەویش بڵێت قبوڵم کرد.

دووەم: پێویستە هەر دوو هاوسەرەکە ڕازی بن، هەم کچەکە و هەم کوڕەکە.

سێیەم: پێویستە سەرپەرشتیار و وەلی ئەمری کچەکە یان بریکارەکەی ئامادە بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا نكاح إلا بولي)[١] لە پێشترین وەلییەکانیش بۆ بەشوودانی کچ، باوکە و ئینجا باپیرەو ئینجا کوڕ، ئینجا برای دایك و باوکی و برا لە باوك. ئەگەر ئەوانەش نەبن کێ نزیکترینە لە خوازبێنیکراوەکەوە، ئەو مەسەلەش لە ڕووی فیقهییەوە شیکردنەوەی زیاتر هەڵدەگرێت.

چوارەم: پێویستە دوو شایەت شایەتی لەسەر ئەو زەواجە بدەن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل)[٢]

---

[١] - رواه أحمد وأبو داود.

[٢] - رواه ابن حبان والبيهقي وصححه الذهبي.

پێنجەم: هەردوو هاوسەرەکە ڕێگری نەبێت لە هاوسەرگیرییەکەیان، بۆ نموونە: مەحرەمی یەکتر نەبن و شیریان پێکەوە نەخواردبێت و هەروەها جیاوازی دین لە نێوانیاندا نەبێت، بۆ نموونە کچەکە موسوڵمان بێت و کوڕەکە ناموسوڵمان بێت، یان خوازبێنیکراوەکە لە عیددەدا بێت.

شەشەم: هەبوونی مارەیی، ئیتر کەم بێت یان زۆر، پێویستە و یەکێکە لە بنەماکانی دامەزراندنی ئەو گرێبەستە، الله تعالى لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾[1]

**تێبینییەکی گرنگ:** مەسەلەی دابەش کردنی مارەیی بۆ مقدم مؤخر لە شەرعدا ئەسڵی نییەو بیدعەیە، مارەیی بریتییە لەو بڕە پارە یان زێڕەی کە دیاری دەکرێت و ئەسڵ وایە لە کاتی مارە بڕیندا پیاوەکە بە هاوسەرەکەی  بدات، بەڵام ئەگەر بەشێکی ئەو مارییەی لەو کاتەدا نەبوو، یان هەمووی لەو کاتەدا بۆ هەڵنەسوڕا، درووستە بکرێتە قەرز لەسەر پیاوەکە تاکو ئەو کاتەی کە دەتوانێت بیدات یان لەسەر کاتێکی دیاریکراو ڕێکبکەون، بەڵام ئەمەی کە هەیە ئێستا مۆخر ئەو بڕە پارەیە کە لە گەردنی مێردداد دەمێنیتەوە ونایدات، چونکە لە عەقدەکەشدا دەنووسرێت  لە حالەتی مردن و جیابوونەوە دەیدات، واتە ئەگەر پێش ژنەکەی تەڵاق نەدا و پێش نەمرد هیچی ناکەوێتە سەر، ئەوە شەرعی نییە.

[1] - النساء:٤.

٩- ئاساییە و درووستە بە بۆنەی ئەو زەواجەوە لە سنووری شەرعدا خۆشی دەربب‌ڕدرێت و ئاهەنگ بگیڕدرێت، بێ تێکەڵاوبوونی ژنان و پیاوان و لێدانی مۆسیقا و کاری ناشەرعی. لە سنووری شەرع و لە بازنەی ڕێگە پێدراودا هەر خۆشی دەربڕینێك جائیزە.

١٠- مەرج نییە بۆ مارە برین ئیللا مامۆستایەکی ئایینی ئامادە بێت ومارەی ببڕێت، ئەو کارە بە خۆیشیان دەکرێت ئەگەر شارەزایی شەرعیان هەبێت، یان بە هەر موسوڵمانێکی موەحید و شارەزا لە شەرع دەکرێت، گرنگ ئەوەیە مەرجەکانی زەواج بوونی هەبێت وەکو ڕازی بوونی هەردوو لاو ئامادە بوونی وەلی ئەمرو دوو شایەت و دیاریکردنی مارەیی وئیعلان کردنی زەواجەکە ومەبوونی هیچ ڕێگرێکی شەرعی لە ئەنجامدانی گرێبەستەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە سەیرو سەمەرەکانی ئەم سەردەمەی خۆمان ئەوەیە موسوڵمان لە هەموو شتێک سەری دەردەچێت وشارەزایە، جگە لە دینەکەی نەبێت تێیدا کلۆڵە، بۆیە باشترە کەسێکی شارەزا وەکو تالیب عیلمێک یان مامۆستایەکی عەقیدە پاک ئامادەی مارە برینەکە ببێت ومەرجیش نییە مامۆستای مزگەوت ومەلای ئەوقاف بێت، بەڵکو هەر کەسێک هەندێ لە شەرع شارەزا بێت دەتوانێت بەو کارە هەڵسێت.

١١- هەندێ ئاداب هەیە چاکترە پیاو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ڕەچاوی بکات لە کاتی گواستنەوەیدا:

* مستحب وایە دەستی ڕاستی بخاتە سەر سەری خێزانەکەی و بسم الله بکات و دوعای خێرو چاکەی بۆ بکات، وەکو لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە: (إذا تزوج أحدكم امرأة أو اشترى خادما فليأخذ بناصيتها وليسم الله عز وجل وليدع بالبركة وليقل: اللهم إني أسألك من خيرها وخير ما جبلتها عليه، وأعوذ بك من شرها وشر ما جبلتها عليه)

* مستحب وایە پێکەوە دوو ڕکات نوێژ بکەن: (إذا دخلت المرأة على زوجها يقوم الرجل فتقوم من خلفه فيصليان ركعتين ويقول: اللهم بارك لي في أهلي وبارك لأهلي في اللهم ارزقهم مني وارزقني منهم، اللهم اجمع بيننا ما جمعت في خير وفرق بيننا إذا فرقت في خير)[١]. لەسەلەفەوە ئەنجامدانی ئەو دوو ڕکاتە نوێژە هاتووە .

* کارێکی باشە پێش ئەنجامدانی کاری شەرعی مولاتەفەی بکات واتە قسەی خۆشی لەگەڵ بکات و گاڵتەی لەگەڵدا بکات و خواردن و خواردنەوەیەکی پیشکەش بکات.

لەو بارەوە کۆمەڵێك فەرموودە هاتووە و سوننەتی کرداری پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەسەلمێنێت.

---

[١] - أخرجه الطبراني وصححه الألباني

* مستحب وایه بۆ کاری شەرعی یەکسەر نەچێتە لای خێزانەکەی، بەڵکو پێش ئەوە مولاعەبە و وروژاندن درووست بکات و ئەوە بکاتە پێشەکییەک بۆ ئەنجامدانی کاری شەرعی.

* سوننەت وایه کە بە مەبەستی سەرجێیی چووە لای خێزانەکەی بڵێت: (بسم الله اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا).

* لە پێشەوە یان لە دواوە درووستە بچێتە لای خێزانەکەی، بەمەرجێك لە یەک جێگەوە بێت کە ئەویش جێگەی مناڵبوونە.

* چوونە لای ئافرەت لە دواوە لە حرگای دەرچوونی پیسایی، کارێکی قێزەونە و پێچەوانەی فیترەتە و مرۆڤی تەواو خۆی لێ بەدوور دەگرێت و شەرع بەهەموو شێوەیەك ئەو کارەی حەرامی کردووە. الله فەرموویەتی: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُمْ﴾[1] کۆمەڵێك فەرموودەش هاتووە کە بەڕاستەوخۆ و بەناڕاستەوخۆ ئەو کارەی حەرام کردووە.

* لە نێوان دوو جووتبووندا هاوسەران دەتوانن دەستنوێژ بگرنەوە، لەوەش باشتر ئەوەیە غوسل بکەن وەکو لە هەندێ فەرموودەدا هاتووە.

* دەکرێت هەردوو هاوسەرەکە لەیەك جێگەدا پێکەوە غوسڵ بکەن، وەکو لە سەحیحی بوخاری ومسلم دا هاتووە، دایکمان عائیشە الله لێی ڕاز بێت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لەیەك جێگەدا غوسڵیان کردووە.

---

(١) - البقرة:٢٢٣.

* لە فەرموودەی سەحیحیشدا لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە سوننەت وایە بە لەشگرانی نەخەون، بەڵکو دەستنوێژ بگرن و ئینجا بخەون، ئەگەر خۆشۆردن و غوسڵیش بێت باشترە. بەڵام ئەو کارە واجب نییە و مستحب ە بکرێت، بەبێ دەستنوێژ وغوسڵیش بخەونەوە گوناهبار نابن.

١٢- هەروەها سوننەتە پیاو  بە بۆنەی گواستنەوەی خێزانەکەی وەلیمە بکات، مەڕێك یان زیاتر ئەگەر حاڵی باش بوو سەرببڕێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆ هەندێ لە دایکانی ئیماندارا مەڕێکی سەر بڕیوە، (ما رأيت النبي ﷺ أولم على أحد من نسائه ما أولم عليها؛ أولم بشاة)[١]

بەڵام ئەگەر توانای دابین کردنی گۆشتی نەبوو، درووستە بەهەر جۆرە خواردنێکی تر وەلیمە بکات، بۆ نموونە بە شلەو برنجێکی سادەی بێ گۆشت، وەکو لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە وەلیمەیەکی پێغەمبەر ﷺ خورما و کەشك و ڕۆن بووە، پێویستە نیەتیش لەو وەلیمە شوێنکەوتنی سوننەت بێت و تایبەت نەکرێت بە دەوڵەمەند و خەڵکی تایبەت.

سوننەتیش وایە ئەو کەسەی بانگهێشت دەکرێت بۆ وەلیمە بڕوات و ئەگەر لەڕۆژووی سوننەتیشدا بێت بیشکێنێت و بەنیەتی دڵ خۆشکردنی خاوەن وەلیمەکە بچێت و پیرۆزبایی لێ بکات و بڵێت: (بارك الله لك وبارك عليك وجمع بينكما في خير) یان هەر دوعایەکی تر لەوانەی لە سوننەتدا هاتووە.

---

[١] - البخاري: ٥١٧١.

١٣- حەرامە ئەوەی ڕوو دەدات لە نێوان ژن و پیاودا لەمەسەلەی سەرجێیی بۆ هیچ کەسێك باس بکرێت، لە سەحیحی مسلم دا هاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن من شر الناس عند الله منزلة يوم القيامة الرجل يفضي إلى امرأته وتفضي إليه ثم ينشر سرها). واتە: خراپترین کەس لە ڕۆژی قیامەتدا کەسێکە نهێنی سەرجێیی هاوسەرەکەی باس کردووە.

١٤- حەرامە پیاو لە کاتی حەیزو نیفاسدا سەرجێیی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بکات، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ويسألونك عن المحيض قل هو أذى فاعتزلوا النساء في المحيض ولا تقربوهن حتى يطهرن﴾[1]

١٥- حەرامە و تاوانە بۆ ئافرەت ئەگەر مێردەکەی بۆ سەرجێیی خۆی بانگی بکات و گوێڕایەڵی نەبێت و نەچێت بەدەنگییەوە، وەکو لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: (إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فلم تأته فبات غضبان عليها؛ لعنتها الملائكة حتى تصبح)[2]

بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ کتێبەکانی سوننەت وفەرموودە لە بابی الخطبة والنكاح، هەروەها هەندێ کتێبی تایبەت بۆ ئەو باسانە دانراون وەکو، کتێبی: (آداب الزفاف)ی محمد ناصر الدين الألباني و (آداب الخطبة والزفاف)ی عبدالله علوان.

---

[1] - البقرة: ٢٢٢.

[2] - متفق عليه.

## پەیامی سی و چوار:
## حوکمی ئامادەبوونی ئافرەتان بۆ نوێژی جەماعەت

بە کۆمەڵێك مەرج و ڕێوشوێن، ئافرەتان لە ڕووی شەرعەوە ڕێگەیان پێدراوە بچنە نوێژی جەماعەت لە مزگەوت، لە سەحیحی مسلم دا هاتوە: (إِذَا اسْتَأْذَنَكُمْ نِسَاؤُكُمْ إِلَى الْمَسَاجِدِ فَأْذَنُوا لَهُنَّ) ئەگەر ئافرەتەکانتان داوای مۆڵەتیان لێ کردن بۆ ڕۆیشتن بۆ مزگەوت ڕێگەیان پێ بدەن و فەرموودەی تریش هاتووە لەو بارەوە. ئافرەتانی هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت، کە ئامادەی نوێژی بەیانی دەبوون، دەموچاویان دەشاردەوەو کەس ئەوانی نەدەناسی، واتە بە حیجابێکی شەرعی تەواو و بەبێ بەکارهێنانی بۆن و کۆمەڵێك ڕێوشوێن و احتیاطات ی تریان دەکرد ئەوجا دەڕۆیشتن، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی ئافرەتان لە ماڵی خۆیان لە مزگەوت باشترە و خێری زۆرترە.

کاتێ أم حمید ی هاوسەری أبي حمید الساعدي هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی یا رسول الله ﷺ پێم خۆشە لەگەڵ تۆ لە مزگەوتەکەت نوێژ بکەم، پێی فەرموو من دەزانم تۆ حەز دەکەیت لەوێ نوێژ بکەیتدەتوانیت وا بکەیت، بەڵام نوێژەکەت لە ماڵی خۆت باشترە و خێری زۆرترە، ئیتر ئەویش جێگایەکی لە

ئەوپەڕی ماڵەکەیانەوە و تاریکترین شوێنەوە درووست کرد و لەوێ نوێژی دەرد.[1]

دایکمان عائیشە الله لێی ڕازی بێت وەکو لە صحیح البخاري (١/ ١٧٣)داهاتووە دەیفەرموو: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بینیبا کە ئافرەتان ئێستا دایان هێناوە ڕۆیشتنی مزگەوتی لێ قەدەغە دەکردن وەکو چۆن چوونە مزگەوت لە ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل قەدەغە کرا.

جا گەر عائیشە الله لێی ڕازی بێ لەو سەردەمە وایفەرمووبێت ئێمە ئێستا بڵێین چی؟ بە کورتی ئافرەت گەر مەرجە شەرعییەکانی لە خۆیدا دروستکرد دەتوانێت بچێتە مزگەوت و نەچوونیشی باشترە و خێریشی زۆرترە، ئەمەش مەرجەکانە بە پێی ئەوەی لە بەڵگەکانی سوننەتدا باس کراون و یەکێك لە زانایان دەیخاتە ڕوو:

١- ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت نەبێتە مایەی هیچ مەترسییەکی فیتنە و گوناهباری.

٢- ڕۆیشتنەکەی هیچ مەسەلەیەکی ناشەرعی و ناپەسەندی لێ نەکەوێتەوە.

٣- ڕێگەی ڕۆیشتن و گەڕانەوەی لە گەڵ ڕێگەی پیاواندا نەبێت و ناچاری تێەڵ بوون لەیەکتر نزیك بوونەوە نەبن.

٤- هیچ بۆنی خۆش بەکارنەهێنێ و نابێ پێشتر بەکاری هێنابی و بۆنە مابێتەوە.

٥- ئەبێت بەتەواوی خۆی داپۆشیبێت و مەرجەکانی حیجابی شەرعی تێدا بێت.

٦- لە دەرگایەکی تایبەت بە ئافرەتانەوە بچنە مزگەوت و لێی دەربچن.

[1] - رواه أحمد ( ٢٦٥٥٠ ) . وصححه ابن خزيمة في " صحيحه " ( ٣ / ٩٥ ) وابن حبان ( ٥ / ٥٩٥ )

٧- دەبێ جێگای نوێژیان لەگەڵ جێگای پیاوان نەبێ و بەینیان هەبێت و ئافرەتان لە کاتی دەرچووندا پێش بکەون و پیاوان چاوەڕێی دەرچوونی ئەوان بکەن.

هەمو کەس دەزانێت ئەم مەرجانە لە ئێستا زۆر ئەستەمە دروست بی و لە ڕاستیدا نەڕۆیشتنی ئافرەتان بۆ مزگەوت باشترە لە ڕۆیشتنیان، بەڵام ئەگەر هەر ڕۆیشت دەبێت مەرجەکان جێبەجێ بکات لەو کاتەدا کەس ناتوانێت ڕێگری لێ بکات، بەڵام دواجار هەر دەبێت بە ئیزن و ڕێگە پێدانی سەرپەرشتیارەکەی بڕوات.

مەسەلەیەکی تری گرنگیش ئەوەیە ئەگەر ئافرەت لەشەرعدا بۆ ماڵی الله تعالی کە مزگەوتە و بە هەموو پیرۆزییەوە، ئەو هەموو مەرجەیبۆ ئافرەت لەسەر دانراوە و دواجاریش نەڕۆیشتنی باشتر بێت، ئایا بۆ جێگەی تر کە سەرەڕای ئەوەی بە هۆکاری وانە خوێندن و کاری ئیسلامی و بانگەواز و زۆر هۆکاری تر دەردەچێت و تێکەڵی پیاوان دەبێت و تووشی فیتنەی دەکات و هەندێ جار سروشتی ئیشە (ئیسلامییەکەی) وایە دەبێت لەگەڵ پیاواندا بێت، یان چەندین سەرپێچی شەرعی تر ڕەنگە لە خۆ بگرێت، ئایا حوکمی ئەوە چی بێت جگە لەوەی ئەویش نەڕۆیشتنی باشتر بێت، ئەمە ئەگەر حەرامیش نەبێت، چونکە لە ئیسلامدا جگە لەوەی دەبێت کارەکە خۆی موافیقی شەرع بێت، هاوکات دەبێت ئەو هۆکارەش کە پێی ئەنجام دەرێت شەرعی بێت و ئەو ڕێگەو جێگەش کە ئەو عیبادەتە یان ئەو کارە ئیسلامییەی تێدا ئەنجام دەدرێت پێویستە ئەویش هەر شەرعی بێت و پێچەوانەی حوکمەکانی قورئان و سوننەت نەبێت.

# پەیامی سی و پێنج: پەیامێك بۆ كچان لە پەیمانگا و زانكۆكان

١- مەبەست لەو كچەی ئەم پەیامەی ئاراستە دكرێت، كچێكە كە ئیسلامی وەكو بەرنامەی ژیان وەرگرتووە ودڵی بە دینەكەی خۆشەو شاناز پێوە دەكات و وەكو مەسەلەیكی تەفلیدی و لاوەكی نەیگرتووە، بەڵكو بڕیاری داوە پەیڕەوی بكات و بیكاتە بەبەرنامەی ژیانی هۆی و هەموو بەرنامەیەكی تری بەلاوە ڕەتكراو بێت جگە لەبەرنامەی قورئان، مەبەستیشی بێت هەموو ژیانی لەسەری بەڕێوە ببات و هەر بەو شێوەش ئەم دونیا بەجێبهێڵێت.

٢- خوشكی بەڕێز كچی ئازیز: دەبێت بزانیت زانكۆی ئەم ڕۆژگارە، نەك تەنها لە كوردستاندا، بەڵكو لە هەموو وڵاتێكدا و لە زۆربەی شوێنەكانی دونیادا، كەشێكی نالەبار و نەگونجاوە بۆ كەسی دیندار، هیچ شتێك نابینیت لەو كەشەدا یارمەتیدەر بێت بۆ پاراستنی دینەكەت، حەرام وقەدەغەكراوی شەرعی چواردەورەی داوی وكەس نكۆڵی لێ ناكات، دەوامی زانكۆ بۆ كەسی موسوڵمان ئەگەر بە شێوەیەكی راستەقینە دەستی بە دینەكەی گرتبێت و وەكو زۆرینە هەر بەڕیكردن نەبێت،وەكو ئەوەیە لە ڕوبارێكدا بە پێچەوانەی ئاراستەی ئاوەكە مەلە بكەیت و بتەوێت بەو حاڵەوە بگەیتە كەناری دڵنیاییی، یان كورد واتەنی بۆ ئەوەی لە زانكۆدا دینەكەت بپارێزیت، دەبێت بە پێچەاونەی ئاراستەی با شەن بكەیت.

ئەمەش مەعنای ئەوە نییە کە زانکۆ جێگای کەسی موسوڵمانی تێدا نابێتەوە نەخێر، هێشتا بوار ماوە بۆ ئەوەی کەسی مولتەزیم و وابەستە بوو بە دینەکەی تێیدا بمێنیتەوە، بەلام دینداری لە زانکۆدا کارێك قورسەو باجیشی دەوێت.

٣- تۆ وەکو موسوڵمانێکی وابەستەو مولتەزیم بە دینەکەت، بۆ ئەوەی بتوانیت چوار ساڵ یان زیاتر، بە دینێکی سەلامەتەوە لێی دەربچیت، پێویستە هەڵوێستی خۆت هەر لە ڕۆژانی سەرەتاوە، بەڵکو لە یەکەم ڕۆژەوە کە پێ دەخەیتە ناو زانکۆ، یەکلا بکەیتەوە وڕازیکردنی پەروەردگارت و لانەدان لە سنوورەکانی شەرع، بکەیتە ئامانجێکی زۆر گەورەتر لە ئامانجی بەدەستهێنانی بڕوانامەکەت، بە کورتی ئەرکەکەت لە زانکۆدا گەلێك لەوە قورسترە ئەگەر لە زانکۆ نەبوویتایە.

٤- سەرەڕای ئەوەی دەزانم سەردەم وزەمانە گۆڕاوەو زۆربەی دایکان و باوکانیش بەهۆی نەشارەزاییان لە دینەکەیان و بەهۆی فشاری عەلمانییەتی هاوچەرخ و ڕاگەیاندنی نەیار لەگەڵ دین و ڕەوشتدا، گوێ بە چاودێری وردی کچەکانیان نادەن، بەڵام مادام بە تەمەنێك گەیشتوویت کە خێرو شەڕ و چاکەو خراپە بە جوانی لەیەکتر جیا دەکەیتەوە، دەبێت خۆت ببیتە چاودێرێکی ڕاستگۆ و سەرڕاست و دەستپاك بەسەر خۆتەوە وهەرکات هەنگاوێکی هەڵەت هەڵگرت خێرا بگەڕێیتەوەو شەریعەت بکەیت بە فەرمانڕەوا بەسەر ژیانی خۆتدا.

دەبێت بڕیاری کۆتایی بدەیت ئایا تۆیش دەبیتە یەکێك وەکو ئەو هەموو بەناو موسوڵمانانەی کە ئیسلام هیچ ڕەنگدانەوەیەکی لە ژیانیاندا نییە وتەنها ناوێکی ساردوسڕە هەڵیان گرتووە؟ یان خۆت جیا دەکەیتەوە بە دین و عەقیدەکەت، بە ڕەوشتە جوانەکەت، بە دابڕان و بەشداری نەکردن لە هەموو شتێك کە توڕەیی پەروەردگاری لێ بکەویێتەوە؟

٥- زانکۆ گۆڕەپانێکی بەرینە بۆ تۆڕەکانی شەیتان کە ڕۆڵی لەخشتەبردنی تێدا دەگێڕێت، مرۆڤی هاوشێوەی شەیتانیش لەوێ زۆر دەبینێت کە تاوانەکانت بۆ دەڕازێننەوەو فریوت دەدەن، بەهانەکان بۆ دەست نەگرتن بە دینەکەت گەلێك زۆرن! لەوێ ناوی تاوانەکان دەگۆڕن و ناوی جوان و سەردەمیانەیان لێ دەنێن! لە زانکۆ نەك هەر کەسانێك کە نەیاری دینن بەڕاشاوی هەوڵی لەخشتەبردنت دەدەن، بەڵکو هەندێ جار هەر بەناوی دینیشەوە کەسانێك لە هەندێ حیزب و ڕێکخراو، نەك لەیەك هەڵەو لادانی ئەو کەشە وریات ناکەنەوە، بەڵکو بۆیشت دەشەرعێنن و ئەڵێن دین بەو شێوە قورس نییە ، تۆ هێشتا گنج چێژ لە ژیان وەرگرە! بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەو چەواشەکارییانە، دەبێت لە ڕووی عەقیدەو مەنهەجەوە و لە ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئان و سونەتی سەحیحی پێغەمبەردا ﷺ بە تێگەیشتنی پێشینانی چاکی ئەم ئوممەتە ، خۆت پێکەوە بنەیت و کەسایەتییەکی تۆکمە و بەهێز بۆ خۆت درووست بکەیت بتوانیت بە هۆیەوە

بەرگەی ئاستەنگەکانی ناو زانکۆ بۆ دینداری بگریت و لەوەش زیاتر وگرنگتر بتوانیت ڕۆڵی کەسێکی بانگخوازو چاکسازیش ببینیت، ئەگەر تەنها بەگەیاندنی ئایەت و فەرموودەیەکیش بووە، ئەگەر بە جلە پۆشتە و ئاکارە جوان و ڕەوشتە بەرزەکەشت بووە.

٦- کەشوهەوای زانکۆ بە شێوەیەك گشتی، ڕێگرە لەوەی بە ئاسانی بە ئەرکەکانی خۆت وەکو موسوڵمانێك هەڵبسیت، تێکەڵ بوونی نێوان کچان و کوڕان، بەستنەوەی کارەکانیان پێکەوەو ناچاربوون بەوەی مامەڵە لەگەڵ یەکتر بکەن، سەفرە وگەشتوگوزارەکان بە شێوەیەکی گشتی ناشەرعییە، ئاهەنگەکانی تری وەکو یەکتر ناسین و بابەتی تر، تەنانەت ئەو جێگەش کە بتەوێت بۆ خواردن و خواردنەوەیەك ڕووی تێبکەیت پڕە لە تێکەڵ بوونی کوڕان و کچان و دەنگی گۆرانی بەبەردەوامی دەبیسترێت.

٧- بە هیچ شێوەیەك کەمتەرخەمی لە نوێژەکانتدا نەکەیت، لە زانکۆ کەسێك بیەوێت نوێژی نەڕوات ئەوە کارێکی گران نییە، دەتوانێت لەو جیگەی بۆ ئەو مەبەستە دیاری کراوە نوێژەکانی بکات، ئەگەرنا بژاردەی زۆر لەبەردەمتدا هەیە بۆ ئەنجادانی نوێژەکانت لە زانکۆ. نوێژەکانت لە ڕوناکی چاوت زیاتر خۆش بوێت، وەکو خۆشەویستمان پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (وجُعِلَتْ قرّة عيني في الصلاة).

٨- عاتیفی و خۆش باوەڕ مەبە، یەك هەنگاوی هەڵە هەڵبگریت هەموان پێت دەزانن، هەموو جولەکان لە ژێر چاودێری کامێرەکاندان، ئەوەی قسەت لەگەڵ دەکات بۆی هەیە دەنگت تۆمار بکات، وەعدەکان بۆ هەیە درۆ بن، ئارام گرتن و تەواوکردنی زانکۆ بەسەربەرزی لە پەشیمانی باشترە، لەزانکۆ دا سۆز وعاتیفە ئەگەر بە شەریعەت نەیبەستیتەوە دەبێتە دوژمنێکی سەرسەخت و زیانبەخش بۆت، بۆیە دەبێت وریای ئەو لایەنە بیت و گومانی خراپ بخەیتە پێش تاکو ئەو کاتەی بۆت دەردەکەوێت و لە نیازپاکی بەرانبەر دڵنیادەبیتەوە.

٩- یەکێك لە هۆکارەکانی خۆ پاراستن و دین پاراستن ئەوەیە نەچیتە هیچ جۆرە حیزب و لایەن و ڕێکخراوو تەوژمێکەوە، لە هەموویانەوە دووربە، لە منی وەربگرە و لە ئەزموون و شارەزاییەوە ئامۆژگاریت دەکەم، بە هیچ شێوەیك هیچ لایەنێك نییە یارمەتیدەری وابەستەبوونت بێت بەئیسلامەوە، هەمووی ئەگەر لەلایەکەوە سوودت پێ ببەخشێت لە چەند لای ترەوە لە عەقیدەو مەنهەج ئیسلام دوورت ەخەنەوە، بۆیە ئەوە بکە بڕیارێکی کۆتایی کە هیچ ئینتیمایەکت بۆ هیچ لایەنێك نەبیت. هەمیشە ئەم فەرموودە سەحیح و مەزنە بکە مەشخەڵی ڕێگای خۆت لەم ڕۆژگارەدا: (تكونُ دعاةٌ على أبوابِ جهنمَ ، مَنْ أجابَهم إليها قذفوه فيها ، هم قومٌ مِن جِلْدَتِنا ، يَتَكَلَّمُونَ بألسنتِنا ، فالزمْ جماعَةَ المسلمينَ وإمامَهم ، فإنْ لم تَكُنْ جماعَةٌ ولَا إمامٌ فاعتزِلْ تِلْكَ الفِرَقَ كُلَّها ، ولَو أنْ تَعَضَّ بأصلِ شجرَةٍ حتى يُدْرِكَكَ الموتُ وأنتَ كذلِكَ).

١٠- جل و پۆشاکەکەت نیشانەی دیاری کەسایەتیتە، تاکو پێت دەکرێت با موافیقی شەرع بێت وپان وفراوان بێت و بەشێوەیەك نەبێت سەرنجی بەرانبەر ڕابکێشێت و با ڕەنگاوڕەنگیش نەبێت.

١١- لە ژێر هیچ پەیمان و دڵنیاکردنەوەیەکدا پەیوەندی لەگەڵ هیچ کوڕێکدا مەبەستە، چونکە ئەوە کارێکی حەرامە و دەبێتە نموونەیەکی خراپیش بۆ کچی موسوڵمان و دەرەنجامەکانی ئەو جۆرە پەیوەندییانەش دیار نییە، ئەگەر کەسێك مەبەستی پێکەوە نانی خێزان بێت بەو شێوەی کە الله پێی خۆشە لە دەرگای شەرعی و ئاسایی خۆی دەدات و دەچێت لە سەرپەرشتیارەکەت داوات دەکات، ئەگینا بە هیچ شێوەیەك درووست نییە پەیوەندی نێوان و تۆ و هەر کوڕێك با هەرچەند وابەستەی دینیش بێت، ئەگەر لە ڕێگەی ڕاست و درووستی خۆیەوە نەچێت داوات بکات.

١٢- ئەگەر زانیت کەسێکی دیندار بەنیازێکی پاك و باشەوە تۆی دەوێت، با مەرجی یەکەمی تۆ لە ئەودا بریتی بێت لەوەی خاوەن عەقیدەیەك ڕاست و درووست بێت و لەسەر ئیسلامی کیتاب وسونەت بێت و بە لادانە زۆرەکانی ئەم سەردەمەوە تێوەنەگلابێت و باوەری بە هیچ لە دیاردەکانی جاهیلەییەتی ئەم سەردەمە نەبێت، جگە لەوە ئیتر گوێ بە هەژاری مەدە ڕزق لەلای الله یە ولەوانەیە دەرگاری لوتف و چاکەی خۆیتان لێ بکاتەوە، وەکو وم ناشبێت لەسەر بنەمای ئەو نیازە ئەگەر نەیکات بە کردەوە هیچ پەیوەندی و وەعددانێك هەبێت.

١٣- ئەگەر بتەوێت الله لە خۆت ڕازی بکەیت و دینداری ڕاستەقینە بکەیت، دەبێت گوێ بەوە نەدەیت کە لە دژت دەوترێت، چونکە زۆر نامۆ دردەکەویت وبەشێوەیەك لە شێوەکان دەبیتە جۆرێك لە تێکدەری میزاجی خوێندکارەکانی تر، دەبێت ئارام بگریت ئەگەر توانجت لێدرا بە گۆشەگیر و نەخۆش و نامۆ و دواکەوتوو وەسف کرایت.

١٤- دوعا کردن: پێویستە دەرگای نزاو پاڕانەوە بەکەم نەزانی و بەردەوام بە نهێنی و بە ئاشکرا داوا لە پەروەردگارت بکەیت لە هەموو فیتنەیەك بتپارێزیت و ڕێگەی هەموو چاکەیەکت پێ نیشان بدات و بۆت ئاسان بکات و لە هەموو فیتنەو خراپەیەك پارێزراوت بکات. الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾.

١٥- هاوڕێی باش: لە هۆکارەکانی نەکەوتنە ژێر کاریگەری فیتنە و خراپییەکانی زانکۆ ئەوەیە بتوانیت چەند هاوڕێیەکی کچی هاوشێوەی خۆتت هەبێت و پێکەوە یەکتر بەهێز بکەن و فەرمان بەچاکە بەیەکتر و بەوانی تر بکەن و نەهی لە خراپە بکەن و بۆ خۆتان و هاوپۆلەکانی تریش ببنە خێر و ڕێپیشاندەر. هاوڕێی ئیماندار دەبێتە خێر و پشتیوانێکی باش بۆت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا ) - وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ [1]..

---

[1] - متفق عليه

١٦- گرنگی زۆر بە خوێندنەوەی کتێبی فیقهی و عەقیدی و ژیانامەی پێغەمبەر ﷺ بدە، شارەزابوون لەو بوارانە و لە تەفسیر و کتێبەکانی فەرمووە سونەت هەم لایەنی زانستیت تۆکمە دەکەت، هەم دەبێتە پاڵپشت و پاشخانێك بۆت لە شێوەی مەشخەڵێدا ڕێگای خۆت و چوندینی تری پێ ڕوناك دەکەیتەوە، بەبێ زانستی شەرعی زۆر شتت پێ ناکرێت و بە ئاسانیش دەگونجێت بکەویتە داوی خراپەکارانەوە.

١٧- بەشداری نەکردن لە هەموو بۆنە و سەفرەو ئاهەنگێك کە سنووری شەرعی تێدا ناپارێزرێت، بێگومان زۆربەی چالاکییەکانیش لە زانکۆ ئەستەمە بتوانرێت سنووری شەرعی تێدا بپارێزرێت.

١٨- وەکو کچێکی وابەستە بە ئیسلام، زۆر گرنگە لە وانەکانتدا زیرەك بیت بەشەکەت و مامۆستاکانت لێت ڕاز بن ، زیرەکی و گوێڕایەڵی و لەسەرخۆییت دەبێتە بەشێك لە کەسایەتی ئیسلامیت کە ئەوەش جۆرێکە لە بانگەواز بۆ دینەکەیت لە ڕیگەی کەسایەتی خۆتەوە، بە پێچەوانەشەوە تەمەڵی و شپرزەیی ئیشوکاری کەسی مولتەزیم بە دینەوە، دەبێتە سیفەتێکی ناپەسەند و بەهانەیەك بۆ درووست کردنی کاریگەری خراپ و قسە کردن لە دژی دیندارەکان.

١٩- نابێت هاوڕێتی خوێندکاری کوڕ بکەیت و تەنانەت ئەگەر ناچار نەبیت، نابێت ڕێگە بدەیتە خۆت بۆ پرسیاری وانەکان و ئامادەکردنی سیمینار و ئیشی لەو شێوەش پەیوەندی بە خوێندکاری کوڕەوە بکەیت، چونکە ئەو کوڕە دواجار بۆ تۆ نامەحرەمە و مامەڵە کردنتان پێکەوە دەخوازێت تەماشای یەکتر بکەن و لەیەکتر نزیك ببنەوە وئەوەش سەرەتای ئاساییبوونەوەی تاوانە و دەستپێکی لادانە لە ڕێگەی ڕاست. ئەوەی کە لە زانکۆکاندا دەبینرێت ئەمڕۆ کە کچان و کوڕان هاوڕێتی پێکەوە دەبەستن و پێکەوە دەبن ئەوە جۆرێکە لەوەی الله تعالى نەهی لێ کردووە لە قورئادا و فەرموویەتی: ﴿وَلاَ مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾ جۆرێکیشە لە گوێڕایەڵی کردنی شەیتان و هەنگاوهەڵگرتن لەسەر ڕێگای شەیتان، الله تعالى فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ﴾

٢٠- لە کاتی مامەڵە کردن لە گەڵ خوێندکاران و مامۆستاکاندا، هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت کە تۆ شەرعێکت هەیە دەبی وابەستەی بێت، لەبیرت بێت کە الله فەرموویەتی: ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾بۆیە درووست نییە نە لەگەڵ مامۆستا و نەلەگەڵ هاوپۆلە کوڕەکاندا ئەگەر بۆ پێویستییەك قسەت کرد بەزۆری و وەکو مەسەلەیەکی ئاسایی تەماشای یەکتر بکەن.

# پەیامی سی و شەش:
# پێوەرەکانی مامەڵە کردن لەگەڵ خەو بینین و تەفسیرەکەیدا

لە ناو بەشێك لە ئافرەتاندا گرنگی زۆر و لە ڕادە بەدەر بە مەسەلەی خەو بینین دەدرێت، لێکدانەوەو تەفسیری خەویش بەداخەوە لەناو موسوڵمانان‌دا بە پێوەری شەرعی خۆی مامەلەی لەگەڵدا ناکرێت و ئەویش هاوشێوەی مەسەلەی حەسوددی و جنۆکە لە سنووری شەرعی خۆی دەرکراوەو هەندێ کەس لە ڕێگەی قۆستنەوەی هەلی لاوازی ئافرەتان و عاتیفی بوونیان، خراپ کەڵك لەو پرسە وەردەگرن و لە خۆیانەوە جۆرەها قسەو لێکدانەوەی بێ بەڵگە دەکەن ودەبنە مایەی دڵەراوێی و تووش بوونی هەڵە. باشترە کە خەوێکتان بینی ئەم چەند ڕاستییە بزانن:

- نابێت زۆر بایەخ بە خەو بدەن و خۆتانی پێوە سەرقاڵ بکەن، چونکە ئەوە وەکو زانایان فەرموویانە دەبێتە ڕێگەیەك بۆ شەیتان وەسوەسە و بیرۆکەی ترسناك و بێ بنەمای بۆ ئەو کەسە درووست دەکات کە خەوەکەی بینیوە، بەتایبەتیش ئەگەر ئافرەت بێت.

١ - خەو سێ جۆرە: جۆرێکیان کە خاوەنەکەی خەمبار دەکات ئەوە لە شەیتانەوەیە. بۆیە بەهەر خەوێك بێ تاقەت و دڵگران بوویت ئەوە لەشەیتانەوەیە و سێ جار بەلای چەپدا تف بکە و بڵێ أعوذ بالله من شر الشيطان ومن شر ما رأيت وبۆ کەسی باس نەکات، نەك بەدوای تەفسیر و موعەبیری خەودا بگەڕێیت.

بەشی دووەم: وەکو باسمان کرد قسەی دڵ ودروونی خۆتە، ئەوەیە کە لە ڕابردوودا ڕوویداوە، یان ئەوەی کە دەتەوێت لە داهاتوودا ڕوو بدات یان ئەوەی کە دەترسیت ڕووبدات.

بەشی سێیەمیش: مەعنای هەیە و ڕاستە و لو جۆرەیە کە بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

٢- هەموو خەوێك مەرج نییە ڕاست و مەعنادار بێت، خەو هەیە وەسفی (أضغاث أحلام)ی لەسەر جێبەجێ دەبێت هیچ مەعناو تەفسیرێکی نییە، نابێت بینەرەکەشی بەدوای تەفسیرەکەیدا بگەڕێت. زۆرێکیش لە خەوەکان داڵغەو خەیاڵی خودی کەسەکە یان باس و یادگاری کۆنی خۆیەتی و جۆریکە لە گێڕانەوە وبەبیرداهاتنی ڕووداوە کۆنەکان لە خەودا.

٣ - ئەمڕۆ لێکدانەوەی خەو بووەتە گۆڕەپانێك بۆ بەدەست هێنانی پارەو ناوبانگ دەرکردن و کڵاو خستنە سەر داماو وفەقیر حاڵەکان، بۆیە زۆر وریای ئەوانە بن کە پسپۆڕییان بووەتە تەفسیر و لێکدانەوەی خەو، ئەڵبەتە خەڵکانی باش و بێ نیازی خراپیش لەو بوارەدا هەیە بەڵام کەمن.

٤- پێم باش نییە بۆ زانینی واتای خەو بچیتە لای ئەوانەی بەو پیشەوە ناسراون و لە تەفسیری هیچ خەوێك سڵ ناکەنەوە و سێ و دووی لێ ناکەن، بەڵام ئەگەر هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی خەوەکەتان بۆ کەسێك باس بکەن، دەبێت ئەو کەسە دڵسۆز بێت و خاون عەقیدەیەکی ڕاست و درووستی ئەهلی سوننەت بێت و خاوەنی عیلمی شەرعی بێت و بازرگانی نەکات بە تەفسیری خەو، یان لە کەنالی ڕاگەیاندن و یوتیوب و تۆڕە کۆمەڵأیەتییەکان خۆی نمایش بکات و سنگی دەرپەڕاندبێت و پێشوازی هەمووی خەوێ بکات و هەموویشی تەفسیر بکات.

٥ - کەس ناتوانێت بەیەقین بیبڕێتەوە کە ئەم خەوە ڕاستە و لای الله یە و لەو جۆرەیە کە بەشێکە لە چل و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا نەماوە و وەحی دانابەزێت و دوا جار هەرکێ خەو تەفسیر بکات قسەکەی جێگای گومانە ومەرج نییە تەفسیرەکەی ڕاست بێت.

٦ - ئەو کەسەی تەفسیری بۆ خەو بایەخی پێبدرێت دەبێت شارەزای کیتاب و سونەت بێت، هەروەها شارەزای زمانی عەرەبیش بێت، ئەو سێ مەرجە بنەمای کاری تەفسیرکردنی خەوەو سەرەڕای ئەوەش لێکدانەوەکەی هەر یەقین نابەخشێت.

٧ - لەناو کوردا جۆرێك لە لێکدانەوەی خەو سەریهەڵداوە موعەبیرەکە چی خەوێکی بۆ بگێڕیتەوە تەفسیرەکەی بەلای جن و حەسەد و چاودا دەبات، دوای ئەوەی خەوەکەت بۆ گێڕایەوە چەند پرسیارێکت لێ دەکات و بدوایدا حوکمەکەی دەردەکات کە تۆ چاوت لێ دراوە، یان جنۆکەیەك چووتە لاشەتەوەو و بەچەندەها جەلسە ئەو لە داهاتوودا هەوڵی دەرکردنی ئەو جنۆکەیە لەلاشەی ئەو داماوە دەدات. ئەمەش پێ دەوترێت زێدەڕەوی و قسەی بێ بەڵگە و هەندێ لەوانەش بەرژەوەندییان هەیە لەو جۆرە تەفسیرکردنەدا و ئەو داماوانە دەکەن بە مەعمیلی خۆیان چونکە دوای ئەوە قۆناغی ڕوقیە و تۆقاندن و پارە پێ دەرکردنیان دەست پێ دەکات.

لە ڕاستیدا بینینی خەوی خۆش وباش، دڵخۆشکەرە وهاندەرە بۆ کردەوەی چاکە، بەڵام هەر خەوێك فەرمانێکی تێدا بوو بۆ ئەنجامدانی کارێك، یان پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ کەسێك، یان لاواز کردن و تصحيح کردنی فەرموودەیەك، یان تۆمەتبارکردنی کەسێك بە تۆمەتێکی دیارکراو، یان زانیارییەکی تێدا بوو

دەربارەی ژیانی ڕۆژانەت، هیچ حوكمێكی شەرعی پێ جێگیر ناكرێت وئاوڕی لێ نادریتەوە.

بۆ نموونە كەسێك لە خەویدا بینی پیاوچاكێك یان تەنانەت خودی پێغەمبەر ﷺ خۆی هاتە خەوی و پێی وت: هاوسەرەكەت كەسێكی باش نییەو لێی جیا بەرەوە، یان وریایی پێت دا دەربارەی هەر كەسێك كە لێی دوربكەویتەوە، بە هیچ شێوەیەك نابێت وا بكەیت، چونكە ئەهلی عیلم لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە: (الرؤيا المنامية لا يثبت بها حكم شرعي) واتە: ئەوەی لە خەودا دەیبینی هیچ حوكمێكی پێ جێگیر نابێت.

پێشەوا النووي فەرموویەتی: (لو كانت ليلة الثلاثين من شعبان ولم ير الناس الهلال، فرأى إنسان النبي ﷺ في المنام فقال له: الليلة أول رمضان لم يصح الصوم بهذا المنام، لا لصاحب المنام ولا لغيره).واتە: ئەگەر شەوی سی شەعبان بوو كەسیش مانگی نەبینیبوو، كەسێك پێغەمبەری ﷺ بینی لە خەودا و پێی وت: سبەینێ یەكەم ڕۆژی ڕەمەزانە، ئەو خەوە ئیشی پێ ناكرێت.

(رؤيا) لە فەرموودەیەكی بوخاریدا هاتووە لە لایەن الله سەرچاوە دەگرێت و (حلم) لە شەیتانەوەیە، بەڵام روئیایش تەنها دڵخۆشكەرەو هەرگیز حوكمی شەرعی پێ دیاری ناكرێت، لەفەرمودەیەكدا لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە:

(لم يبق من النبوة إلا المبشرات، قالوا وما المبشرات، قال: الرؤيا الصالحة. وفي رواية أنه لم يبق من مبشرات النبوة إلا الرؤيا الصالحة يراها المسلم أو ترى له)

واته بە (مبشرات) ناوی بردووە کە تەنها دڵخۆشکەرە وموژدەبەخشە.

لەوانەشە هەندێ خەو وریاییکردنەوەی تێدا بێت بۆ کەسی تاوانبار ولاڕێ، ئەوە پێویستە لە تاوانەکەی بگەڕێتەوە و پەند وەربگرێت، بەڵام هەرچی خەوێك پەیوەندی بە حوکمدان بوو بەسەر کەسەکانەوە لە ڕووی باشی وخراپی و دوورونزیکی لە الله تعالى ، یان حوکمێکی دونیایی تێدا بوو وەکو ئەوەی بەپێی خەوێك وابزانیت شتە دزراوەکەت فڵانەکەس دزیویێتی، یان نهێنییەکی دیاری کراو دەربخات بەهیچ شێوەیەك پشتی پێ نابەسترێت.

پوختەی باسەکەم ئەوەیە:

- خەو بە هیچ شێوەیەك سەرچاوەیەك نییە بۆ شەرع و حوکمی شەرعی.

- خەو سوننەتێکی پێ جێگیر نابێت کە لەشەرعدا نەبێت و بە پێچەوانەشەوە.

- ئەوەی لەشەرع و فەتوای زانایاندا جێگیر بووە خەوی هیچ کەسێك نایگۆڕێت و ئەگەر ئەو کەسەش لەخەوەکەدا وتبێتی خودی پیغەمبەر بێت ﷺ .

- خەو دڵخۆشکەرە و لەوانەشە وریاکەرەوە بێت بۆ خاوەنەکەی لە تاوان و سەرپێچی.

- هیچ مەسەلەیەکی بنچینەیی دین یان دونیا لەسەر بنەمای خەو یەکلا نابێتەوەو وپشتی پێ نابەسترێت، چونکە شەرعی الله هەموو وردەکارییەکی تێدایە و خەو یەکێك نییە لەسەرچاوەکانی.

- ئەگەر موسوڵمان هەر خەوێکی ناخۆشی بینی ئەوەندە بەسە پەنا بگرێتە پەروەردگاری وەکو لەم فەرمودەدا لە سەحیحی موسلیم هاتووە (فمن رأى رؤيا فكره منها شيئا فلينفث عن يساره ، وليتعوذ بالله من الشيطان ، لا تضره ، ولا يخبر بها أحداً) واتە: تەنها ئەوەندەی لەسەرە کە باسی نەکات و لە شە ڕی شە یتان پەنا بگرێتە الله تعالى و سێ جار بەلای چەپی خۆیدا تف بکات (بەبێ ئەوە تەڕی تێدا بێت تفەکەی) ئیتر هیچ زیانێکی لەو خەوە پێ ناگات إن شاء الله.

# پەیامی سی و حەوت:
# لە هەڵبژاردنی هاوسەردا عەقیدە با مەرجی یەکەمت بێت

ئەگەر لە نێو هۆکارەکانی پەسەند کردن و هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانتدا دینداری لە چڵەپۆپەدا بێت کە بۆ موسوڵمان هەر دەبێت واش بێت، ئەوا لە مەسەلەی خودی دینداریدا ڕەچاو کردنی ڕاست و درووستی عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامی دووبارە دەبێت لە چڵەپۆپەو مەرجی هەرە بایەخ پێ دراوی گەنجاندا بێت، ئەگەر مەبەستیان بێت خێزانێکی سەربەرز و سەرکەوتوو ی موسوڵمان پێك بهێنن، هەروەها بۆ ئەوانەش کە لەبەر هەر هۆکارێك بێت هاوسەرگیری دووەم و زیاتریش دەکەن، مادام موسوڵمانی وابەستە بن بە شەرع و دینداریيەوە، پێویستە پێش هەموو شتێك لە عەقیدەی هاوسەری دوا ڕۆژیان بکۆڵنەوە و ئەوجا بڕیاڕی خوازبێنی کردنی بدەن، لە ڕاستیدا ئەگەر تۆ کەسێکی خاوەن عەقیدەیەکی پاکت کرد بە هاوسەری خۆت بەتایبەتی ئەگەر عەقیدەکەی ڕەنگدانەوەی لەسەر ڕەوشت و ئاکار و مامەڵەو دینداریيەکەی هەبێت، ئەوە تووشی خێرو چاکەیەکی زۆر مەزن بوویتە و بنەمای خێزانیکی موسوڵمانی وابەستەبووت بە ئیسلامەوە دامەزراندووە، ئەگەر لێرەشدا وەکو ئاماژەی خێرایش بێت پێویستە بوترێت کۆمەڵە خاڵێك هەن دەبێت سەبارەت بەم پرسە ڕەچاو بکرێن، لەوانە:

١- ئەو هاوسەرەی هەڵیدەبژێریت لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بێت، چونکە لە ڕاستیدا تەنها ئەو ڕێبازە ڕاستە ودەستەبەری لە خشتە نەچوونە، ئەوەش بە هۆی ئەوەی ڕێبازێکە وابەستەی قورئان و سوننەتە بە تێگەیشتنی پێشینانی ئوممەت، جگە لەوان هەموو گروپ وتاقمەکانی تر لە مێژووی دێرینی ئیسلام و هەروەها شوێنکەوتوانیان لە هاوچەرخەکانیش لە ڕێگای ڕاست لایانداوە، جا هەیانە لە عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلام زۆر دوور کەوتووەتەوە، هەندێکیشیان بەراورد بەوان نزیکترن، بەڵام لە هەندێ مەسائیلی ئەسمائو سیفات و چەند پرسێکی دیکەی وەکو پێناسەی ئیمان لایانداوە، هەردوو جۆرەکەش دواجار هەر لایانداوە ولادەرن، بەڵام ڕێژەی لادانەکانیان جیاوازی تێدایە.

٢- پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێت، ئەو هاوسەرەی هەڵی دەبژێرت، بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەگەر بە ناراستەوخۆ و بە شێوەیەکی دەمامکداریش بووە، سەر بە هیچ تاقم و گروپێك نەبێت لەوانەی کە لە ئیسلام لایانداوە بە بیانووی قبوڵکردنی ڕاجیایی کە دواجار سەر لە قبوڵکردنی هەموو شتێکەوە دەردەکات و و بە کارخستنی عەقڵ بۆ لێکدانەوەی دەقەکان کە زۆر جار بەو بیانووەوە عەقڵ دەکرێتە دەسەڵاتدار بەسەر دەقەکاندا و یان بە بیانووی توند دەستگرتن بە شەریعەتی ئیسلامەوە کە ئەویش سەر لەوە دەردەکات کەسەکە خۆی لە خاوەن دینەکە بەغیرەتتر بزانێت لەسەر دینەکە! با لەوەش دڵنیا بێت ئەمڕۆ کەسانی سەر

بە هەموو فیرقەو تاقمە گومڕاکانی مێژووی ئیسلامی لە ناوماندا بوونیان هەیە، بۆیە هەر لە ناو موسوڵمانانداو هەر لەو مزگەوتانەی کە هەموان نوێژی تێدا دەکەن، پێت سەیر نەبێت کەسانی موعتەزیلە و مورجیئە و ئەشعەری و خەواریجی تێدا هەبێت، بەڵام تەنها ئەوەیە بە مەبەستی لابردنی ئیحراج و هەستیاری تەنها ناوە کۆنەکانیان گۆڕاوە بۆ هەندێ ناوی پەسەند کە ئەویش جۆرێکە لە خۆڵ لە چاوکردن.

٣ _ ئەڵبەتە جگە لەوانەی سەرەوەش شێوازو ڕێبازی جۆراو جۆری تریش هەیە کە لەسەر ئەفسانە و پشت بەستن بە بیدعەو جۆرەها عەقیدەی لارو وخواری تر درووست بوونە و بوونیان هەیە و هەمووشیان بە تێکڕا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە حەق لای ئەوانە و ئەوانی تر نەیانپێکاوە، بەڵام لە میهرەبانی پەروەردگار بە بەندەکانی ئەوەیە دوو سەرچاوەی سازگاری وەکو پێوەر بۆ دیاری کردووین، پێویستە هەموو بانگەشەیەك لە رووناکی ئەو دوو سەرچاوەدا حوکمی لەسەر بدرێت.

٤- هەروەها لە کاتی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانتدا پێویستە وریای ئەوە بیت ئەمڕۆ بانگەشە و قسەی زل و دروشمی گەورە گەورە لە گۆڕەپاندا زۆر بووە وەدەخرێنە ڕوو، بەڵام بەداخەوە زۆرێکی وا نییە و ئەگەر لە گەڵ قورئان و سوننەتدا بەراورد بکرێن پووچی و ئەندازەی لادانیان لە ڕێگای ڕاست ئاشکرا دەبێت، بۆیە هەرگیز بە دروشمەکان فریو مەخۆن، بەڵکو لەسەر ڕواڵەت و دیاردەکانیش بڕیار مەدەن، نە حیجاب و نە نیقاب و نەڕیش و قسە و نە شیعاراتی زل مەرج نییە پێوەری باشی و ڕاست و درووستی عەقیدەی کەسەکە بێت، بەڵکو پێویستە لە ڕێگەی هەندێ پرسیارەوە حەقیقەتی کەسەکەت بۆ دربکەوێت و بزانیت چۆن لە عەقیدەی ئیسلامی تێگەیشتووە و ئایا بەڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆ بەشێك نییە لەو فیرقەو تاقمانەی ئاماژەمان بۆ کرد کە لە عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی لایانداوە.

٥_ مەسەلەیەکی تری زۆر گرنگیش هەیە لەم بارەوە ئەویش ئەوەیە ئەمڕۆ لە کورستاندا جۆرێک لە تێکەڵ کردن و تێکەڵبوونی چەمکەکان لە لای خەڵکی ڕووی داوە، واتە دەگونجێت عەقیدەو بیروباوەڕی کەسێک لە زۆر ڕووەوە تەواو بێت و بەپێی قورئان و سونەت بێت، بەڵام بۆ نموونە لە ڕووی ولائوبەرائەوە وێران بێت، یان بە شێوەی نەزەری و بە قسەکردن عەیبی نەبێت، هاوکات بە کردار تا بیناقاقای کەوتبێتە پێچەوانەی قسەکانی خۆیەوە، هەروەها بەلاتەوە سەیر نەبێت لە ناو کورددا کەسانێك لە زۆر لە وردەکاری عەقیدەدا باش بن و لەولاشەوە

لەگەڵ عەلمانییەت و عەلمانییەکاندا ژێراوژێر و هەندێ جار بەڕۆژی ڕوناکیش پەیوەندی تۆکمە و کارکردنی هاوبەش و پارەوەرگرتنیان لەگەڵیاندا هەبێت، کەواتە لەمەسەلەی عەقیدەدا مەسەلەکە وردبوونەوە و زانستی شەرعی و ڕاوێژی ی زۆری دەوێت بەرلەوەی بەکەسێك بلێیت عەقیدەکەی پاکە و تەوحیدی تەواوە. ئەوەش زیاتر بە پرسیارو لێ وردبوونەوە دەردەکەوێت.

٦ - گرنگە و زۆریش گرنگە لە مەسەلەی عەقیدەدا لەوە دڵنیابیتەوە کە ئەو کەسەی دەیکەیتە هاوسەری خۆت، یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی تێدا نەبێت، یان ئەگەر تێیدا بێت تێبگەیەنرێت و قابیلی چاك بوونەوە بێت، چونکە ئەمڕۆ لە سایەی عەولەمەو جەهل و تێنەگەیشتنی موسولمانان لە دینەکەیان وبە هۆی زۆربوونی پێشەوایانی گومڕایی و سەرکردەو لایەنگەلێکی زۆر کە بە کردار و هەر بە ناو دینی ئیسلامیشەوە خەڵکی لە عەقیدەی ئیسلام دووردەخەنەوە و بۆ گومڕایی و کاریگەر بون بە عەلمانیەت بانگهێشت دەکەن، هەروەها بە هۆکاری زالبوونی دەسەلات وفیکری عەلمانیەت و لیبرالیەت بە سەر تەواوی موسوڵمانان‌اندا بە زۆرێك لەوانەشەوە کە گوایە بانگەواز بۆ ئیسلام دەکەن! بەو هۆکارانەوە زۆرێك لەو هەڵوەشێنەرەوانە (نواقض الاسلام) ئەنجام دەدرێت و وەکو پێشتریش ئاماژەم پێ کرد، نەك کەسەکە وا نازانێت کێشەیەك بۆ دین و ئیمانی درووست بووە، بەڵکو هەست دەکات خزمەتی دینەکەشی دەکات و مەسەلەکان بە ڕێرەوی ئاسایی خۆیاندا دەڕۆن!

٧ـ نوێزو ڕۆژوو و حەج و عومرە وخێرو بەخشین وچاکەکانی تر هەمووی کردارگەلێکی باشن و ڕێگای چوونە بەهەشتن، بەڵام بە مەرجێک عەقیدە و ئیمان و بیروباوەڕی خاوەنەکەی بە پێی قورئان وسوننەت بێت ولای نەدابێت و موەحید بێت و هیچ جۆرە شیرکێکی لە ئولوهیەت و روبوبیەت و ئەسمائو سیفاتەکانی الله تعالی ئەنجام نەدابێت، ئەگینا ئەگەر بەردەوام سەری لە سەجدە بێت و بە قورسایی چیایەک ئاڵتوون ببەخشێت بە هەزاران، هیچ سوودێکی بۆی نابێت، الله تعالی فەرموویەتی ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾.

٨- بەلای کەمەوە ئەبێت ئەو کەسە لە ئەرکانی ئیمان و ئەرکانی ئیسلام و جۆرەکانی تەوحید و شیرك و مەرجەکانی لا إله إلا الله و نواقض الاسلام و مەسەلەی الولاء و البراء و ترسناکی حوکم نەکردن بە شەریعەت و بە قورئان و سوننەت تێگەیشتبێت بۆ ئەوەی ئەوە لەسەری واجبە لە عەقیدەدا - ئەگەر لە دڵی خۆیشیدا بووە، یان لە بازنەی نزیکی خێزان و خزمانیدا بووە - ئەنجامی بدات و هەروەها بۆ ئەوەی ئەوەش کە هێڵی سوورە خۆی لێ بپارێزێت، ئەگەر یش توانای زانستی بەو شێوە نەبێت لەو پرسانە بکۆڵێتەوە و تێبگات، لەو حاڵەتەدا گرنگە تەنها لەوەی دڵنیا بێت بە شێوەیەکی گشتی بە هەموو حوکمێکی قورئان و سونەت رازییە و ئامادەیە جێبەجێی بکات و کاریگەری شێوازە جیاجیاکانی

ئیسلامەتی هاوچەرخی ئەم ڕۆژگارەی بەسەرەوە نەبێت کە بانگەشە و موژدە بە ئیسلامێکی سەردەمیانە و دەستکاری کراو دەکەن کە ڕۆژ لە ڕۆژ لە جیاتی ئەوەی لە کیتاب و سوننەتەوە نزیك بێتەوە، دەبینی لە دیدو بۆچوون وهزری عەلمانیەت و لیبرالیەتەوە نزیك دەبێتەوە و هەر ڕۆژێك بە بیانوویەکەوە بنەمایەك لە بنەماکانی ئیسلام دەڕمێنن و لەبەر چاو موسوڵمانان ناشیرینی دەکەن.

٩- بێگومان ئەمەش کە خستمە روو بەو واتایە نایەت کە ئەگەر کەسێك عەقیدەو بیروباوەڕی باش بوو، ئیتر لە ڕووی لایەنەکانی تری ئاکار وکەسایەتی و کۆمەڵایەتی و دەروونی ودارایی گرنگی و بایەخی پێ نەدرێت، بەڵکو مەبەستمان تەنها جەختکردنەوەیە بە پلەی یەکەم لە سەر مەسەلەی بیروباوەڕ و بایەخ پێدانی پێویست بەو لایەنەی کە الله تعالى هەموو پێغەمبەرانی عليهم السلام بۆ ڕاستکردنەوەو چەسپاندنی ئەو لایەنە ڕەوانە کردووە و، هەبوونی عەقیدەیەکی ڕاست بۆ موسوڵمان وەکو هەبوونی بنچینەیەکی تۆکمەیە بۆ تەلارێکی جوان و تۆکمە، نەبوونیشی وەکو نەبوونی ئەو بنچینەیە کە دوا جار تەلارێکی فشۆڵ و لاوازی لێ دەردەچێت کە بەرگەی هیچ باو بارانێك ناگرێت!

١٠- بەڵام زۆر جار ڕوو دەدات یەکێك لە هاوسەرەکان وەکو دەوترێت عەوامە، یان نەخوێندەرواره و ئەو شتانە هەر نازانێت، لەڕاستیدا ئەو کەسانە سەبارەت بە عەقیدە باوەڕیان بە بنەما سەرەکییەکانی ئیمان و ئیسلام هەبێت و مەرجەکانی تری وەکو ئاکاری جوان و نوێژ و عیبادەتەکانی تر ئەنجام بدەن، ئەوە هیچ عەیبێکی نییە و گرنگ ئەوەیە تووشی ئەو لادان و لە خشتەچوونە سەردەمیانە نەبووبێت سەبارەت بە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت وبەلایەنە گومڕاو گومڕاکەران سەرسام نەبێت و وا بزانێت ئەوان بەرجەستەکاری ئیسلامی ڕاستەقینەن، ئیتر ئەو جۆرە کەسانە داواکراو نییە لێیان ئەو هەموو شارەزاییەیان لە عەقیدەدا هەبێت چونکە ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾، گرنگ ئەوەیە لە بیروبۆچوونە نامۆ و دژوارەکان لە گەڵ عەقیدەدا پارێزراو بن.

١١- هەروەها لایەنەکانی ڕەوشت جوانی و جوانی ڕوخسار و ڕواڵەت و کەسایەتی ئەو هاوسەرەو تێگەیشتن و لێهاتوویی و ڕێزگرتنی لە ژیانی هاوسەرگیری و بنەماڵەو شێوازی مامەڵە و توانای قسەکردن و بەڕێوەبردنی ماڵ، هەمووی بەبێ زیادەڕەوی پێویستە گرنگی پێ بدرێت و هاوکات مەسەلەی کەفائەتیش واتە هاوتابوونی هەر دوو هاوسەر لەو سیفاتانەدا ئەگەر بە شێوەیەکی تەقریبیش بێت پێویستە، بۆ نموونە یەکێکیان زۆر دەوڵەمەند نەبێت ئەویتریان زۆر هەژار بێت، یان یەکێکیان بڕوانامەی زۆر بەرزی هەبێت و ئەوی تر هیچ بڕوانامەیەکی نەبێت و شتی لەو جۆرە، دەڵێم باشترە - نەك بەمەرج گیرابێت- جۆرێك لە نزیکی و هاوتابوون لە نێوانیاندا هەبێت، هەندێ جاریش ئەو هاوتابوونە لە نێوان هاوسەراندا بوونی نییە و لەگەڵ ئەوەشدا ژیانێکی بەختەوەر و بێ کێشە پێکەوە بەسەر دەبەن ، هەموو ئەو مەرجانەش کە باس کران جگە لە مەرجی ڕاست و درووستی عەقیدە وڕەوشت جوانی قابیلی سازشە و بە پێی کەسەکان دەگۆڕێت و گرنگ ڕێککەوتنی هەر دوو لایە.

# پەیامی سی و هەشت: با ناوی منداڵەکانتان موسوڵمانانە بێت

له گەرمەی لێشاوی کاریگەرییە خراپەکانی عەولەمە و بریق وباقی شارستانییەتی مادی ڕۆژئاوادا، خەڵکی بابەتە جێگیرو جەوهەرییەکانی دینەکەیان خەریکە لەبیر دەکەن و بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، کەوتوونەتە ژێر کاریگەری عەلمانیەت و عەولەمە و ڕاگەیاندنی نەیارەکانی دینەکەیان و ئەوان ئاراستەیان دەکەن.

بەداخەوە دەرهاوێشتەکانی جیهانگیری بەرەو تێکدانی فیترەتی خەڵکی لە برەودایە، یەکێکیش لە دیاردەکانی ئەو تێکچوون و شێوانەش ئەوەیە، موسوڵمانان لە جیاتی ئەوەی ناوی پێغەمبەران وهاوەڵان و ناوی جوانی ناو قورئان و شارستانی ئیسلامی لە منالەکانیان بنێن، بە هەموو لایەکدا وێڵن بەدوای ناوی نامۆ و سەیر و سەمەرە و بێ مەعنا بۆ منداڵەکانیان.

نامۆیی و نوێی بوونی ناو بووەتە خولیا وخواستی دایکان و باوکان و بەو شێوە دەیانەوێت خۆشەویستی خۆیان بۆ جگەر گۆشەکانیان بسەلمێنین، گرنگ ئەوەیە بەلایانەوە ناوەکە نامۆ و سەرنج ڕاکێش بێت و زەنگ و ئاوازی وشەکە سەرنج ڕاێش و خۆش بێت و لەوەش گرنگتر ئەوەیە کەم کەس ئەو ناوەی لێنەنرابێت یان هیچ نەبێت ناوەکە دەگمەن بێت، ئیتر ناوەکە بەهەر زمانێك بێت و مەعنای هەرچییەك بێت کێشەیان نییە، لە ڕاستیشدا ئەوەش ستەمێکە لە منداڵەکەیان

دەیکەن و دوورکەوتنەوەیەکی دەروونی و واتاییە لەگەڵ دینەکەیاندا ئەنجامی دەدەن.

ناونانی منالّ بە ناوی پێغەمبەران عليهم السلام و هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت و بە ناوی جوان و واتای بەڕێز و بەپێز نیشانەی چاکەی تۆیە لەگەڵ منالّەکەتدا و هاوکات نیشانەی وابەستە بوونی خۆیشتە بە ئاکارە بەرز و ڕەوشتە جوانەکانی دینەکەت.

بەداخەوە ئێستە خەڵکی نەك هەر ناوی ئیسلامی لە منالّەکانیان نانێن بە بیانووی ئەوەی ئەوانە ناوی عەرەبین! بەڵکو ناوە کوردییەکانیش کە واتای جوانیان هەیە، بە دەردی پیتە کوردییەکان براوە و چۆن لەوێ لاتینی خەریکە جێگەی دەگرێتەوە، لێرەش بێ تامترین و ناشیرینترین ناوەکان خەریکە جێگای ئەو ناوە جوان و پر لە واتایانە دەگرێتەوە.

هەرگیز گومان نەبەن ناوەکانی عبد الله وعبدالرحمن ومحمد وأحمد ومصطفى و محمود و إبراهيم و موسى و عيسى و أبو بكر و عمر وعثمان وعلي و خديجه و عائشة وفاطمة وحفصة و أسماء و سمية و سەودە وسۆیبە و زۆر ناوی تریش لەو جۆرە کۆن دەین یان وا بزانیت ناوی سەردەمیانە نین، یان بەوە فریوت بدەن گوایە ئەوانە ناوی عەرەبین و بۆ ئێمە ناگۆنجین لەبەر ئەوەی ئێمە کوردین، ڕاستە ئێمە کوردین بەڵام کورد بەبێ ئیسلام چ سەنگ و پێگەیەکی هەیە و بۆچی باشە؟ هەمیشە دەبێت ئەوەت بیر نەچێت کە تۆ سەرەتا موسوڵمانیت ئەوجا کوردیت یان عەرەب و فارس و تورك و ئینگلیزیت، پیویستە ئیعتیباری ئیسلامی بخرێتە پێش هەموو ئیعتیبارێکی تر ، ئەو ناوانەو سەدان ناوی هاوشێوەی تر، ناوی جوان وموسوڵمانانەن ،هەزار جار لەو ناوە بیانی و نامۆ و سەیروسەمەرانە باشترو شیاوترە بۆ منداڵەکانتان..

ئەمە سەرەمی غەریبی ئیسلامە و یەکێك لە ڕێگەکانی سەلماندنی خۆشەویستی وغیرەت ودڵسۆزیت بۆ دینەکەت ئەوەیە ناوی منداڵت بەناوی ئایینی وقورئانی و بە ناوی پێغەمبەران و هاوەڵان و زانایان و پیاوچاکانەوە بنەیت، ناو لە ژیانی مرۆڤدا کاریگەری و بایەخی زۆری هەیە،

هیستریای لاساییکردنەوە کە لە ناو کورددا تەشەنەی کردووە، زەنگێکی مەترسیدارە و ڕێخۆشکەرە بۆ سڕینەوەی شوناسی ئیسلامی بە شێوەیەکی کۆتایی.

هەزاران کەس مەعنای ناوی منداڵەکانیان هەر نازانن چییە، هۆکاری ناونانیش لەلایان لە دوای نامۆبوون، ئاوازو جەرەسی ناوەکەیە کە بەلایانەوە خۆش بووە، یان لەسەر قسەیەکی بێ بەڵگەی زانستی، گوایە مەعنای گوڵێکی جوان و بۆنخۆشە لە فڵانە چیا، و مەعنای ئەمەیە و ئەوەیە، بێ ئەوەی لە هیچ فەرهەنگ و کتێبێکی متمانە پێکراودا بەڵگەیەك لەسەر واتای ئەو ناوە هاتبێت.

موسوڵمانان پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ڕێگای شانازی کردن بە دینەکەیان وناوی ئیسلامی و بەپلەی یەکەم و ناوی کوردی جوان و پڕ لەواتای بەڕێز لە منداڵەکانتان بنەن، ئەبێت ڕێگە نەدەن ئەو خۆلەیان لەچاو بکرێت کە دەوترێت  ئەوە ناوی عەرەبییە، با عەرەبی بێت، ئێمە لەبەر دینەکەمان ئەو ناوانەمان قبوڵە و شانازیان پێوە دەکەین و هیچ پەیوەندییەکی بەعەرەبەوە نییە وەکو نەتەوەیەك، ئیسلام نەبوایە کەس هەر نەیدەزانی عەرەب هەن یان نین، عەرەب بە ئیسلامەوە گەورە بوون و ئێمەش بمانەوێت سەربەرزی دونیاو دواڕۆژ بین هەر لە ڕێگەی ئیسلامەوە بەو ئامانجە دەگەین، ئەو ناوانە بەتایبەتی ناوی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی الله لێیان ڕازی بیت، تەعبیر لە سەرانی ئێمە دەکەن و دەبێت یەکێك لە ڕێگەکانی دەربڕینی خۆشەویستیمان بۆیان  ناونانی منداڵەکانمان بیت بەناوی ئەوانەوە.

## پەیامی سی و نۆ:
## لە پەنجە کردنی ئەڵقە و لەبەر کردنی جلی بوکێنی

یەکەم: مەسەلەی حەڵقە لەپەنجە کردن لە کاتی مارەبڕین وهاوسەرگیریدا، چی بۆ ژن بێت یان بۆ پیاو، نەریتێکی کۆنە و لە دێر زەمانەوە هەر بووە، لە بنچینەشدا - وەکو هەندێ لە زانا هاوچەرخەکان دەڵێن - عادەتی نەسارا وگاورەکانە و لەڕێگەی ئەوانیشەوە بە ئێمە گەیشتووە، هەندێکیش پێیان وایە فیرعەونەکان یەکەم جار دایانهێناوە.

بەداخەوە هەندێ جاریش لە پەنجە کردنی ئەو ئەڵقە هەندێ بیروباوەڕی بێ بنەماشی پێوە دەبەسترێتەوە وەکو ئەوەی وا گومان دەبرێت ببێتە مایەی خۆشەویستی لە نێوان ژن و مێردا و داکەندنیشی یان گۆرینی جێگەکەی لە پەنجەکاندا گوایە دەبێتە مایەی رەشبینی و گومانی خراپ لە نێوان هاوسەراندا، کە ئەوانەش جگە لەوەی ئەسڵ و بنەمایەکی لەشەرعدا نییە، هاوکات سەرپێچییەکی شەرعی ڕوونە و بەو بۆیشی هەیە بۆ سەرپێچی عەقیدەش سەر بکێشێت وببێتە جۆرێك لە شیرك.

بەڵام ئەگەر ئەو ژن و مێردەی لە پەنجەی دەکەن هیچ باوەڕێکی ناشەرعی لەو شێوەیان پێی نەبێت و هەر وەکو عادەتێکی کۆمەڵایەتی ئەو کارە بکەن، لەو حاڵەتەداهەندێ لەزانایانی هاوچەرخ - وەکو ابن عثيمين و زانای تر - ئەڵقە لە پەنجە کردنی هاوسەرانیان تەنها بە مەکروهـ داناوە و وتوویانە دەتوانن لە پەنجەی بکەن بەڵام نەکردنیشی باشترە و شیاوترە بە کەسی موسوڵمان.

هەر چۆنێکیش بێت موسوڵمان خۆی لە لاساییکردنەوەی نەساراو عادەتی ئایینەکانی تر بپارێزێنت بۆ خۆی باشترە، بۆیە ئامۆژگاریم بۆ هەموو کوڕو کچێکی بەڕێز کە پەیوەندی هاوسەرگیری پێکەوە دەبەستن وهەروەها بۆ هەموو ژن و پیاوێکیش کە ئەو ئەڵقە زۆر بە شتێکی گرنگ و پڕ بایەخ دەزانن، ئەو ئەڵقە لە پەنجە نەکەن و ئاوڕ لەو جۆرە عورف و عادەتە نەدەنەوە، چونکە عورف و عادەت لە کاتێکدا کاری پێدەکرێت کە هیچ تیکگیرانێکی لە گەڵ شەرعدا نەبێت، ئەگەریش کەسێك هەر ویستی بیکات، یەکەم بۆ ماوەیەکی کاتی بیکات و یەقینیشی وا بێت کە ئەڵقە و هیچ شتێکی تر نابێتە مایەی نە کامەرانی نە ناخۆشی ژیانیان، هەروەها بزانێتیش کە ئەو کارەی بەپێی قسەی گەورە زانایانی ئەم سەردەمە بەلای کەمەوە مەکروهە و ناپەسەندە، تۆیش هیچ ناچار نیت کارێکی مکروە و ناپەسەند ئەنجام بدەیت.

ئەمەش کە باسمان کرد لێرەدا تایبەتە بەو ئەڵقەی کە هاوسەران لە دوای مارەبڕین و هاوسەرگیری لەدەستی دەکەن، کە وتمان وازلێ هێنانی باشترە، جیاوازە لە مەسەلەی ئەموستیلە ئەوەیان درووستە بەکاربهێنرێت و لە پەنجە بکرێت بەمەرجێك ئاڵتون نەبێت بۆ پیاوان و هیچ بیروباوەڕێکی پێوە نەبەسترێت، ئەوەشی لە قسەی زانایان دەردەکەوێت بەکارهێنانی ئەموستیلە یان کلکەوانە ڕێگەپێدراوە بەڵام سوننەت نییە، مەگەر بۆ کەسێك کارێکی پێی هەبێت بۆ نموونە مۆر بێت و کاروباری فەرمی خۆی پێ ڕاپەڕێنێت، ئەگەرچی لەم سەردەمەی خۆماندا ئەنگوستیلە وەکو مۆر بەکارنایەت لە چەشنی ئەو ئەنگوستیلەی کە پێغەمبەر ﷺ لە پەنجەی دەکرد و نووسراوە فەرمییەکانی پێ مۆردەکرد کە بۆ شوێنانی دەنارد.

دووەم: سەبارەت بە جلی بوکێنی کە جلێکی سپییە و تایبەتە بە کاتی گواستنەوەی بووك، وەکو جلەکە ئەگەر مەرجەکانی حیجابی شەرعی تێدا هەبێت، درووستە و کێشەیەکی نییە، بەڵام بە ڕەچاوکردنی چەند مەرجێك:

١- نابێت بە شێوەیەك تەماشای ئەو جلە بکرێت وەکو ئەوەی هەر دەبێت بپۆشرێت و مۆرکێکی پیرۆز وەربگرێت، بەڵکو عادەتێکە عادەتیش ئەگەر لەگەڵ شەرعدا تێکنەگیرێت ڕێگەپێدراوە ئەنجام بدرێت.

٢- نابێت ئەو ئافرەتەی دەیپۆشێت لە جێگەیەکدا بێت پیاوان تەماشای بکەن، چونکە ئەگەر مەرجە شەرعییەکانیشی تێدا هەبێت، زۆر جار بەلای کەم جۆرێك لە زەخرەفە و شێوازی سەرنج ڕاکێشانی تێدایە بۆ پیاوان ئەوەش نادرووستە.

٣- سەبارەت بەوەی کە ئەو پۆشاکە لە بنچینەدا تایبەتە بە بێ باوەڕان، زانایان لەو بارەوە دەڵێن لەو ڕووەوە ئاساییە چونکە ئەو حوکم و حاڵەتە بوونی نەماوەو ئێستا ئەو پۆشاکە تایبەت نییە تەنها بەبێ باوەڕانەوە و موسوڵمانانیش دەیپۆشن، تەنها ئەوە دەمێنیت کە واجبە بە پێی مەرجەکانی حیجابی ئیسلامی بێت و داپۆشەر و فراوان بێت و تەسك و تەنك و بە شێوەیەك نەبێت زۆر سەرنج ڕاکێش بێت.

٤- لە ڕووی ئەمانەتەوە دەبێت ئەوەش بوترێت کە هەندێ لە زانایانی ئەم سەردەمە دەڵێن درووست نییە ئەو پۆشاکە لەبەر بکرێت چونکە دواجار پۆشاکی بێباوەڕوانە و موسوڵمان دەبێت خاوەنی کەسایەتی بەهێزی خۆی بێت و شانازی بەدینی خۆیەوە بکات و نەچێتە ژێر کاریگەری و عادەت و نەریتی بێ باوەڕوان و جولەکە و نەساڕاکان، بۆیە شەرعیتر و چاکتر ئەوەیە بە پۆشاکێکی جوان و شەرعی ئەو بۆنەیە بەرێی بکەن، نەك ئەوەی تەقلیدی ئەو نەریتە بکەن.

٥- ئەگەر بێت و پۆشاکەکە ناشەرعی بێت و بەشێك لە جەستەی ئافرەتەکەی پێوە دەرکەوێت یان تەسك بێت و ئەندامەکانی جەستەی دەربخات لەو حاڵەتەدا بەهیچ شێوەیەك درووست نییە، تەنانەت ئەگەر تەنها ئافرەتانیش تەماشای بکەن و پیاوان نەیبینن هەر درووست نییە و حەڕامە.

سێیەم: مەسەلەیەکی تریش هەیە بەباشم زانی لێرەدا ئاماژە بەوەش بکەین ئەویش پۆشینی پۆشاکی ڕەشە بۆ ئافرەت، ئایا واجبە حیجاب و پۆشاکی شەرعی هەمیشە ڕەش بێت، وەڵامیش ئەوەیە نەخێر مەرج نییە ڕەش بێت و بەڵگەیەکی شەرعی لەو بارەوە نەهاتووە، دەکرێت هەر ڕەنگێك بیت بەڵام سەرنج ڕاکێش و وروژێنەر نەبێت، لە فەرموودەیەکدا هاتووە أم سلمة ی دایکی ئیمانداران الله لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: (لَمَّا نَزَلَتْ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ خَرَجَ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِهِنَّ الْغِرْبَانَ مِنْ الْأَكْسِيَةِ) باسی ئەو کاتە دەکات کە ئەو ئایەتە دابەزیوە ئافرەتانی أنصار دەرچوون و دەتوت قەلە ڕەش بەسەریانەوە نیشتووەتەوە، مەبەستی ئەوەیە کە جل و سەرپۆشەکانیان ڕەش بووە. بەڵام بەگشتی مەرج نییە هەر رەش بێت ئەگەرچی ڕەنگی ڕەش لەوانەیە گونجاوترین ڕەنگ بێت بۆ ئافرەتی موسوڵمان کە بیپۆشێت و لە چەندین ڕوووەوە ڕەنگی ڕەش لە ڕەنگەکانی تر باشتر و گونجاوترە.

سەبارەت بە پۆشینی جلی ڕەش لەسەر مردوو ئەوە ئەسڵێکی نییە ئەگەرچی هەندێ لە زانایان ڕێگەیان داوە بۆ ئافرەت بیپۆشێت بەبۆنەی مردنی مێردەکەی، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەو ئافرەتەی کە کەسێکی نزیکی دەمرێت تا سێ ڕۆژ دەتوانێت (حداد) واتە ماتەمینی و خەفەتبار بێت و لەو ماوە جلی جوان و سەرنج ڕاکێش نەپۆشێت و کل و بۆنی خۆش بەکار نەهێنیت، بەڵام ئافرەت بۆ مێردی کە وەفات بکات دەبێت ئەو حاڵەتە کە لە شەرعدا (حداد یان( إحداد) ی پی دەوترێت، چوار مانگ و دە ڕۆژی پێ بچێت وەکو لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: (لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُحِدَّ فَوْقَ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ، إلا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا).و الله أعلم.

# پەیامی چل: چەند ئامۆژگارییەکی گشتی

لە سی و نۆ پەیامی ڕابردووی ئەم زنیجرەیەدا ، هەوڵماندا کۆمەڵێك لە گرنگترین ئەو باسانەی بۆ ئافرەتان پێویستن بیانخەینەڕوو، بێگومان کە نەمانتوانیوە هەموو ئەوەی کە پێویستە باسی بکەین، لێرەشدا کۆمەڵێك ئامۆژگاری و خاڵی تری گرنگ باس دەکەین، کە پێشتر وەکو پێویست تیشکی نەخراوەتە سەر، باسەکانیش پەیوندییان بەیکەوە نییە، وەکو ئەوەی هەر خاڵێك بابەتێك سەربەخۆ بێت وایە:

١- بەباشم زانی پەیامێك بۆ ئەو ئافرەتە بەڕێزانە ئاراستە بکەم کە لە مێردەکانیان جیابوونەتەوەو لەبەر هەر هۆکارێك بێت لە ژیانی خێزانییاندا سەرکەوتوو نەبوون:

- دەزانم بە ئەندازەی دڵخۆشی ئەو ڕۆژەی کە خوازبێنی کرایت و ئەو هەواڵە خۆشەت بە خۆشەویستانت گەیاند، هەواڵی تەڵاق و جیابوونەشت دوو ئەوەندە خەمباری کردوویت و ئازارت پێ دەبەخشێت، ، بەڵام چاك بزانە ئەوە قەدەری تۆ بوو و بەوەش دونیا کۆتایی نایەت.

- پێویستە متمانەت بەخۆت هەبێت و شکستەکەت فەرامۆش بکەیت، هەوڵ بدە لە بازنەی شەرع و ڕێگەپێدراودا گۆڕانکاری لە خۆتدا بکەیت، کتێب بخوێنە،

سەردانی کەسوکارت بکە، وەرزش بکە، جلی تازە بکڕە هەرکارێك تر بکە کە شەرعی بێت و سەرقاڵت بکات و بەسوود بێت.

- ئەگەر ماوەیەکی کەمە ڕووداوی جیابوونەوەکە ڕوویداوە، ئاساییە خەمبار بێت و ئاياییە بشگریت، چونکە گریانیش بۆ خۆی ڕێگەیەکی هێور بوونەوەو ئاسوودەییە بۆ دەروون.

- پێویستە هەوڵ بدەیت لە یادگاری و ڕۆژانی ڕابردوو دابڕێیت و لەم قۆناغەی ئێستاتدا بژیت، پێویستە گۆڕانکاری ئەرێنی و شەرعی لە ژیانتدا درووست بکەیت و لەگەڵ دوێنێتدا جیاواز بیت.

- گۆڕانکاری لە خۆت و جل وبەرگ و ماڵ و ئەوەی دەزانیت لەڕابردوو داتدەبڕێت و لە بیرت دەباتەوە بکەیت، بەمەرجێك لە چوارچێوەی شەرعی رب العالمین دا بێت.

- بەرژەوەندیت لەوەدایە لە ژێر کاریگەری ڕابردووی یادگارییەکانتدا دەربچیت، بەڵام ئەگەر جیابوونەوەکەتان لەو شێوەیە کە تەڵاقی ڕەجعی پێ دەوترێت و دەرگای گەڕانەوە بەتەواوی دانەخراوە ومێردەکەت پەشیمان بووەتەوەو تۆیش گەڕانەوەت پێ باشە و بەتایبەتی ئەگەر مناڵتان لە نێواندا هەیە بە پێی ڕێککەوتن وڕەچاوکردنی بەرژەوەندی دین و دونیای خۆتان و دەستەبەر کردنی دۆخێکی لەجاران باشتر و سەقامگیرتر ئاساییە جارێکی تر ژیان پێکەوە دەست پێبکەنەوە، ئەگەریش ئەوە مومکین نییە، دەبێت ئەو لاپەڕە بۆ یەکجاری هەڵبدەیتەوەو مەگەر

منالّتان لە نێواندا هەبێت، لەو حالّەتەدا واجبە لەسەرت مافی ئەو منالّە پێشێل نەکەی لە بینینی باوکی نابێت ڕێگری ئەوەی لێ بکرێت چونکە ئەوە ستەمە و الله لێت قبولّ ناکات، بەڵام سەبارەت بە مێردی پێشووت دەبێت بە هەموو شێوەیەك ئەو کەسە لەبیر بکەیت وڕێگە نەدەیت بە خۆت بە هیچ شێوەیەك بیری لێ بکەیتەوە، چونکە هەم نامەحرەمە بۆت و هەم ئەزموونێکی شکستخواردووتان پێکەوە بووە.

- مەرج نییە ئەوەی کە ڕوویدا کارێکی خراپ بێت، مرۆڤ بە سروشتی عاتیفی و کورتبینە، لەوانەیە خێری پێوە بێت و بۆ دین و بۆ دونیات جیابوونەوە باشتر بێت لە بەردەوامی ئەو ژیانە، الله تعالى دەفەرموێت. ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[١] هەرچی ئەو ناخۆشییانەش کە لە ئەنجامی تەڵاقەکە تووشت دەبێت ئارامی لەسەر بگرە و چاوەڕوانی پاداشت بە لەلای پەروەردگارت، کە خۆی فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[٢].

---

[١] - البقرة:٢١٦.

[٢] - الزمر:١٠

- لە دەرگای پەروەردگارت بێ ئاگا مەبە وبێ ئومێد مەبە، هەمیشە بە دوعا و پاڕانەوە لەو دەرگایە بدە، لە گەڵ قورئاندا بژی، بە فێربوون و جوان خوێندنەوەی خۆت سەرقاڵ بکە، بە تەفسیر و لەبەر کردنی و زیندوو کردنەوەی شەوەکانت بەوەی لەبەرت کردووە خۆت بەهرەمەند بکە.

- ڕەشبین مەبە و ناخت بە گەشبینی ڕووناك بکەرەوە و وا مەزانە بە پچڕانی ئەو پەیوەندییەت ئیتر کۆتایی بە هەموو خۆشییەکانت هاتووە.

الله تعالی نیعمەتی زۆرە لەسەرت بە جیابوونەوەت وا نەزانی نیعمەتەکانی پەروەردگارت لەسەرت کەم بووەتەوە.

نیعمەت هەر ئەوەش نییە کە پێت خۆشە هەندی جار ئەوەی کە زۆر پێت ناخۆشە ئەویش بە شێوەیەك لە شێوەکان نیعمەتێکە بەڵام پیی نازانیت. زەواج و ژیانی خێزانی تاکە نیعمەتی پەروەردگار نەبوو لەسەرت، چوزانی ئەوە تاقیکردنەوەیەك نییە، یان وەکو وتمان بژاردەیەکی باش نییە کە خێری تۆی تیایە و الله تعالی ئەوەی بۆ تۆ بەباشتر زانیوە.

- هەڵەیە بە هۆی ئەو جیابوونەوە پەلە بکەیت لە ئەنجامدانی زەواجێکی نوێ، یان وا بزانیت ستەمت لێکراوەو پێویستە تۆلەی خۆت بکەیتەوە، لەوانەیە بکەویتە هەڵەیەکەوە و پەشیمان بیتەوە، لە مەسەلەی زەواجدا زۆر وردبەرەوەو وریابە.

- پێت سەیر نەبێت هەندێ لە شارەزایان دەڵێن ئەگەر دەزانیت مێردەکەت بەو تەڵاقدانە ستەمی لێ کردوویت، گەردەنی ئازاد بکە و لە دڵی خۆتدا لێی خۆش بە، چونکە ئەوە ڕێگایەکی باشە بۆ بەدەستهێنانی ئاسوودەیی و هەست کردن بە ئارامی.

- پێویستە بایەخی زۆر بە منداڵەکانت بدەیت و زاڵ ببیتە سەر هەر لاوازی و خەمۆکییەکەتدا کە لە ئەنجام جیابوونەوەت لە مێردەکەت تووشت بووە، بۆ ئەوەی ورەی ئەوانیش نەڕوخێنیت و هەمیشە باوەڕیان بە پەروەردگار بەهێز بکەیت.

٢- پەیامێك بۆ ئەو ئافرەتانەی لە حیزب و ڕێکخراو و بانگەوازی ئیسلامیدا کار دەکەن، دەمەوێت بە ڕاشکاوی و بەبێ هیچ پێچ و پەنایەك پێتان بڵێم:

- هیچ کۆمەڵ و حیزبێکی ئیسلامی لە کوردستاندا بوونی نییە لە ڕووی عەقیدەوە سەلامەت بێت و لە ڕووی مەنهەجەوە لادانی نەبێت و ئینحیرافی نەکردبێت کە بتوانم ئامۆژگاریتان بکەم کاریان لەگەڵدا بکەن، تەنانەت ئەگەر بڵێیت لە هەڵەو لادانەکانیان بەریم و تەنها لە کارە باشەکانیان لەگەڵیاندام، بەو بەهانەشەوە هەر درووست نییە لەگەڵیان بیت، چونکە تۆ (تكثير السواد)یان دەکەیت، واتە ژمارەیان زیاد دەکەیت و بەشێك لە بەرپرسیارێتی لادانەکانیان هەڵدەگریت و

مەسەلە کە گەیشتە عەقیدەو تەوحید، موسوڵمان دەبیت سەریح و یەکلا بێت و شل و لاواز نەبێت.

- هەرچی ڕێکخراوو سەنتەر و ناوەند و جێگەیەك، ئەگەرچی بەتایبەت خەریکی زانستی شەرعی و تەجوید و قیرائات و لەبەر کردنی قورئانیش بێت، بەڵام سەر بە لایەنێك لەوانە بێت کە لە ڕووی عەقیدەوە تێکەوتوون، لەبەر هەمان هۆکاری سەرەوە درووست نییە لەگەڵیادا بیت، با ئەو جێگەیە وای نیشان بدەن کە لایەنێکی زانستین و هیچ پەیوەندییان بە حیزب و لایەنی سیاسییەوە نییە، چونکە لە ڕاستیدا ئەو جێگایانە ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕن لە کۆکردنەوەی خەڵکی و ئەندام بۆ ئەو حیزبانە بەو بەهانەوە، ئەوانەش کە ئەو شوێنانە بەڕێوەدەبەن ئەندام و کادیری حیزبەکانن.

- بۆیە دەتوانیت دوور لە ئینتیمای ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی دەمامکدار بۆ هیچ حیزب و گروپ و ڕێکخراوو کۆمەڵێك، لە مالی خۆتەوە و لەسەر مەنهەجی کیتاب و سوننەت و خوێندنەوەی کتێب و گوێگرتن لە مامۆستای عەقیدە پاك و سوود وەرگرتن لە یوتیوب و لە ئێنتەرنێت بەگشتی، خزمەتی دینەکەت بکەیت، ئەمڕۆ جیهان بووە بە گوندیکی بچووك و بۆ کەسێك بیەوێت دەیان سەکۆ هەیە قسەی خێری تێدا بکەیت، سەدان فێرگە و قوتابخانە هەیە بۆ فێربوونی زانستی شەرعی و لە ماڵی خۆیشتەوە دانیشتوویت! یان دەتونیت لەگەڵ هەر ڕێکحراوو لایەنێکدا کە هیچ لادانێکی عەقیدی نەبێت، خزمەتی دینەکەت بکەیت و خۆت

پێکەوە بنەیت لە ڕووی شەرعی و زانستە ئیسلامییەکانەوە، خۆ ئەگەر نەبوو و لایەنێك وا دەست نەکەوت، تۆ داوات لێ نەکراوە بە هەر حاڵێك بێت هەر لەگەڵ حیزب و لایەنێکدا بیت، بەلکو داوات لێکراوە ئەگەر هەموویان کێشەی عەقیدەیان هەبوو، لێیان بەری بیت و بەتەنها خۆت بمێنیتەوە.

٣- سەردانیکردنی ئافرەت بۆ گۆڕستان لەسەر بۆچوونی جومهوری زانایان درووستە وڕێگەپێدراوە، بە مەرجێك ئەو سەردانییە بیدعەی تێدا نەبێت و بۆ ئافرەتەکە فیتنەی تێدا نەبێت، پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتا سەردانی کردنی گۆرستانی لەسەر ئافرەتان قەدەغە کرد و دواتر ڕێگەی پێیاندا: (كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا)[1] بەڵکو وەکو زانایان دەفەرموون ئەوە لە حاڵەتێکدایە ئەو گۆڕەی کە سەردانی دەکات لە شار و شوێنی ئەو ئافرەتە بێت، بەڵام ئەگەر لە شارێکی تر بێت و پێویست بەسەفەرکردن بکات ئەوە درووست نییەو قەدەغەیە.

لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بینی لەسەر گۆڕێك دەگریا پێی فەرموو ئارام بگرەو پێی نەفەرموو سەردانییەکەت ناشەرعییە، هەروەها دایکمان عائیشە الله لێی ڕازی بیت سەردانی گۆڕی عبدالرحمن ی برای کردووە. ئەو فەرموودەی (لعن الله زوارات القبور)یش وەکو شێخ مصطفى العدوي دەڵێت: یان فەرموودەیەکی لاوازە، یان نەسخ کراوە، یان مەبەست لەو ئافرەتانەیە کە لە کاتی سەردانی گۆڕستاندا سنووری شەرع دەشکێنن.

---

[1] - رواه مسلم.

٤- یەکێك لە دیاردە ناشەرعی و خراپەکانی ئەم سەردەمە ئەوەیە هەندێ جار ئافرەت بەتەنها لە گەڵ شۆفێری تەکسی نامەحرەمدا سەردەکەوێت، کە ئەوەش خەلوەیە و حەڕامە وەکو لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: (لا یخلون رجل بامرأة إلا ومعها ذو محرم) واتە درووست نییە پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەمدا تەنها بێتەوە مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت لەو کاتەدا.
هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی صحیح دا فەرمویەتی: (لا تسافر امرأة إلا مع ذي محرم) واتە ئافرەت بۆی نییە گەشت بکات مەگەر لە گەڵ مەحرەمێکی خۆیدا نەبێت. بەڵام وەکو زانایان دەڵێن ئەگەر ئافرەتەکە بە تەنها نەبێت و ئافرەتی تری لەگەڵ بێت ئەوە خەلوەی پێ ناوترێت و لەو حاڵەتەدا درووستە.

٥- زەکاتی ئاڵتون و زیو بێگومان واجبە و جێگای خیلاف نییە، بەڵام زەکاتی ئەو زێڕو خشڵەی ئافرەت بۆ جوانی و بۆ بەکارهێنانی خۆی بەکاری دەهێنیت ئەوە خیلافی لەسەرە، جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن ئەگەر بۆ جوانی و بەکارهێنان شەخسی خۆی بەکاری بهێنیت زەکاتیی تێدا نییە، بەڵام وەکو زۆرێك لە زانا گەورەکان فەرموویانە ئەگەر ئاڵتوون گەیشتبێتە ئاستی نصاب واتە گەیشتبێتە ٢٠ مسقاڵ، لەڕووی احیتاط بۆ دین ئەوەیە ساڵانە زەکاتی دەربکرێت، کە زەکاتەکەشی دەکاتە چواریەکی دەیەك، واتە دوو و نیو لەسەد، بەڵام ئەگەر لە

بیست مسقاڵ واتە لە هەشتا و پێنج گرام زێڕ کەمتر بێت زەکاتی بە هیچ شێوەیەك تێدا نییە چونکە نەگەیشتووەتە ئاستی نصاب.
سەبارەت بە زیویش ئەگەر بگاتە ٥٩٥ گرام ئەویش بەهەمان شێوە لەسەدا دوو و نیوی دەبێتە زەکات.

٦- هەڵەیە و هەڵەیەکی گەورەشە لە ڕوی شەرعەوە، ئافرەت لەگەڵ خزمان و کەسە نزیکە نامەحرەمەکانیدا بە بێ سنوور و هەستکردن بە گوناه و حەرەج قسە بکات و تێکەڵ ببێت، بەڵکو ئەوە لە تێکەڵ بوون و قسە کردن لەگەڵ نامەحرەمی تر کە خزم نییە خراپترە، چونکە وا گومان دەبات ئەوە خزمە و جیاوازە و ئیتر زیاتر تیکەڵ دەبن و ڕووخۆشی و گاڵتە و قسەکردنیان پێکەوە دەبێت ئەوەش ڕۆچوونە لە ئەنجامدانی تاواندا و ئاساییی بوونەوەی حالەتێکە کە لە بنچینەدا ئاسایی نییە و ڕێگەی زۆر حەرام و قەدەغەکراوی شەرعییە.
بەڵکو دەبێت لەگەڵ هەندێ لە مەحرمەکانیشدا سنوور بپارێزرێت و بەو بەهانەی کە مەحرەمە هیچ زیدەڕەوییەك نەکرێت لە تێپەڕاندنی ئادابی مامەڵە کردن، بەتایبەتی ئەگەر ئەو مەحرەمە وەکو خاڵ و مام مولتەزیم نەبن بە ئیسلامەوەو خاوەن ڕەوشتی بەرز نەبن، نابێت حیسابی مەحرەمیان بۆ بکرێت، بەڵکو دەبێت وەکو نامەحرەم مامەڵەیان لەگەڵدا بکریت، ئەم سەردەمە سەردەمی فیتنەیە و ئێنتەرنێت و سەتەلایت و ڕێگاکانی تری خراپە خەڵکی لەسەروشتی مرۆیی

خۆیان دەرکردووەو مەگەر پابەند بوون بە ئیسلام مرۆڤ لە ڕەوشتی ناشیرین بپارێزێت ئەگینا ئەمە خراپترین سەردەمە ئێمە تێیکەوتووین، بەڵکو خوشك و برایش هەر دەبێت ئاداب و سنووری مامەڵەی جوان پێکەوە بپارێزن و بەفێرکردنیان بە ئادابی ئیسلامی بپارێزرێن، بۆیە ئیسلام فەرمانی کردووە جێگای خەوی کچان و کوڕانی خوشك و برا لە تەمەنی دەساڵی ئیتر جیابکرێتەوە و لەیەك جێگەدا پێکەوە نەخەون وفەرموویەتی: (وفرقوا بينهم في المضاجع)[1].

٧- خوێندنی کچ بەهانەیەکی شەرعی نییە بۆ دوا خستنی زەواج، بۆیە ئامۆژگاری هەر کچێك و سەرپەرشتیارەکەی دەکەم ئەگەر کەسی خاوەن دین و ڕەوشتی جوان هاتە پێشەوە بۆ خوازبینی کردنی ڕازی ببن و بە هۆی خوێندنەوە ئەو پرۆسە دوا نەخەن، دەکرێت زەواج و خوێندن پێکەوە بن، زیادەڕەوی لە ڕەفز کردنی زەواج بەبەهانەی خوێندن دەبێتە هۆکاری کەمبوونەوەی زەواج و زۆربوونی قەیرەیی و چەندەها کارەساتی لێ دەکەوێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يا معشر الشباب! من استطاع منكم الباءة فليتزوج؛ فإنه أغض للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم فإنه له وجاء)[2] ئەوەش فەرمانێکە بۆ پێشخستنی زەواج و دوانەخستنی لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەگەر هۆکارێکی بەهێز و قایلکەر نەبێت نابێت پێچەوانەی ئەو فەرمانە ئەنجام بدرێت.

---

[1] - روه أبو داود وغيره.

[2] - متفق عليه.

٨- ئامۆژگاری هەموو ئافرەتێکی بەڕێز دەکەم کە داواکاری زیاد لە توانای مێردەکەی نەکات و باری بە کڕینی شتی زیاد و ناپێویست قورس نەکات، هاوکات داوا لە مێردەکەش دەکەم بە پێی توانای خۆی هەموو پێویستییەکی ژن و منداڵەکانی دابین بکات و پێویستییەکانیان پشت گوێ نەخات و کەمتەر خەمی تێدا نەکات.

٩- ئافرەت پێویستە هەمیشە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە وەکو واجبێك و فەرمانێکی ئیلاهی تەماشا بکات و هیچ کات ئەگەر هەلی قسەیەکی خێری بۆ ڕێککەوت، یان توانی نەهی لە خراپەیەك بکات، ئەو هەلە لە دەست نەدات، الله تعالى فەرموویتی: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[١]

بانگەواز کردن بۆ دینی ئیسلام و فەرمان کردن بەچاکە و نەهی کردن لە خراپە گەورەترین کارێکە موسوڵمان ئەنجامی بدات و پلەیەکی بەرزو مەزنە دەبێت ئافرەت هەمیشە بە گوێرەی توانای خۆی بیری لای بێت. لەم سەردەمەدا زۆر جار ئافرەتان وەکو ئەوەی ئەو کۆڵەکە گەورەیەی ئیسلام پەیوەندی بەوانەوە نەبێت مامەڵە دەکەن، بەڵکو دەبێت ئافرەت لەگەڵ منداڵەکانی و کەسە نزیکەکان و دراوسێی و هاوڕێی و لە هەر کوێیەك توانی قسەیەکی خێر بکات دریغی نەکات و ئەوەش بە پلەو پایەیەکی مەزن تەماشا بکات.

---

[١] - آل عمران:١٠٤

١٠- پێویستە ئەم دونیا وەکو ڕێگای سەفەرێکی دوور تەماشا بکەیت کە بەردەوام بیرت لەلای کۆکردنەوەی توێشوو خۆراك بێت بۆ ئەو سەفەرەت، پێش هەموو شتێك پێویستە عەقیدەی خۆت تۆکمە و ڕاست درووست بکەیتەوە، ئینجا توێشووی عیبادەت لەگەڵ خۆت هەڵبگریت بۆ ئەو سەفەرە، لە پاش ئەنجامدان فەرزەکان بە ڕێکوپێکی، گرنگی بدەیت بە نوێژە سونەتەکان، ڕۆژووی تطوع، زیکری بەیانیان و ئێواران، خوێندنەوەی قورئان و هەموو کارێکی خێر و ئاکارێکی جوان و ڕەفتار و مامەڵەیەکی پەسەند بە نیەتی ئەوە بیکەیت ببێتە توێشووی قیامەتت.

١١- ئەمڕۆ عەلمانیەت هەژموونی بەسەر هەموو میللەتانی سەر زەویدا هەیە و لە گەڵ ئیسلامدا لە جەنگێکی کراوەدایە، ئافرەتیش یەکیکە لە چەکەکانی کە بۆ ڕووخانی رەوشتی خەڵکی سەرزەوی بەکاری دەهێنیت، ئافرەت لە شارستانییەتی هاوچەرخدا زیاتر نییە لە ئامرازیك بۆ وروژاندنی ئارەزووی پیاوان و بۆ گێل کردنی مسللەتان و دوور خستنەوەیان لە هەموو بەها جوانەکان.

عەلمانیەت لەو جەنگە ڕاگەیانراوەیدا لە دژی ئیسلام و لەمەسەلەی بەکارهێنانی ئافرەت ڕێگەو کەرەستەی گەلێك زۆری هەیە، یەکیك لەو کەرەستانەی ڕێکخراوەکانی مافی ئافرەت و جیندەرە، ئەوەش بزانن کە ئەوان لە ڕێگەی ڕاگەیاندن و وڵاتە بەناو ئیسلامەکانەوە توانیویانە زۆرێك لە ئامانجەانیان بپێکن،

بەڵام تاکە ڕێگەیەك بۆ ئەوەی ئێوەی خاوەن دین و ڕوشت لە خراپەکانی ئەوان پارێزراو بن ئەوەیە عەقیدەی لایەنی ئیمان و تەوحیدی خۆتان بەهێز بکەن، بەو شێوە دەتوانن پارێزگاری لە دین و کەسایەتی خۆتان بکەن، ئەگینا بەهەر ڕێگەیەکی تر ئێوە لە جەنگێکی نابەرانبەرداان و هاکا دۆڕان و گەورەترین سەرمایەان لە دونیا کە دینەکەتانە دەکەویتە مەترسی لەناوچوون یان هیچ نەبیت ناشیرین بون و لەکەدار بوون.

١٢- ئەگەر ئافرەتێك بمرێت و مێردی نەبێت، لەپێشترین کەس بەشۆردنی کەسە نزیکەکانێتی، دایکی کچی وکورەزای و کچەزای و خوشك و پوری خوشك باوك و پوری خوشکی دایك و هاوشێوەکانیان، زانایان دەڵێن ژن و پیاو لە هەموو کەسێك تر لە پێشترن بۆ ئەوەی یەکێکیان بمرێت ئەوی تر بیشۆرێت.
ئەگەر ئافرەت مرد و کەسێك لەو نزیکانەی باسمان کرد نەبوو بۆ ئەوەی بیشۆرێت، هەندێ لە زانایان فەرموویانە: ئافرەت کە مرد لە پێشترین کەس بۆ شۆردنی دایکیتی ئینجا نەنکی و کچەکەی ئینجا نزیکتر و نزیکتر و ئینجا ئافرەتی دوور. شایانی باسە لێرەدا کە پیاو بۆی نییە دایکی و کچی خۆی ئەگەر بمرن بیانشوات، چونکە جگە لە هاوسەران، ژنان ژنان دەشۆن و پیاوان پیاوان دەشۆن. تێبینییەکی گرنگیش لەم بارەوە ئەوەیە ئەو ئافرەتەی کە ئافرەتی مردوو دەشوات، دەبێت دەستپاك و جێگای متمانە بێت و پێویستە هەر عەیبێکی لە جەستەی

مردووەکەدا بینی یان هەر شتێکی نەخوازراوی بینی کە مردووەکە ئەگەر لە ژیاندا بوایە پێی ناخۆش دەبوو بزانرێت، باسی نەکات و بیپۆشێت و چونکە ئەوە بە نهێنی ئەو مردووە دادەنرێت حەرامە لەسەر مردوو شۆرەکە باسی بکات، بەڵام ئەگەر حاڵەتێکی باشی لە جەستەی مردووەکە بینی وەکو ئەوەی ڕووی گەش بێت یان خەندەیەکی پێوە دیار بووبێت ئەوە ئاساییە باسی بکات.

بەمەش کۆتایی بەو چل پەیامە هات کە بە باشمان زانی ئاراستەی ئافرەتانی کوردی بکەین وەکو ئەنجامدانی ئەرکی بانگەواز و بەجێ گەیاندنی مافی ڕوونکردنەوەی ئیسلام بۆ دایکان و خوشکان و هەموو ئەو ئافرەتە بەڕێزانەی کە مەبەستیان لەسەر شەریعەتی ئیسلام بژین و بمرن، داواکارم لە الله تعالى ئەم نووسینە بکات بە توێشووی قەبر و قیامەت بۆ نووسەر و خوێنەر و هەموو کەسێك کە سوودی لێ وەردەگرێت و کاری پێ دەکات،

إنه على ذلك قدير و بالإجابة جدير. وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله و صحبه و من تبع سنته و اقتفى طريقه إلى يوم الدين.

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات.




# ناوەڕۆك




